بداته پێش». نیکۆلۆ . لە وەختێکدا کە لەشکری دوژمن نزیك دەبووەوەو هەر نزیك دەبووەوە . بەم شێوە دڵگیرە واقیعی حاڵی دەنواندو هەڵوێستی خۆی دەردەبڕی.(٨٧) خۆ ئەگەر هیچ دەرفەتێکیش لە بەردەم ئیتالیایی‌یەکاندا نەما . ئەوا لەسەریان پێویستە وەك پێ‌ی لەسەر دادەگرت– بەسەر بەرزی‌یەوە روو لە ئاشتی بکەن . نەك بە خۆبەدەستەوەدانێکی زەلیلانەوە . ئینجا لێرەشدا هەمدیسان دەبێ میرێکی نوێ لە کایەدا بێ‌کە بزانێ چۆن شەڕ یا ئاشتی هەڵدەبژێرێ . لەمەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێ‌کە مەکیاڤیللی وەك رووناکبیرێکی رەسەن تیوری‌و کردارپیکردنی پێکەوە بەند کردوون . چونکە گشت کردارو رەفتارەکانی رۆژانی ئەو تاقیکردنەوە سەختەی ، لەگەڵ گرنگترینی ئەو بیروڕایانەیدا دەگونجێن کە لە دوابەشی «میر»دا وتراون‌و بەگەرمی هانی «ئازادکردنی ئیتالیا لە وەحشی‌یەکان» دەدەن‌و هیوایەکی دڵسۆزانە دەخوازن کە «خودا یەکێك بۆ رزگارکردنی تەرخان بکا»(میر– بەشی بیست‌و شەشەم).

مەکیاڤیللی ئابەم جۆرە بوو . هەروەکوو تا دواییش هەر بەم جۆرە مایەوە . لە رۆژانێکدا کە هاوتاکانی شەوانیان لەسەر مێزی خواردنەوە بەسەر دەبردو «بیناکاری»و «رووخاندنیان» لە هەوادا دەسازاندو پیشەیان گومان کردن بوو لە هەڵوێستی دڵسۆزترین‌و بەشەرەفترین کەسێك لە ریزی خەڵکەکەدا ، مەکیاڤیللی رووبەرووی مەرگ دەوەستایەوەو لە پێناوی ئیتالیادا بیروهۆشی خۆی ئاگر دەداو جەستەی خۆی دەپرووکاند . چونکە لەو خۆشەویستی‌یەیدا بەرامبەری دڵسۆز بوو . بۆیە هەر لەو ساتانەدا بەهرەی بلیمەتی‌یەکەی . ئەو وتە بەناوبانگەی لێوەشایەوە کە دەڵێ :

خۆشەویستیم بۆ گیانی خۆم لە خوار خۆشەویستیمەوەیە بۆ نیشتمانەکەم».(٨٨)

چالاکی‌و کۆششی ئەو «پێغەمبەرە بێ‌دەسەڵاتە»و(٨٩) ئەوانەی لە دڵسۆزیدا هاوشانی بوون . بەفیرۆ چوو . رۆما خۆی بەدەستەوەداو نیکۆلۆش دوای ئەوەی بە دڵسۆزی‌یەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا . هیچ چارێکی نەماگەڕانەوە نەبێ بۆ گوندەکەی . تا دوا رۆژانی تەمەنی تێدا بەسەر بەری‌و(٩٠) بەو هەڵوێستە نەگۆڕو ئاشکراو دوورەی لە مەڕایی‌کردن‌و لاف‌لێدان‌و بەو چالاکی‌یە لە رادە بەدەرەی لە سەخترین‌و ستەمترین وەزعدا . جارێکی‌تر بیسەلمێنێ‌کە نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤیللی کێ‌یەو

کیّ نی یه .

بەلاّم ئەی ئاخۆ هەڵوێستی ئەو حەسوودیپیّبەره بیّبایەخانەی مەکیاڤیللی کە لە بەرزاییەوە دەیانڕوانییە ومزغەکە بۆ ئەوەی لە ساتی خۆیدا بدەنە پالّ لایەنی سەرکەوتوو لەم رووەوە چۆن بوو ؟!. ئەوانە سنەبارەت بە هەڵوێستەکانی ئەم نیشتمانپەروەرە رەسەنە ، بە گیانێکی هەلپەرستانەی نامەردانەوە کەوتنە بلاّوکردنەوەی گومانێکی نابەجیّو هەوڵیان دەدا لەو وەزیفەیە دوور بخرێتەوە کە پێش کارەساتەکانی دوایین بە دەستەوە بوو بیدرێتیّ .

هەروەها پرسیارێکی تریش بە ئیلحاحەوە خۆی دەسەپێنیّو دەڵیّ : ئەگەر ئەمە رەوتی مەکیاڤیللیو بلیمەتییەکەی بوو بیّ ، چۆن دەشیّ ئەقڵمان بیگریّ کە گوایە جەنابی مەوزوعییەت خوازەکان لە خواپیاوان ، تیّی نەگەیشتوونو وەك پێویستە بۆیان هەڵنەسەنگێنراوە ؟. بەلاّم ئاخۆ مەسەلە وەها بووە ؟!.

## بالاّترین هەڵسەنگاندن

یەکێك لە یاسا هەرە گەشەکانی ژیان ئەوەیە کە ناتوانریّ راستی بۆ هەتایە حەشار بدریّو کاریش لەگەلّ مەکیاڤیللیدا هەر وەها کەوتەوە . هەموو ئەو کۆششو تەقەلاّدانی شێواندنەی کران ، هەر لە سەرەتاوە لەوە دەستەوستانتر بوون کە بتوانن رووی راستەقینەی ئەم رووناکبیرە لەو فەیلەسووفو زاناو خەڵکە مەوزوعییەتخوازە حەشار بدەن کە نووسینەکانی ئەویان خوێندبووەوە . لە راستییشدا کەم رووی داوە رووناکبیرێکی گەورە ناوی مەکیاڤیللیی بردبیّو مەدحوستایشی نەکردبیّ . بۆ نموونە فەیلەسووفو زاناو کارگێڕی ناسراوی دەوڵەت فرانسیس بیکۆنی ئینگلیزی (١٥٦١–١٦٢٦)، بە وردی کتێبەکانی مەکیاڤیللیی خوێندوونەتەوەو لە ڕێبازە (أستقرائی) یەکەیدا ، کەوتۆتە ژێر کاری ئەو بیروڕایانەوەی تیایاندا پێشچاوی کەوتوونو بە تەواوی لە بابەتێکی نویّ بوون .[٩١] هەروەکوو بیکۆن یەکەم کەس بووە دەرکی بەوە کردوە کە مەکیاڤیللی بە جۆرێك لەکەسان دواوە وەك لە واقیعدا هەن نەك وەك لە خەیاڵدا هەنو لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵیّ .

«ئیمە دەبێ سوپاسی مەکیاڤیللیو گشت نووسەرانی وەك ئەو بکەین کە راستو رەوانو بەبێ دروستکاری ، وێنەی کردارو رەفتاری خەڵکەکەیان بە باری ئاساییدا نواندوە نەك بەو بارەدا کە دەبێ[٩٢] هەبێ».

هەروەها لە گەرمەی شالاوی بەرپەرچدانەوەی مەکیاڤیللیدا ،[٩٣] ژمارەیەك لە نووسەران لە بیروباوەرەکانی دواونو زۆر بە رێزلێنانەوە هەڵیانسەنگاندوون . بۆ نموونە لیپسمۆس لە کتێبەکەیدا «کتێبە سیاسی یەکان» کە لەساڵی ١٥٩٠دا بلاوی کردۆتەوە ، بیروباوەرەکانی مەکیاڤیللی ی دەربارەی ئاینو سیاسەتو دەوڵەت نیشانداون . لەساڵی (١٦١٣) شدا ك . شۆپێ لە بیروراکانی مەکیاڤیللی سەبارەت بە پێویستی ی جیاکردنەوەی کاروباری سیاسەت لە چاکەکاری دواوە . دوای ئەویش بە بیست ساڵ جبرائیل نۆدێ باسی رێبازی سیاسی ی مەکیاڤیللی کردوەو روونی کردۆتەوە کە ئەو بە دوای میرێکی شەرانیدا نەگەراوە ، بەڵکوو وێڵی دوای حوکمرانێکی سەرکەوتووی لە بابەتێکی نوێ ی ئەوتۆ بووە کە نیشتمان پێویستی پێ ی بووە.[٩٤]

هەروەها دیکارتی فەیلەسووفو زانای ناسراوی ماتماتیك (١٥٩٦-١٦٥٠) یەکێکە لە یەکەمینی ئەو روونا کبیرانەی مەکیاڤیللی کاری تێکروونو ئەو رایەشی سەبارەت بە کردازە عادیلانەکانی حوکمران لە رژێمێکی (مطلق)ی کراوەدا دایرشتوە ، بە تەئسیری بیروباوەرەکانی مەکیاڤیللی بووە . ئەم پێش فەیلەسووفی ئینگلیزی تۆماس هۆبس (١٥٨٨-١٦٧٩) بە ماوەیەکی زۆر ، گەیشتە دەسنیشانکردنی دەوری خۆپەرستیو زیادەخوازی ی تاکە کەسیو حەزکردنیو پارێزگاری کردن لە خودی خۆی لە مەسەلەی دامەزراندنی هەر حکوومەتێکداو[٩٥] ئەوە جێ پەنجەی بە رووی فیکری ئەو فەیلەسووفە ئینگلیزی یەوە دیارو ئاشکرایە . جۆن لووکیش (١٦٣٢-١٧٠٤) فەیلەسووفێکی ئینگلیزی ی ترەو هەندێ لە بیروباوەرەکانی مەکیاڤیللی کاریان تێ کردوە . خۆ ئەگەر هەڵوێستی ئەدەبی ئینگلیزی بەرامبەر بە نیکۆلۆ زراندنی ناوی بە فراوانی لە ئینگلتەرەدا بێننەوە یاد ، تێدەگەین کە هەڵسەنگاندنەکانی ئەو فەیلەسووفانەی بە سەرنجی وردو تێژیان ، پەنجەیان ناوەتە سەر

گیانی نووسینەکانی مەکیاڤیللیو گشت ئەو ئامانجە دوورانەی تیایاندا وترابوون ، چ بایەخێکی گەورەیان هەبووە .

هەروەها دیارترینی فەیلەسووفو رووناکبیرانی سەردەمی راپەرینو بزووتنی گیانی نەتەوەیی ئەورووپایی ستایشیان کردوە ، لەوانە نووسەرو مێژوونووسو فەیلەسووفی فەرەنسایی ڤۆلتێر (١٦٩٤–١٧٧٨)و ئەنسکلۆپیدیاییی ناسراو دیدرۆ (١٧١٣–١٧٨٤)و فەیلەسووفو نووسەرو مۆسیقازانی فەرەنسایی جان جاك رۆسۆ (١٧١٢–١٧٧٨)و شاعیرو رووناکبیرو پێشەنگی نەتەوەخوازی لە ئەڵەمانیادا گۆتە «١٧٤٩–١٨٢٠»، هەروەکوو هیگلیش شایەتیی بۆ بلیمەتیی ئەو داوە . جا یەکەمیان کە دەیزانی چۆن دڵی پادشایان رازی دەکا ،[٩٦] فردریکی گەورەی بۆ دانانی کتێبەکەی دەربارەی مەکیاڤیللی هاندا ، دوای ئەوەی لەو نامە تایبەتییانەدا کە بۆی دەناردن ستایشی دەکرد ، چونکە دەیزانی کە کتێبێك لەو بابەتە چ ناوبانگێك بۆ هاوڕێ پادشا ئەڵەمانیاییەکەی پەیدا دەکا . بەڵام رۆسۆ بە قووڵی مەکیاڤیللیی هەڵسەنگاندوەو لە بەناوبانگترینی کتێبەکانیدا «پەیمانی کۆمەڵکاری»«العقد الاجتماعی» (جزمی سێیەم–بەشی شەشەم) وتوویە :

مەکیاڤیللی وای نیشاندەداکە گوایە دەرسی پادشایان دادەدا ، لە کاتێکدا گەلی دەرسی بەهاداری پێشکەش بە گەلان دەکرد . «میر» کتێبی جەمهووریەت خوازانەو ئەوەیشی بۆ قارەمانە چارەگرانەکەی هەڵبژاردوە ، بە ئاشکرا نیازی شاراوەی نووسەرەکەی نیشاندەدا . هەر وەها قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی لە لایەن دەرباری رۆماوە مەغزای خۆی دەبەخشێ ، چونکە دانەر بەبێ پێچو پەنا وەسفی ئەو دەربارە دەکا»

هەردوو دامەزرێنەری سۆشیالیزمیی زانستانە کارل مارکسو فردریك ئینگلس ، لە جارێك زیاتر بە جوانی بیروباوەڕی مەکیاڤیللییان هەڵسەنگاندوە . مارکس بە وردی کتێبەکانی خوێندوونەتەوەو بەتایبەتی «دەمەتەقێ» کە زانیارییەکی زۆری سەبارەت بە سەردارانی فلۆرنساو ڤینیسیا[٩٧] لێوەرگرتوە . لە نامەیەکیشیدا بۆ ئینگلس «میر»ی بە «کتێبێکی نایاب» ناوبردوە ، چونکە دانەرەکەی یەکێك بووە

لەوانەی «لە چاوی مرۆڤەوە روانیویانەتە دەوڵەت‌و یاساکانی‌یان لە ئەقڵ‌و تاقیکردنەوەوە ئەنجام داوە نەك لە لاهووتەوە».[98]

ئینگلسیش لەقەبی «فیلەتەنەکانی راپەڕین»ی بە چوار لە دیارترین‌و مەزنترین ناوەدارانی سەردەمی راپەڕین بەخشیوە کە بریتین لە وێنەکێشی ئیتالیایی نەمر لیۆناردۆ داڤینشی‌و چاکەخوازی ئایینی گەورە مارتن لۆسەرو مەزن‌ترین وێنەکێشی ئەو سەردەمەی ئەڵەمانیا ئۆلبرێشت دوورەر (Durer)و لەگەڵیاندا مەکیاڤیللیش ، چونکە راپەڕین هەم پێویستی بە—فیلەتەن—بوو ، هەم فیلەتەنیشی دەخوڵقاند». هەروەکوو کتێبی «هونەری جەنگ»ی زۆر لاپەسەند بووە کە ناوی بە «مارسیلیزی سەدەی شازدەیەم دەبرد» ، لەبەر ئەوەی مەکیاڤیللی بەلای ئەوەوە «یەکەم نووسەری جەنگ ئامێزی سەردەمی نوێ‌یە کە شیاوی ناوبردن بێ».[100]

لەم سەردەمەشماندا[101] دەیەهاو بگرە سەدەها لە رووناکبیرو مێژوونووسە رۆژئاوایی‌یەکان بە چاوی رێزەوە روانیویانەتە بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی‌و چەندین توێژینەوەو نامەی زانستانەیان بۆ لێکۆڵینەوەیان تەرخان کردوون کە دوای کورتە دووانێك لەو سیاسی‌یانەی نووسینەکانی مەکیاڤیللی کاری تێکردوون ، لەگەڵ هەندێ باس‌وخوازی تریشدا دەگەڕێینەوە سەر درێژەی هەندێکیان .

## حوکمڕانان‌و مەکیاڤیللی

ژمارەیەکی زۆر لە حوکمڕانانی ئەوروپاو غەیری ئەوروپا کەوتوونەتە ژێر تەئسیری بیروڕاکانی مەکیاڤیللی‌یەوە ، بەتایبەتی ئەوەکانی دوو توێی «میر» . ئەم ژێرتەئسیرکەوتنەشیان لە بارودۆخێکی جۆراوجۆرو لە روانگەو بۆچوونێکی جیاجیاوە بووە.بەلاّم لە هەموو حاڵەتێکدا زۆربەی ئەم حوکمڕانانە ئەو بابەتەیان لە بیروڕاکانی مەکیاڤیللی هەڵبژاردوە کە بۆیان لەبار بووە ، دەنا زۆر ئاسایی ئەو هەموو مەرج‌و پێوانە زۆرەیان دەخستە پشت‌گوێ کە نیکۆلۆ بە حوماسەتەوەو بە ئیمانێکی بڕای‌بڕەوە پێی لەسەردادەگرتن کە لە راستیدا ئائەمەیانە مەکیاڤیللیزم .

لە یەکەمینی ئەو حوکمڕانە ئەوروپایی‌یانەی مەکیاڤیللی کاری تێکردن ،پادشای ئیسپانیا شارلی یەکەم (١٥٠٨—١٥٥٨) بوو کە یەکەم حوکمڕانی ئەوروپایی بوو

دەربارەی دەوترا «رۆژ لە مەملەکەتەکانی ئاوا نابێ» . ئەو ئەگەرچی سەرگەرمی کڵێسەی کاسۆلیکی‌و پارێزگاری‌لێکردنی بوو ، بەڵام خۆی‌و وەزیرەکانیشی هانی بڵاوکردنەوەی «میر»یان لە ئیسپانیادا دەدا . هەروەها تۆماس کرۆمۆێل (١٤٨٥—١٥٤٠) کە لە سەردەمی هینری‌ی هەشتەمدا سیاسی‌یەکی ئینگلیزی‌ی گەورە بوو ، زۆر ئاشنای بیروباوەڕەکانی دووتوێی «میر» بوو ، بۆیە دانەیەکی دەسنووسی لێ دەسگیر خست‌و بەوە یاریدەی پادشاکەی خۆی‌دا حوکمێکی (مطلق)ی ئەوتۆ دابمەزرێنێ کە خۆی لە دواییدا بووە یەکێك لە قوربانی‌یەکانی . هەروەکوو لە کاتی کوشتنی هەر دوو پادشای فەڕەنسا هینری‌ی سێ‌یەم‌و هینری‌ی چوارەمدا ، ئەو کتێبەیان لە گیرفاندا بینرا . ئەلیزابیسی یەکەمیش (١٥٥٨—١٦٠٣) کە لە سەردەمی بنەماڵەی تیۆدۆردا یەکێك بوو لە مەزنترین حوکمڕانەکانی ئینگلتەرەو گەلێ سەرکەوتنی بەرچاویشی لە ناوەوەو دەرەوەیدا بەدی هێناو دەیویست لە پەیوەندی‌یەکانیدا هەردەم لەنگەرگیربێ ، لە ژێر تەئسیری ئەوکتێبەدا بوو . بەڵام خۆ یەکە وەزیری فەڕەنسایی ریشیلیۆ کە بە سەرکەو تووترین سیاسی‌ی نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەم لە ئەورووپادا دادەنرێ ، مەکیاڤیللی‌ی هێجگار بەدڵ بووەو لە وەسێتە سیاسی‌یەکەیدا دانی بەوەدا ناوە کە پشتی بە بیروڕاکانی مەکیاڤیللی بەستوە . هەروەها ناپلیۆن پۆناپارت ئاشنایەتی‌ی لەگەڵ کتێبی «میر»و «دەمەتەقێ»دا هەبووەو سەرلیستەی ئەو پەسندترین هەزار کتێبە بوون کە هەڵیبژاردوون بیانکاتە کتێبخانەیەکی گەڕۆك بۆ خۆی‌و گەلێ پەراوێزی لەسەر «میر» هەن‌و وایش زەن دەکرێ کە وەری‌گێڕابێتە سەر زمانەکەی خۆی . هەروەکوو هۆگری‌ی ناپلیۆنی سێ‌یەم بۆ بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی هیچی لەوەی پێش خۆی کەمتر نەبووە . لە باسەکانی لەوەبەریشماندا ئیشارەتمان بە ژمارەیەکی‌تر لەو حوکمڕانانەدا کە مەکیاڤیللی کاری تێ‌کردبوون‌و هەوڵیان دابوو ئامۆژگاری‌یەکانی لە خاکێکی غەیری خاکی ئیتالیای سەدەی شازدەیەمدا بەجێ بێنن ، لەوانە هێتلەر کە خۆی لە کتێبەکەیدا «تێکۆشانم»[١٠٢] دانی پێداناوە

هەرچەندە لە ناو نووسەراندا هەن دیگۆلی سەرۆکی پێشووی فەڕەنسا

وادەدەنێ‌ ئەوەم کە چاکترین نموونەی میرە نوی‌یەکە بووبێ ، [١٠٣] بەلاَم لە راستید باروودۆخ هەر چۆنێك بێ ، زەحمەتە حوکمڕانێکی هاوچاخمان بتوانێ پڕبەپڕ خۆی بخاتە قاڵبی ئەو شەخسی‌یەتەوە کە مەکیاڤیللی ویستویێتی . لێرەدا جێی خۆیەتی سەرنج بۆ ئەو فیکرە گرنگە رابکێشین کە شۆڕشگێڕی ئیتالیایی گرامشی لەم رووەوە دەری بڕیوە . بە رای ئەو تاکە کەس لە جیهانی ئیستاماندا لە وزەیدا نی‌یە ببێتە «میر»ەکەی مەکیاڤیللی ، بۆیە ئەوەی دەتوانێ ببێ‌و بەڵکوو پێویستە ببێتە ئەو میرە نوێ‌یە ، حیزبێکی سیاسی‌ی شۆڕشگێڕە . [١٠٤] هەروەکوو ئەو ڕێ‌و شوێنانەی سانتیاگۆ کاریللۆی سکرتێری گشتی‌ی پارتی کۆمۆنیستی ئیسپانیا لە کتێبەکەیدا «ئەوروکۆمۆنیزم» داوای پەیڕەوکردنیان دەکا ، لەوە بەولاوە نی‌یە کە بابەتێکی نوێ‌یە لەو رایەی گرامشی بۆی چوو بوو . کاریللۆ لەم بارەیەوە دەڵێ : «...رەنگە هاوڕێمان هەبن وەها بیربکەنەوە ، ئەم بابەتە ڕێبازەی کە جۆرە مەکیاڤیللیزمی‌یەکە ، بۆی هەبێ ڕێگەمان بدا لە ساتێك لە ساتاندا هەرچیمان دەوێ دەسگیرمان ببێ‌و ئەوانە ئەم هەڵوێستەش تەواو بە ئاسایی دادەنێن» . [١٠٥]

گشت ئەوەی باسمانکرد . بەبێ پێچوپەنا ئەو شوێنە بڵندەمان نیشاندەدەن کە مەکیاڤیللی لەوەبەرو تا ئیستاش لە کوڕی ئایدۆلۆژیای سیاسی‌ی جیهانی‌و بەرەوپێشەوە چوونیدا داگیری کردوە . لەبەر ئەوە ئاسایی‌یە کە نیکۆلۆ چەندە رۆژگاریش بەسەر چووبێ . لە دڵی خەڵکی‌و بەتایبەتی ئیتالیایی‌یەکاندا ، شوێنی ڕێزلێنراوی شیاوی خۆی داگیر کردبێ .

## پاشگەز بوونەوە

لەوەبەر لەچەند شوێنێکدا دەرمانخست کە چۆن هێزە کۆنویستەکان نەیانتوانی رووی راستەقینەی مەکیاڤیللی لە پێشدا لەبەر چاوی مرۆڤە دانسقەکان‌و دواییش خەڵکەکە بە گشتی‌ون بکەن . ئەوەبوو ئەوروپایی‌یەکان کەوتنە تێگەیشتنی ئەو ئامانجە پڕ کێنەی کە مەکیاڤیللی لە نێوانی بیرو باوەڕو بەهاکانی‌یەوە پێشکەشی دەکردن‌و بە دوایدا باری سەرنجیان دەربارەی گۆڕدرا . بۆیە سەرەڕای ئەو شێواندنە بەردەوامەش ،

کارێکی زۆر زەحمەت نەبوو دەرك بەوە بکرێ کە مەکیاڤیللی نەك تەنیا لە ئیتالیا ، بەڵکوو لە سنووری گشت کیشوەری ئەورووپادا سەردەستەی بانگ‌راهێڵەران‌و رابەرانی یەکگرتنی نەتەوایەتی بووە . بۆ نموونە کافووری سەرکردەی یەکگرتنی ئیتالیا خۆی ، لە ژێر تەئسیری بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیدا بووە . ئیتالیایی‌یەکان قەت ئەم راستی‌یەیان لە یاد نەچووەو لە زمانی یەکێك لە شاعیرەکانیانەوە بەم شێوەیە نوێنراوە :

«من

ئیتالیایەکی مەزنی یەکگرتوومو

نیکۆلۆ مەکیاڤیللی

ئەوەی فێرکردووم» (١٠٦)

لە خۆراییش نی‌یە خانووەکەی لە گوندەکەیدا کە نزیکی فلۆرنسایە کراوە بە مۆزەخانەیەکی نیشتمانی ، جگە لەوەی ئیتالیایی‌یەکان وەك جەژنێکی نەتەوایەتی ئاهەنگیان بە بۆنەی تێپەڕبوونی چوار سەد ساڵەوە بەسەر لە دایك بوونیدا بۆ گێڕاو لەو رۆژەدا نزرگەیەکی قەشەنگیان لە شوێنی ناشتنی نیکۆلۆدا بیناکردو ، راست لە ژێر ناوەکەیدا ، ئەو وتە پڕ مەغزایەیان بە هەڵکۆڵین نووسی کە دەبێتە پاداشتی گشت ئەو ناهەمواری‌یەی لە ژیانیداو لە پاش مردنیشی تووشی هات‌و کە دەڵێ :

«مەدح‌و ستایش هەرگیز لە وزەیدا نی‌یە ئەم ناوە بە هەقی خۆی بگەیەنێ» .

ئەوسا کڵێسەش ناچار بوو لە ئەنجامدا بچێتە ژێر بارو لە ساڵی ١٨٩٠دا ناوی کتێبەکانی مەکیاڤیللی ی لە لیستەی کتێبە قەدەغەکراوەکان دەرکێشا . ئەمەش بریتی بوو لە تەنیا پاشگەزبوونەوەیەکی ئاسایی لە رووی واقیعێکی سەلماودا .

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ، هێشتا لە رۆژهەڵاتی ئێمەدا هەر وێنە شیوێنراوەکەی مەکیاڤیللی‌و تێکەڵکردنە کلاسیکی‌یەکە لە نێوان ئەم‌و ئەو مەکیاڤیللیزمی‌یەدا لە زەینی خەڵکەکەدا زاڵە کە رۆژهەڵاتی‌یەکان پتر لە هەر خەڵکێکی ترو تەنانەت پێش ئەوەشی نیکۆلۆ چاو بە ژیاندا هەڵبێنێ بە چەندین سەدە ، بە ڕێوشوێنەکانی موبتەلا بوو بوون . بەهەرحاڵ باسی مەکیاڤیللی‌و رۆژهەڵات باسێکە کە هێشتا دەستی نەدراوەتێ ، ئەگەرچی لەبەر گەلێ هۆ هەقی بایەخ‌پێدان‌و لێکۆڵینەوەی هەیە .

## مەکیاڤیللی و ڕۆژهەلاٚت

مەکیاڤیللی لەکتێبەکانیدا زۆر بە دەگمەن باسی ڕۆژهەلاٚت و ڕۆژهەلاٚتی یەکانی کردووە، ئەویش لە سنووری تەنیا هەندێ زانیاری ی کەمدایە دەربارەی حکوومەتە ڕۆژهەلاٚتی یە کۆنەکان و زۆر لەوە دەچێ لە سەرچاوەکانی کالاناباسیسی وەرگرتبێ کە ئەویش لە ژێر تەئسیری زەینەفۆنی هاوڕێیدا بووە . هەر وەکوو ئیشارەتێکی بە سوپای عوسمانی یەکان داوەو ستایشی کردوە ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی سوپایەك بووە لەو ڕۆژگارەدا ئەنجامی گیانی تاعەتکردن و ئازایەتی تیایداو بە هۆی ئەو سەرکەوتنە خێرایانەوەی لە ناوچەکانی بولٚقانی سەر بە ئەورووپاو شوێنی تریشدا بەدی ی هێنابوون ، لە ناو ئەورووپایی یەکاندا ناوو ناوبانگێکی بالاٚی پەیدا کردبوو .

بەلاٚم دەبێ لە سووچێکی ترەوە بڕوانرێتە مەکیاڤیللی و پەیوەندی یەکەی لەگەلٚ ڕۆژهەلاٚتدا ، چونکە کاریگەری ی ڕۆژهەلاٚت لە ڕاپەڕین (Renaissance)وەك بەیەكگەیشتنی دووڕی یانێکی شارستانی ، مەسەلەیەکەو لە ڕووی زانستی یەوە سەلمێنراوە . گومانیش لەوەدا نی یە کە مەکیاڤیللی وەك ڕۆلٚەیەکی سەردەمەکەی خۆی و وەك یەکێك لە ناودارانی سەردەمی لوتکەی ڕاپەڕین ، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ کەوتۆتە ژێر تەئسیری بیروباوەڕی ڕۆژهەلاٚتی یەوە . لەم ڕووەوە گەورەترین دوو ڕابەری سەردەمی ڕاپەڕین کە دانتی و پەترارکن پێش ئەو کەوتوون ، یەکەمیان لە چیرۆکە شیعری یە ناودارەکەیدا «کۆمیدیای خواوەندی» کەوتۆتە ژێر کاری «نامەی پاکانەخوازی ی» ئەبوو عەلاٚی میعەری یەوە ، دووەمیشیان لە چیرۆکەکەیدا «دیکامیرۆن» لە ژێر کاری «هەزارو یەك شەوە»دا بووە . هەر لێرەشدا دەمەوێ ئەو ڕایە دەرببڕم کە دوور نی یە مەکیاڤیللی یش کەوتبێتە ژێر کاری «کەلیلەو دیمنە»وە ، یا بە لایەنی کەمەوە خوێندبێتی یەوەو ئەمەش تەنیا ڕایەکەو هەقی لێکۆلٚینەوەو تێوردبوونەوەی هەیە ، چونکە زۆر بەلٚگە هەن مرۆڤی بنکولٚکەر بۆ ئەم جۆرە باوەڕە هاندەدەن .

پێش هەموو شتێك «کەلیلەو دیمنە» لە سالٚی ١٠٨١دا لە سریانی یەوە کراوە بە یۆنانی و لەسەدەی سیازدەیەمدا لە عەرەبی یەوە کراوە بە ئیسپانی و لەسەدەی چواردەیەمیشدا بە لاتینی . بە دوایدا ئیتر بە نزیکەی هەموو ولاٚتانی ئەورووپادا بلاٚو

بووەوەو تا رادەیەك جیّپەنجەی خوّی بەسەر داهیّنانی ئەدەبی ی گەلیّ میللەتدا جیّهیّشت . جا زوّر دوورە روّشنبیریّكی وەك مەكیاڤیللی كە بە قوّستنەوە كتیّبی دەقوّستنەوەو وەختیّكی زوّریشی بە دەستەوە بووە ، «كەلیلەو دیمنە»ی نەخویّندبیّتەوە ، بەتایبەتی كە مارسیلیوّ ڤیرجیلیوّی هاوریّی دلّسوّزی یەكیّك بووە لە نووسەرە ناسراوەكانو پیّش ئەوەی مەكیاڤیللی دەس بداتە دانانی كتیّبی سیاسیو ئەدەبی . ئەو بووبووە ماموّستای وتنەوەی ئەدەب . ئەمە جگە لەوەی كە مەكیاڤیللی بەلای خوّدوور خستنەوە لە گیانی دكتاتوّرانەی روّژهەلاّتی یانەدا [١٠٧] لایدەداو ئەمەش هەر هەمان ئەو شتەیە كە پەندەكانی «كەلیلەو دیمنە» بوّی دەچوون .

هەروەها ئەگەر هەندیّ بەراوردكاری لە نیّوان بیروراكانی مەكیاڤیللیو ناوەروّكی چیروّكەكانی «كەلیلەو دیمنە»دا بكەین . لە زوّر شتیدا یەكگرتنەوەیان لەگەلّ یەكتردا تیّدا بەدی دەكەین كە رەنگە ئەنجامی كارتیّكردن بیّ یا تەنیا لە خوّیەوە رووی دابیّ ، بەلاّم لە هەموو حالّیّكدا سەرنج رادەكیّشیّ . بو نموونە دووان لە چوار ئامانجەكەی «كەلیلەو دیمنە» . [١٠٨] بە پیّی دەسنیشانكردنی (أبن المقفع) ، ئاراستەی پادشایانن بوّ ئەوەی «لە گەشتەكەیدا بە ناو دیمەنەكاندا زیاتر بەتەنگەوەبیّ»(ل ٩٥). لە قسەكانی تری أبن المقفع پیّش ئەوەی بچیّتە ناو جەرگەی چیروّكەكانەوە دەلّیّ «ئەوەی ئەم سیفەتانەی تیّدا بیّ كاری مەیسەر نابیّ ، لەوانە : تەوەزەلی لە كاركردندا ، یا فرسەت لە دەس دان . یا باوەركردن بە هەر هەوالّ راگەیەندەریّك»و پیاوی ژیر «لە راستگوّیی بەولاوە . نابیّ قسە لە هیچ كەس وەربگریّ ، ئەگەرچی كەسەكە راستگوّش بیّ . هەروەكوو دەبیّ لە هەلّەكردندا بە قیردا نەچیّو كوّلّ لە تیّوردبوونەوە نەداو پیّویستە ئەگەر مەسەلەیەكی لیّئالوّزا ، خوّی لە هیچ لایەنیّكی نەداو پیّش دلّنیابوون لە دروستیی‌یەكەی هەنگاوی تیّدا نەنیّ . پیاوی ژیر دەبیّ خاوەنی قسەی خوّی بیّو بزانیّ كە جەزا قەزایە»(ل ٩٢)و كیسرا ئەنەوشیروانیش هەولّیداوە كتیّبی حەكیمەكانی هندستان دەسگیر بخاو «بیداتە پالّ خوّیو لە سەركردایەتی‌كردنیدا یاریدەی لیّبخوازیّو كار بە راوتەدبیرە جوانەكانی بكا» لەبەر «ئەو شتانەی تیایدانو پادشایان لە بەریّوەبردنی رەعیەتەكانیانو ژیاندنیانو دادكاری لە نیوانیاندا پیّویستیان

پیێیان دەبێ»(ل ٩٨). نەوەی ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە «چاکەی پادشایانو تاعەتکردنیان» پێدەزانێو «دەیانخاتە سەروو گشت کاروکردارێکی ترەوە. ئینجا با ئەوەش بزانێ، پیاوی بە شەرەف ئەو کەسەیە کەلای پادشایان شەرافەتمەند دەبێو لە دەوڵەتەکانیاندا پایەی بڵند دەکەنەوە»(ل ١٠٧). هەروەك شێرەکە بە دیمنە دەڵێ کە «رەعیەتی پادشاو ئەوانەی لە حزوریدان، دەبێ چ پیاوەتیو زانیاریەك پێدەزانن بۆی باس بکەنو چ ئامۆژگاریەکیان لە لا هەیە بیدەنێ. چونکە پادشا نایانناسێو بەو پێوانەیە نەبێ ناتوانێ هەریەکەیان لە پایەوپلەی خۆیدا دابنێ»(ل ١٣٦) هەروەها پیێی دەڵێ: «ژمارەزۆریی دەستوپێوەند، ئەگەر ئامۆژگاریکەرو خاوەن تاقیکردنەوە نەبن، بۆ کارهەڵسووراندن زەرەربەخش دەبن، چونکە ئیش بە زۆریی ژمارە مەیسەر نابێ، بەڵکوو بە دەستوپێوەندی دڵسۆزو چاکەکار دەبێ»(ل ١٣٧). هەروەها لە قسەکانی دیمنە بۆ شێرە پادشا: «مشك لە ناو ماڵدا دراوسێیەکی بندەست بوو، بەلام کە بووە زیانبەخش بووە دوژمنو دەربەدەر کرا. یا باز کێویەکی ئاوارە بوو، کەچی کە بووە سوودبەخش گیرایە خۆو ماڵیکراو رێزی لێنرا»(ل ١٣٧).

چیرۆکەکانی «کەلیلەو دیمنە» زۆر جارو لە زۆر شێوەی خواستراودا، باسی تەبیعەتی خەڵكو دەوری قەزاو قەدەریان کردوە. بۆ نموونە شێرە شا باوەر بە قسەکانی دیمنە دێنێو ئەو ئەنجامەی لێدەس دەکەوێ کە خەڵکەکە دوو بابەتن «یەکەمیان تەبیعەتێکی دری هەیەو وەك ئەو مارەیە کە ئەگەر یەکێك پیێی پێدا ناو پێوەی نەدا، بە زەرەربەخشی نازانێو دەچێ جارێکی تر پیێی پێدا دەنێتەوە. ئەوی تریان تەبیعەتی نەرمو ئاسانەو وەك ئەو پوازی (سەندل)یە کە ئەگەر زۆر دەستی لێنخرا گەرم دادێتو ئازاربەخش دەبێ»(ل ١٣٨). هەروەها لە قسەکانی دیمنە بۆ شێرەکە: «مرۆڤی شەرانی لە شەرخواهی رزگاری نابێ، ئەگەر لاوازیش رووی تێکرد فێڵیتری تێدا دەدۆزێتەوە»(ل ١٥٦). «پادشایان دانبەخۆداگرن، سزا دەرنابرن بۆ ئەو کەسە نەبێ کە تاوانی ئاشکرایە»(ل ١٥٦-١٥٧). «شەرخواهان لە هەموو شوێنێکدا لە خێرخواهان زۆرترن. بەلام ئەگەر دژی راوەستانو بە کۆمەڵ نیشتنە گیانی ئەوانەیە

بیفەوتێنن . دەنا ئەگەر وەها نەبێ ئەوا دەبێتە ئەو پلاری قەدەرەی رەتکردنەوەی بۆ نابێ»(ل ١٦١) . هەروەها لە زمانی گایەکەوە وتراوە : «باشترین سوڵتان ئەوەیە لە هەڵۆیەك بچێ کە بەلاك دەورە درابێ ، نەك لە لاکێك بچێ کە بە هەڵۆ دەوری تەنرابێ»(ل ١٦٦) .

هەندێ جاریش پیاو هەست بە لەیەکچوونێکی تەواو لە بیروراو بگرە لە نزیکیی دەربرینیش لەگەڵ یەکتردا لە نێوان «میر»و «کەلیلەو دیمنە»دا دەکا . بۆ نموونە لە زمانی «کەلیلە»ەوە وتراوە کە «پیاوی بێدەسەلات بە لەسەرخۆیی‌و هێرت‌وفێڵ زەفەریان پێدەباو بە فروفێڵ سواری کۆڵی فیل دەبێ‌و مار لە کون دەردێنێ‌و یاریی پێدەکاو شێر لە ناو تابووت دەنێ‌و ئاو بەو شوێنەدا دەبا کە مەبەستێتی‌و بەر لە زەرەری ئاگرو رەشەباو رۆژ دەگرێ‌و هێزدار دەخاتە کار»(ل ١٧٢) . «سوڵتان ئەگەر پیاوچاك بێ‌و وەزیرەکانی پیاوخراپ بن ، خێرو بەرەکەتی بەسەر خەڵکیدا کەم دەبێتەوەو لێیان دەچێتە قاتی‌و کەس ناوێرێ توخنی بکەوێ . کەوابێ دەست‌رەنگینیی پادشایان لە خێرو بەرەکەتەکەیاندایە کە دەبێ هەر لە بروەدا بێ»(ل ١٧٣-١٧٤). هەروەها لە قسەکانی دیمنە بۆ شێرەکە : «...ئەی پادشا رەحم بەو کەسە مەکە کە ترست لێی هەیە . چونکە پادشای بە زەبروزەند رەنگە یەکێك ببوغزێنی‌و دەستی لە کار بکێشێتەوە . بەڵام دوایی بە ناچاری لەبەر کۆشش‌و چاکەی بە سەریەوە ، لە خۆی نزیك دەکاتەوەو وەك چۆن یەکێك دەرمانێکی تاڵی دەرخوارد دەدرێ ، بە تەمای سوودلێبینین دەیخاتەوە گەر . یا رەنگە یەکێکی خۆش‌بوێ‌و لە خۆی نزیك بخاتەوەو بەڵام لە ترسی زەرەرو زیانی ، وەك ئەو کەسەی لێدێ مارێك بە پەنجەیەوە دەداو لە ترسی بڵاوبوونەوەی ژەهرەکەی بە هەموو لەشیداو مراندنی ، پەنجەی خۆی دەقرتێنێ»(ل ١٨٠) . «هۆی راست‌ورەوانیی کار لەوەدایە پادشا ئاگاداری ئەو دۆستانە بێ کە دەیەوێ یاریدەیان لێوەربگرێ‌و بزانێ هەر یەکەیان چ جۆرە راوتەدبیرێکی لە لایەو چ نەنگی‌یەکی تێدایە ، ئینجا دوای ئەوە پێویستە پادشا کارگەرانی بەسەربکاتەوەو لە کاروباریان بپرسێتەوە ، بۆ ئەوەی چاکەی هیچ چاکەکارێك‌و خراپەی هیچ خراپەکارێکی لا شاراوە نەبێ ئەوسا دەبێ چاکەکار بەبێ

ئەجردانەوە نەهێڵێتەوەو ماوەش نەدا خراپەکارو تەوەزەل لەسەر خراپەکاریو تەوەزەلی بەردەوام بن . چونکە ئەگەر ئەوەی لەدەس داو جڵەوی بۆ شل کرد ، چاکەکاریش جڵەو شلیی دەکاو خراپەکار جەسارەت دەنوێنیٚ کە ئیتر ئیشەکە گەندەڵ دەبیٚو کار لە کار دەترازیٚ»(٣٤٨) .

ئینجا لە قسەکانی فەیلەسووف بۆ پادشا :«ئەی پادشام ، ئەو کاروبارانەی کە مرۆڤ لە ناو گشت ئاژەڵاندا تیایاندا تایبەتی‌یە ، من بە چواریان دەبینم کە بریتین لە پوختەی هەرچی هەیە لە جیهاندا ، ئەوانیش ئەمانەن : حیکمەتو داوێن‌پاکیو ئەقڵ‌ٚو داد . چونکە زانستیو وردبینی لە بەشی حیکمەتن . بە حیلمیو سەبرو لەسەرخۆییو سەنگینی لە بەشی ئەقڵن . حەیاو سەخاوەتو مەستووریو سەربەرزی لە بەشی داوێن‌پاکین . راستگۆییو چاودێریو خێرکردنو رەفتارساغی لە بەشی دادن . ئەمانە جوانکاری‌یەکانن‌و پیچەوانەکانیشیان خراپەکارین . سائیتر هەر کاتێك ئەمانە لە یەکێکدا کۆبوونەوە ، کەم‌وکووری لە نیعمەتیدا نایگەیەنێتە بەدبەختی لەم دنیایدا یا شکستی لەو دنیایدا ، یا داخ بۆ نەمانەوەی لە ژیاندا ناخوا ، یا بەشی لە ماڵ‌ٚومولٚکدا هەرچەندێك بیٚ پیٚی خەفەتبار نابیٚو لە گێچەڵ‌ٚ سەرسام نابیٚ . بەم جۆرە حیکمەت سامانێکە کە بە لیٚخەرج کردنی لە بن نایەتو ئازووقەیەکە کە هەژاری لە بەریدا خۆی راناگریٚو بەرگێکە کە قەت کۆن نابیٚو لەزەتێکە کە برانەوەی بۆ نی‌یە»(ل –٧٦) .

وەختێکیش ئەم چەند دێرەی خوارەوە دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت وەك بەیدەبای فەیلەسووف لە زمانی مەکیاڤیللی‌یەوە لە پێشکەش کردنەکەی «میر»یدا میدیتچی بدوێنیٚ وەهایە کە دەڵیٚ :«ئەی پادشام ، من دەڵێم تۆ لە مەڵبەندی بابو باپیرانتدایت لە پادشایانو کەڵە پیاوان کە پێش تۆ شاریان بنیاد ناوەو زەمین ملی بۆ داونو قەڵایان دروست کردوەو سەرکردەی لەشکر بوونو جباخانەیان ناوەتە سەریەكو رۆژگاریان درێژەی کێشاوەو چەکیان پەرەی سەندوەو سەردەم لە دوای سەردەم بە شادیو خۆشی ژیاونو ئەوە بەری جوانکاریی لیٚنەگرتوونو لە سوپاسو ستایش داینەبریون»(٧٧–٧٨) .

دەبێ ئەوەش بڵێین کە لەیەکچوونی هەندێ لەو شتانەی چیرۆکەکانی «کەلیلەو دیمنە» لەگەڵ نووسینەکانی مەکیاڤیللیدا ، لەولای ترەوە وا ناگەیەنێ کە جیاوازی لە نێوانیاندا نی یە . بۆ نموونە مەکیاڤیللی لە ٥٠٪ی بۆ دەوری قەدەرو بەخت لە هەڵسووڕاندنی کارروباردا داناوە ، لە کاتێکدا لە «کەلیلەو دیمنە»دا لە زمانی ئەم فەیلەسووفەوە کە رووی دەمی لە پادشایە وتراوە : «با ئەو کەسانەی کاروبار هەڵدەسوڕێنن و جێ بەجێیان دەکەن بزانن کە شت هەمووی بە قەزاو قەدەرە» (٣٥٠) و «کۆشش و جوانی ئەقڵ و هەر خێرو شەڕێك کە مرۆڤ تووشی دێ بە قەزاو قەدەرە» (٣٤٨) . ئینجا لێرەدا دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە مەکیاڤیللی لە ژێر تەئسیری ئەرستۆشدا بووە ، بەڵام لەگەڵ ئەویشدا لە زۆر شتدا جیاواز بووە ، یا بەلایەنی کەمەوە لە شێوەی نیشاندانی ئەو باسەنەدا کە لێیان دەدوا ، بەتایبەتی لە پشت بەستنی بەردەوامیدا بە نموونەی مێژوویی .

بەهەر حاڵ ئێمە کە دەڵێین دەشێ مەکیاڤیللی کەوتبێتە ژێر تەئسیری پەندەکانی «کەلیلەو دیمنە»وە یا خوێندبێتی یەوە ، ئەوەش بە دوور نازانین کە ئەو یەکگرتنەوەیەی هەندێکیان لەگەڵ بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیدا لە تەنیا ریکەوتەوە بێ ، یا رەتکار (رد الفعل)یکی لەیەکچووی بارو دۆخێکی لەیەکچوو بێ . ئەوی راستی بێ هەندێ لەیەکچوون لە نێوان هەڵسەنگاندنەکانی مەکیاڤیللی و ابن خلدونیشدا هەیە ، بەڵام بەبێ ئەوەی بەڵگەی سەلمێنراو هەبن دەری بخەن کە یەکەمیان پێشەکی یەکەی دووەمیانی خوێندبێتەوە .[109] أبن خلدونیش لە لای خۆیەوە نیشانی داوە کە فەرمانڕەوای نموونەیی دەبێ چۆن بێ ، بەڵام بەبێ پێ داگرتن لەسەر ئەرکە رۆحانی یەکانی و تەنیا وەسف کردنی بە «پادشایەکی بیررۆشن و بەسۆزو بەهێزو بەڵام رێ و شوێنی «سەرکوتاندنەوەی» ناشەرعی رەت دەکاتەوەو بایەخ بە خۆش گوزەرانی و ئاسوودەگی ی گەلەکەی دەدا» .[110] واتە ئەویش ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی جێگیرو بەهێزو رێك و پێك بووە ، دەوڵەتێك کە پادشا تیایدا بتوانێ جڵەوی کاروبار لە رووی جۆرەهای تەماعکاراندا بگرێتە دەست . هەروەکوو ئەو لە گەڕانیدا بە دوای راستیدا ، تەنیا رووداوە مادی یەکانی گرتووە و شی ی کردوونەتەوەو لەو یاسایانە گەڕاوە

که بەرەوگۆڕانیان دەبەن . بە رای هیلموت ریتەر ئەوەی ابن خلدون بە دەمارگیری ناوی دەبا ، هەر ئەوەیە کە مەکیاڤیللی ناوی چاکەکاری لی‌ناوە.[111]

لێرەدا وا چاکە ئیشارەتێك بەوە بدەین ، ابن خلدونێك کە لە بیروراکانیدا لەگەڵ ئاییندا دژ یەك نەبوون ، کەچی بە کافرو زەندیق تاوانبار کرا . هەروەکوو زۆر لە مێژوونووسانیش ، لە بەرزایی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمەوە روانی‌یانە بیروباوەڕەکانی و بە شێوەیەکی تایبەتی «وردکردنەوەی هۆیەکانی سەرهەڵدانی ئەم کارە مێژوویی‌یە بێ‌هاوتایەیان (پێشەکی‌یەکە — م.ل.م.) لە سەدەی چواردەیەمدا[112] خستە پشت‌گوی‌و ئەمەش هەمان کارەساتەکەی مەکیاڤیللی‌یە وەك لەوەبەر روونمان کردەوە» .

حوکمڕانە رۆژهەڵاتی‌یەکان تا رادەیەك لە وەختێکی زووەوە بایەخیان بە بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی داوە . وا زەن دەکرێ کە کتێبی «میر» بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ سوڵتانی عوسمانی مورادی چوارەم کە لە خۆرزگارکردندا لە دوژمنانی‌و سەپاندنی هەیبەتی حوکمڕانی‌یەکەی بەسەر خەڵکیدا ، ڕێ‌و شوێنی مەکیاڤیللی‌یانەی بەکار دەهێنا . بەڵام بە جۆرێکی زۆر دوور لەو بەهایانەی کە مێژوونووسی گەورەی سەردەمی راپەڕین مەبەستی بوون ، وەرگێڕدراوە . ژمارەی ئەوانەی بە فەرمانی راستەوخۆی ئەو کوژراون بەسەد هەزار کەس دانراوە . لە گەڵیاندا سیان لە براکانی خۆی‌و یەکێك لە مامەکانی . لە ساڵی ١٦٣٧ یشدا ، لە کاتێکدا کە تاعوون رۆژانە نزیکەی ٥٠٠ کەسی لە خەڵکی ئەستامبووڵی پایەتختی قەلاچۆ دەکرد ، ئەو شەوانێکی پڕ لە کەیف‌و رابواردنی لەگەڵ ژنە دۆستەکانیدا بەسەر دەبردو بە تەوسەوە دەیوت : «خودا وا ئەم هاوینە شەڕخواهان سزا دەداو رەنگە لە زستاندا نۆرە بێتە سەر شەرافەتمەندان» .[113]

هەروەها بایەخدانی محمد علی‌ی گەورە بە «میر» هیچی لە بایەخ‌پێدانی حوکمڕانە ئەوروپایی‌یەکانی پێش خۆی‌و سەردەمی خۆی کەمتر نەبووە . ئەوەش بۆ حوکمڕانێکی سەرکەوتووی وەك محمد علی کە مارکس دەربارەی میسر لە سەردەمی ئەودا وتوویە «لە هەموو ئیمپراتورێتی عوسمانیدا تاقە بەشێتی توانای ژیانی هەبێ» . شتێکی سەیر

نەبووە . ئەو ئەگەرچی لە تەمەنێکی دزەنگیشدا فێری خوێندەواری بوو بوو ، بەڵام بایەخی بەهەر شتێك دەدا کە پەیوەندیی بە سیستەمەکانی حوکمرانی‌یەوە هەبی‌و هەر ئەمەش بوو بووە هۆی یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی .

محمد علی دوای ئەوەی لە رێگەی یەکێ لە دیپلۆماسی‌یە بێگانەکانەوە بایەخی «میر»ی پێزانی ،[113] لە ساڵی ١٨٢٤–١٨٢٥ دا[114] روفائیل أنطوان زاخووری قەشەی راسپارد بۆی وەربگێرێتە سەر زمانی عەرەبی ، چونکە وەك خۆی وتوویە «زۆر بە پەرۆشەوە بووە بزانێ ئەم کتێبە چی تێدایە» . سەیریش ئەوەیە کە محمد علی دوای خوێندنەوەی «میر» ، لە بەیەك‌گەیشتنێکیدا لەگەڵ دیپلۆماسی‌یەکی ئیتالیایی بەم شێوەیەی هەڵسەنگاندوە :

«ئێوە لە ئیتالیادا ژاوەژاوێکی گەورە دەربارەی نووسەری ناسراوتان مەکیاڤیللی دەنێنەوە ، من فەرمانی وەرگێرانی کتێبەکەمدا تا بزانم چی‌ی تێدایە،بەڵام ئاشکرای دەکەم ئەو پیاوە زۆر لەوە کەمترە کە من ئەنجامی ئەو ناوبانگەی هەیەتی لێم چاوەروان دەکرد . هەروەکوو من پێتی رادەگەیەنم کە کتێبێکی‌تر هەیە عەرەبی‌یەو سەرسامو سەرمەستی کردووم ، ئەویش پێشەکی‌یەکەی أبن خلدونە . ئەم نووسەرە لە بیرکردنەوەدا لە مەکیاڤیللی سەربەسترەو بگرە باوەرم وایە کتێبەکەی ئەو زۆر سوودبەخشترە . ئینجا کە بلاو کردنەوەی کتێبەکەی مەکیاڤیللی لە هەندێ لەوڵاتانی ئەوروپادا قەدەغە بێ ، خۆ دەبوو قەدەغەکردنی کتێبەکەی أبن خلدون کونبرترو توندوتیژتر بێ» .

گومانی تێدا نی‌یە ئەوەی کاری کردۆتە رای محمد علی لاوازی‌ی وەرگێرانەکەی «میر»و نارەوانی‌ی شێوەکەی بووە کە وای لێکردوە تێگەیشتنی زەحمەت بێ‌و بۆ بلاوکردنەوە دەس نەدا .[115] لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وەرگێرانە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە ، چونکە یەکەم وەرگێرانی «میر»ە بۆ عەرەبی‌و ئینجا بە دوایدا پارێزەری میسری محمد لطفی جمعە لە ساڵی ١٩١١دا جارێکی‌تر لە ئیتالیایی‌یەوە کردویتی بە عەرەبی‌و لە ساڵی ١٩١٢دا بە ناوی «کتێبی میر کە مێژووی میرایەتی‌یە رۆژئاوایی‌یەکانە لە سەدەکانی ناوەراستدا»[116] بلاوی‌کردۆتەوە . وەرگێر کتێبەکەی بە پێشەکی‌یەکی فراوانی خۆی

دەس پێکردوە کە لە (٥٠) لاپەڕەدایەو[١١٧] بە شێوەیەکی ڕەوانو مەوزووعی یانە . گەلێ لایەنی جۆراوجۆری ژیانو نووسینەکانی مەکیاڤیللی نیشاندەدا . سەرمەستی ی وەرگێر سەبارەت بە مەکیاڤیللی گەیشتۆتە ڕادەیەك کە بە تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە چووە بۆ ئیتالیاو سەری لە گوندەکەی و خانووەکەی داوەو لە پاریسیش یەکێك لە نەوەکانی ئەوی دیوە . لە پێشەکی یەکەیدا بە شێوەیەکی ئەدەبی یانە ئەوە دەردەبڕێو لەو قسانەی تیایدا کردوونی دەڵێ :

«کە کتێبی (میر)م خوێندەوە هۆگری بوومو وام لێهات لەگەڵ چوارینەکانی خەیامدا لەگەڵ خۆمدا هەڵی بگرم . وەختێ خەفەت دامدەگرێو دڵم تەنگ دەبێ . خەیام دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی بەو مەیە پیرۆزەی مەست بم . بەلاَم «میر» بۆ ئەوە دەخوێنمەوە کە لە مەیی خەیاڵ دەرباز بمو بگەڕێمەوە کۆڕی ئەو ڕاستی یە ئازار بەخشانەی کە لەشکرەکانی هێزو حەزوو ئارەزوو تیایدا بە شمشێری کارەساتو ڕمی بەسەرهات پێکدا هەڵدەگژێن» .[١١٨]

ئینجا ئەگەر ئەوە بگرینە بەرچاو کە یەکەم خوێندنەوەی «میر» لە لایەن وەرگێڕەکەیەوە «لە بەر قورسی ی زانینی ماناو مەغزای کتێبەکە» تووشی «سەرسوڕمانی» کردوەو ناچار بووە «چەندین جار پێدابچێتەوە» تا «لە کۆتایی کاردا بە تەنیا تێگەیشتنو دەرك کردن بە ناوەڕۆکەکەی»[١١٩] وازی هێناوە ، لە هۆی ئەو هەندە کەلێنە تێدەگەین کە لە وەرگێڕانەکەدا هەنو .کە لەگەڵ ئەوەشدا شێوەیەکی ڕەوانو مانارەوونی ی تێدایەو ئەوە وادەکا تێگەیشتنی ناوەڕۆکە سەرەکی یەکەی میر بەبێ گرێوگۆڵ لە توانادا هەبێ .

بەلاَم وەك دەردەکەوێ ، ئەم وەرگێڕانەو پێشەکی یەکەی خاوەنەکەی دەورێکی ئەوتۆیان لە پێکهێنانی باری سەرنجێکی دروستدا دەربارەی مەکیاڤیللی و بیرو باوەڕەکانی لە لای خوێنەری عەرەبو ڕۆژهەلاَتی بەگشتی نەگێڕاوە ، ئەمە لە کاتێکدا هەموو نیشانەیەك وادەگەیەنێ کە پێگەیشتنی ئەو جۆرە باری سەرنجە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم ،[١٢١] واتە بۆ سەردەمێك کە هیچ ڕووناکبیرو مێژوو نووسێکی ڕۆژئاوایی نەمابوو ، چەندە لایەنداریش بووبێ ، کتێبەکانی بە باری باشەدا

هەڵنەسەنگاندبێ ، لەوانە مێژوو نووسی سەر بە جەزویتەکانو عەمیدی پێشووی کۆلیجی کامبیۆن لە زانکۆی ئۆکسفۆرد (لیسلیۆ کەر) . لە راستیدا کەم مێژوو نووسی ناسراوی هاوچاخ هەن بە بڵندی مەکیاڤیللی یان هەڵنەسەنگاندبێ .

## بیرورای هاوچاخ

لەوەبەر باسی بیرورای ژمارەیەکی زۆر لەو فەیلەسووفو رووناکبیرانەمان کرد کە لە واقیعی حاڵی بیروباوەرەکانی مەکیاڤیللی تێگەیشتبوونو بە رەزامەندییەوە هەڵیانسەنگاندوون . بەڵام ئاسایی بوو کار تەنیا بەوانەوە نەوەستێ ، بەڵکوو لە سەردەمی ئێستاشماندا چەندین رووناکبیرو نووسەری سەر بەگەلێ قوتابخانەی ئایدۆلۆژیایی جیاجیا ، لە هەمان باس دواونو هەر کە باسی سەردەمی راپەرینو پێشکەوتنی زانستیی سیاسەت یا لێکۆڵینەوەی مێژوویییان کردبێ ، مەکیاڤیللییان وەك مێژوو نووسو زانایەکی سیاسی بە دیار خستوە ، لە ناویاندا ژمارەیەکی زۆر لەو مێژوو نووسە رۆژئاواییە ناسراوانەی کە لە رۆژهەڵاتدا ناوو ناوبانگێکی بەرزیان هەیەو کتێبەکانیان وەرگێردراونەتە سەر زمانەکانی ، بەڵام بەبێ ئەوەیشی کاریان کردبێتە سەر ئەو بیروزایەی لە ریزی کوروکاڵانیدا دەربارەی مەکیاڤیللی باو بووە . ئینجا ئێمە لێرەدا بۆ کۆتاییپێهێنانی لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی مێژوو نووسی گەورەی سەردەمی راپەرین ، تەنیا چەند نموونەیەکی کەم لە بیروراکانی نووسەرە بێگانەکان نیشان دەدەین .

لە (ئەنسکلۆپیدیای بەریتانیایی)دا دەربارەی مەکیاڤیللی وتراوە :

«نووسەرو کارگێری ئیتالیایی دەوڵەت نیکۆلو مەکیاڤیللی ، رووناکبیرێکی نیشتمانپەروەری بلیمەت بوو . تێگەیشتنی ژیرانەی لە سیاسەتی هاوچاخی خۆیو دەرك کردنی قووڵی بە تەبیعەتی ئادەمیزاد ، چاکترین بەرهەمیان لێوەشاوەتەوە کە زۆر جار بە هەڵە بە کاری گەندەڵ یا گاڵتەجاری دراونەتە قەڵەم . ئەو پیاوێکی سەرراستو هاوولاتییەکی چاكو باوکێکی دڵسۆز بووە . هەروەکوو نووسەرێکی گەورەش بووە ، چونکە رووناکبیرێکی مەزن بووە» . (١٢٢)

«ئەنسکلوپیدیای ئەمەریکایی»ش مەکیاڤیللی بە رەمزی گواستنەوە لە سەردەمی

ناوەڕاستەوە بۆ سەردەمی نوێ دەداتە قەڵەمو «دروستی ی بیروباوەڕە سیاسی یەکەی» بەو خزمەتانەوە دەبەستێتەوە کە پێشکەشی رژێمی جەمهووری ی فلۆرنسای کردووەو بە بارێکی بالأدا قسە لەرووبی یەکەی هەڵدەسەنگێنێ . هەروەکوو دەیسەلمێنێ کە «مەکیاڤیللی نەی وتوە هیچ رەوشتو بەهایەك لە سیاسەتدا نی یە ، بەڵکوو وتویێتی کە سیاسەت رەشتو بەهای تایبەتی ی خۆی هەیەو ئەم جۆرە باوەرەش عادیلانە دێتە پێش چاوو بگرە بۆ سەردەمێك کە بەدی هێنانی یەکێتی ی نەتەوایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی ی تیادا وەك ئامانجێکی بالأی ئەوتۆ کە هەموو شتێکی تر لە ئاستیدا لاوەکی بێ ، بە پێشبینی یەك دەدرێتە قەڵەم» . (١٢٣)

لە باری سەرنجی «ئەنسکلۆپیدیای فەلسەفی»ی سۆڤیاتی یشەوە ، مەکیاڤیللی بە یەکێك لە دیارترینی ئەو رووناکبیرە ئیتالیایی یانە دادەنرێ کە هەوڵی داوە «دوور لە لاهووت ، یاساکانی بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگا دەسنیشان بکاو تیروانینێکی ریالیستانەی دروست روانیوێتی یە دەوڵەتو حوکمرانانو لە باوەرێکی دڵسۆزانەوە نووسینی لە پێناوی یەکگرتنی ئیتالیادا نووسیوە» . (١٢٤) هەروەها هەمان شت لە «ئەنسکلۆپیدیای مێژوویی»ی سۆڤیاتیداو (١٢٥) لە چاپی دووەمو سی یەمی «ئەنسکلۆپیدیای گورەی سۆڤیاتی»دا (١٢٦) وتراوەتەوە . لە جزمی چوارەمی «مێژووی جیهان» یشدا نوسراوە : «ئەنجامە کوشندەکانی بەش بەش بوونی ئیتالیا تارادەیەکی ئەوتۆ ئاشکراو لەروو بوون کە هەندێ لە نوێنەرە زیاتر پێشکەوتنخوازەکانی بورجوازی یەت لە سەدەی شازدەیەمدا کەوتنە داواکردنی یەکگرتنی ئیتالیاو یەکەمینیشیان رووناکبیری سیاسیو مێژوو نووسی ناسراو نیکۆلۆ مەکیاڤیللی بوو» . (١٢٧) هەروەکوو مێژوونووسی ئەمەریکایی کارلتۆن هیس بە هەمان جۆر مەکیاڤیللی هەڵسەنگاندوە . (١٢٨)

ئەمرۆش دەمارگرژترین کەسانێك بۆ جزویتەکانو کزترینیان لە سۆزداریدا بەرامبەر بە مەکیاڤیللی ، (١٢٩) دان بەوەدا دەنێ کە ئەو «رێگایەکی نوی ی بۆ لێکۆڵینەوەو ....شێوازیکی تازەی بۆ قسەکردن لە سیاسەت دیوەتەوە ، ئەمە جگە لە تیوری یە سیاسی یە نوی یەکانی» ، هەروەکوو «بەوپەری وردی و بیرتیژی یەوە ، ئەو پاڵپێوەنەرو هۆیانەی دەسنیشان کردوون کە هەر بزوتنەوەیەکی سیاسی دێننە کایەوە» .

لەبەر ئەوە «بە یەکێك لە کارامەترینی ئەو نووسەرە دیارانە دادەنرێ کە کاریان کردۆتە سەر کاروباری سیاسی لە جیهاندا»و وادەکا «بیروراکانی سەبارەت بە گیروگرفتە سیاسی‌یەکان جێگەی لێکۆڵینەوەو بە دواداچوونێکی قووڵ بن» .[١٣٠] یا هەن لە هەمان باری سەرنجەوە بە «باوکی زانستی‌یە سیاسی‌یەکانی»[١٣١] داوەنێن ، یا بە «پێغەمبەرێکی دەوڵەتی نوێی نەتەوایەتی‌ی»[١٣٢] دەزانن . •

هەروەها مێژوو نووسی ئەمەریکایی رۆبەرت بالمەر لە دووان لە کتێبەکانیدا ، دەیسەلمێنێ کە ٠ مەکیاڤیللی «لە ناو نووسەرانی سەردەمی راپەرین لە ئیتالیادا بە دیارترینیان» دەژمێردرێ‌و «میر»«مەزنترین میراتی نەمری» ئەو سەردەمەیەو مەکیاڤیللی «خەوی بەو رۆژەوە دەدی کە خەڵکی فلۆرنساو بگرە گشت ئیتالیایی‌یەکان بە نواندنی مەردایەتی لە کۆرە سیاسی‌یەکانیاندا وەك رۆمانی‌یە دێرینەکان کردار بکەن‌و لە ریزی لەشکرەکانی شارەکاندا بە هاندانی ئامانجە نیشتمانی‌یەکان بجەنگن‌و سەری خۆیان لەبەردەم ئەوروپادا بەرز بکەنەوە»[١٣٣]

لە ناو مێژوو نووسە ئیتالیایی‌یە هاوچاخەکانیشدا هەن مەکیاڤیللی بە شۆرشگێرو[١٣٤] «پێغەمبەرێکی بێ دەسەلات»[١٣٥] دەدەنە قەڵەم. ئەمرۆ لە ناو مێژوو نووساندا بە دەگمەن هەن دان بەوەدا نەنێن کە مەکیاڤیللی «هاووڵاتی‌یەکی چاك‌و هاورێ‌یەکی گیانی بەگیانی‌و باوکێکی بەتەنگەوەهاتووی نیشتمانپەروەروبگرە نموونەیی»[١٣٦] . بووە .

دەتوانرێ دەیەها نموونەی تری لەم بابەتە بهێنرێتەوە . بەلام ئێمە تەنیا ئەم وێنە پڕ مانانەیان لێدەخەینە پێشچاو کە أ . ڤ . جیفیلیکۆف لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی مەکیاڤیللی پێشکەشی کردووەو وتوویە :

«ئیتالیا نەیتوانی یەك بگرێ . بوچی؟ . ئەمە بوو ئەو پرسیارەی نیکۆلۆ ئاراستەی خۆی دەکرد . ئێمە وەرامەکەی دەزانین (وەرامی مەکیاڤیللی – ك.م) : یەکەم لەبەر نەبوونی یەکێتی‌ی سیاسی لە ئیتالیادا . دووەم لەبەر ئەوەی لە ئیتالیادا سوپایەکی نیشتمانی چ لە کوڕو کاڵانی خۆی یا لە سەربازی بەکرێگیراو نەبوو . کەوابێ چار چی بوو؟ . یەکگرتن‌و دامەزراندنی سوپا . بۆ جێبەجێ کردنی ئەمەش دەبوو شێوازەکانی

کارکردن روون بکرێنەوە . مەکیاڤیللی بە پێی بۆچوونی خۆی لەم بارەیەوە ، ئەنجامی بەوە شکاندەوە کە بنچینەکانی زانستی‌ی سیاسەتی دارشت ، کوت‌ومت وەك کۆلۆمبس کە وەختێ کەوتە گەڕان بە دوای ڕێگایەکدا بۆ هیندستان ، ئەمەریکای دۆزی‌یەوە» . (١٣٧)

گشت ئەوەی باس کرا ئەوپەڕی هەق بە مەکیاڤیللی دەدا داوا لە ڕۆژهەڵاتی‌یەکان بکا کە خۆی لە واقیعدا چۆن بووە وەهای ببینن‌و بیروباوەڕەکانیشی چۆنن وەهایان هەڵبسەنگێنن . بەڵێ :

«مەدح‌وستایش هەرگیز لە وزەیدا نی‌یە ئەم ناوە بە هەقی خۆی بگەیەنێ» .



## پەراوێزەکان

(١) : مەکیاڤیللی لە تەمەنی دوانزە ساڵاندا بووە کە یەکەم کتێبی دەربارەی مێژوو خوێندۆتەوە .

(2) : R . Ridolfi the life of Niccolo Machiauelli, translated from the Etalian by G. Grays on, chicago, 1963, P. 3.

(٣) : ا.ك. جیفیلیکۆف ، نیکۆلۆ مەکیاڤیللی (١٤٦٩–١٥٢٧) ، موسکۆ–لینینگراد ، بە زمانی رووسی ، ل ٢٤ .

(4) R. Ridolfi, Op. Cit., pp. 9-12; F. Chabod, Machiavelli and the Renissance, translated from the Italian by D. Moore, Cambridge, 1960, pp. 7-9;

(5) R. Ridolfi, Op. Cit., p.4.

(6) F. Chabod, Op. Çit., p. 126.

(٧) أ.ك. جيفيليكۆف ، .سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٤

(٨) : هەمان سەرچاوە–ل ٣٢ .

(٩) : ف. رۆتینبۆرگ ، (فیلەتەنەکانی سەردەمی راپەڕین) ، بە زمانی رووسی ، لینینگراد ، ١٩٧٦ ، ل ١٢٠ و ١٢١ .

(١٠) : سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٠

(١١) : بروانە کتێبی :

H. Butterfield, the Statecraft of Machiavelli, London, 1960, p. 125.

(١٢) : لە شوێنێکی‌تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ، دەگەڕێینەوە سەر کتێبە گەورەکەی مەکیاڤیللی (دەمەتەقێ)

(١٣) : پیشەسازیی قوماش لەو رۆژگارەدا ، نەك تەنیا لە ئیتالیادا ، بەڵکوو لە گشت ئەورووپادا لە پیشە بە قازانجەکان بوو .

(١٤) : ئەوە لە نامەیەکیدا وتراوە کە بۆ فیتۆریی هاوریێی ناردوە . (بگەڕێرەوە سەر :

.(F. Chabod, Op. Cit., pp. 131-132).

(١٥) : أ.ك. جیفیلیکۆف–سەرچاوەی پێشوو–ل ١٩ .

(16) F. Chabod, Op. Cit., pp. 4,126,134-135.

(17) R. Ridolfi, Op. Cit., pp. 145, 156.

(18) F, Chabod, Op. Cit,. p. 132.

(19) Ibid, p. 129.

(٢٠) : نیکۆلا ئەلکسێیف ، نیکۆلۆ مەکیاڤیللی ، بە زمانی بولگاری ، سۆفیا ، ١٩٠٨ ، ل ٢٧–٢٨ .

هەروەها ف . رۆتینبۆرگ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٢–١٢٣ .هەروەها ل.م باتکین ، (مرۆڤپەروەرە ئیتالیایی‌یەکان) ، شێوەی ژیان ، شێوەی بیرکردنەوە ، بە زمانی رووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٥٨–٥٩ . هەروەها :

"The Prince", London, 1968, pp. 18-19 ( the Introduction by G. Bull).

(٢١) : تیتۆس لیڤي (٥٩ پ.ز–١٧ د.ز) ، مێژوو نووسێکی ناسراوی رۆمەکانە . ٤٥ ساڵی بە دانانی کتێبە گەورەکەیەوە (مێژووی رۆما لە دامەزراندنی شارەکەوە) بەسەر بردووەو بریتی بووە لە ١٤٢ بەرگ‌و تەنیا ٣٥ بەرگی ماونەتەوە . یەکەمین ده کتێبیان کە مەکیاڤیللی بۆ نووسینی کتێبی (دەمەتەقێ) کردوێتی‌یە سەرچاوەیەکی سەرەکی ، باسی ئەو کارەسات‌و رووداوانە دەکەن کە هەتا ساڵی ٢٩٣ی پێش زایین روویان داوە .

(٢٢) : مەکیاڤیللی ئەوەی لە پێشەکی‌ی کتێبی (دەمەتەقێ)دا وتوە .

(23) F. Chabod, Op. Cit., p. 24.

(24) F. Gilbert, Machiavelli and Guiccardini.
Politics and history in sixteenth century.
Florence, Princeton, 1965, p. 199.

(25) R. Ridolfi, Op. Cit, pp. 165-175.

(26) "The Prince", p. 15 (the Introduction).

(27) R. Ridolfi, Op. Cit., pp. 249-250.

(٢٨) : پشتمان بە وەرگێرانە عەرەبی‌و رووسی‌و ئینگلیزی‌یەکەی بەستوە .

(٢٩) : بگەڕێرەوە لای : ئەلین فیدرین–مەکیاڤیللی–وەرگێرانی أميرة الزين–بيروت–ساڵی نی‌یە–ل ٣٢–٣٣ .

(30) R. Palmer and J. Colton, A history of the
Modern World third edition, NewYork,
1965, p. 55

(٣١) : مەکیاڤیللی ئەم قسە بەناوبانگەی بە بۆنەی هێرشی فەرەنسایی‌یەکانەوە بۆ سەر ئیتالیا لە ساڵی ١٤٩٩دا‌و بەرەو پێش‌چوونی خێرایانەیان وتووە «بگەڕێرەوە سەر–مێژووی ئیتالیا–بە زمانی

رووسی ، جزمی یەکەم ، لە ژێر چاوەدێری ئاکادیمیست .س.د. سکازکینەدا ، موسکۆ ، ١٩٧٠ ، ل ٤٥٥».

(٣٢) : بەزۆری پشتم بە وەرگێرانە عەرەبی‌یەکەی ئەم کتێبە بەستوە «بگەڕێرەوە سەر—دەمەتەقێی مەکیاڤیللی—وەرگێرانی خیری حماد ، بیروت ، ١٩٦٢».

(٣٣) : ئەوە تاقە کتێبێتی کە لە ژیانی خۆیدا لە سالی ١٥٢١ دا بلاوکراوەتەوە .

(34) R. Palmer and J. Colton, Op. Cit., p. 55.

(35) J. Plamenatz, Man and Society. A critical examanation of some important Social and Politicce theories, from Machiavelli to Marx, Vol. 1, tenth impression, London, 1977, pp. 1,7.

(٣٦) : لە کۆتایی سەردەمی ناوەراستدا باری ئابووری ئیتالیا خێراتر لە ولاتەکانی تری ئەوروپا رووی لە پێشکەوتن‌کرد ، ئەویش لە سایەی بازرگانی‌یە گەشەسەندوەکەیەوە لەگەل رۆژهەلاتداو پێشکەوتنی بەرهەمی پیشەیی تیایدا بەرادەیەك کە ئیتالیا بەر لەهەر شوێنێکی‌تری جیهان ، یەکەمین نیشانەی پەیوەندی‌و بەرهەمهێنانی سەرمایەدارانەو دەستەو تاقم‌و چینە کۆمەلایەتی‌یە نوێیەکانی بە خۆیەوە دی .

(37) H. Butterfield, Op. Cit., pp. 114- 115.

(٣٨) : بۆ درێژەی باس بگەڕێرەوە لای : و.ل. فانیشتین ، مێژوو ناسی‌ی ئەوروپایی رۆژئاوا لە سەردەمی ناوەراستدا ، بە زمانی رووسی ، مۆسکۆ—لینینگراد ، ١٩٦٤ ، ل ٢٨٦ .

(٣٩) : ئیتالیایی‌یەکان گەلانی‌تری ئەوروپایان بە وەحشی (کێوی) ناو دەبرد ، بەو مانایەی کە لە چاو خۆیاندا دواکەوتوون .

(40) W. Lewis, The Lion and the Fox. The role of the hero in the Plays of Shakespeare, London, 1966, p. 69;

(٤١) : د.ل. فاینشتین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٧٩

(42) H. Butterfield, Op. Cit., p. 97.

(٤٣) : بۆ نموونە بگەڕێرەوە سەر : ئەلین فیدین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٢ .

(44) "The Prince", p.20 (the Introduction).

(٤٥) : له ڤ. رۆتینبۆرگ . سەرچاوەی پێشوو . ل ١٢٢ ەوە وەرگیراوە

(٤٦) : شارێکی فەرەنسایە دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی پاریسەوەو بارەگای دەرباری پادشا بووە.

(٤٧) : له (ڤ. رۆتینبۆرگ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٢)ەوە وەرگیراوە .

(٤٨) : بۆرجیا بنەماڵەیەکی سەرداری ناسراوە کە بە نەژاد ئەرگۆنی ئیسپانیایی بەو لە سەدەی پانزەیەمدا رووی کردۆتە ئیتالیا . ئەم بنەماڵەیە لە سایەی ئەلفۆنسۆ بۆرجیاوە کە لە ساڵی ١٤٥٥ دا بووە بە پاپا بەدیارکەوتوە . هەروەها ئەلیکساندەری شەشەمیش یەکێك بوو لە خزمانیو لە ساڵانی (١٤٩٠-١٥٠٣)دا بوو بە پاپا .

(49) H. Butterfield, Op. Cit., pp. 131-132; "The Prince", pp. 22-23 "the Introduction).

(٥٠) : «مێژووی ئیتالیا»(سەرچاوەی پێشوو) ، ل ٣٣٥-٣٣٦ .

(51) F. Chabod, Op. Cit., pp. 94-95; R. Ridolfi, Op. Cit., p.9.

(٥٢) : ئەلین فیدرین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٢

(53) J. Plamenatz, Op. Cit., p. 33.
R. Rodilfo, Op. Cit., pp. 53-64; J Plamenatz, Op. Cit., p. 14.

(٥٤) : ئەم رایە بایەخێکی گەورەی هەیە ، چونکە مەکیاڤیللیەکان دەبوو شوێن پێیان هەڵگرن .

(55) F. Chabod, Op. Cit., pp. 140, 142; F. Gilbert, Op. Cit., pp. 176-177.

(56) J. Plamenatz, Op. Cit., p. 42.

(57) S. H. Sabine, A history of Political theory, New York, 1950, pp. 337, 338.

(٥٨)«برایەتی یەسووعیەت» یا «قەشە یەسووعیەکان»

(59) R. Weiss, The spread of Italan Humanl-
sm, London, 1964, p. 84.

(٦٠) : ناونیشانی تەواوی کتێبەکە ئەمەیە :

"Discours sur les Moyens de bien gouverner et maintenir en bonne paix un Royaume ou autre Principaute-Contre Nicholas Machiavel", Florentin, 1576.

(٦١) : بگەڕێرەوە لای :

W. Lewis, Op. Cit., pp. 64, 71-72.

(62) Ibid, p. 71.

(63) Ibid, p. 66.

(64) Ibid, p. 69.

(65) Ibid, p. 72.

(66) "The Prince", p.9 (the Introduction).

(67) "Anti-Machiavel".

(٦٨) : لە (و. د. فاینشتین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٦٨)ەوە وەرگیراوە .

(69) W. Lewis, Op. Cit., P. 102.

(٧٠) : مەبەست لەوەیە کە ئەگەر میرێك هەبووایە خۆی بە قوتابی ی مەکیاڤیللی بزانیایە ، فەرمانی پێدەدا کە لە دانانی کتێبێکدا دژی مەکیاڤیللی لاسایی فردریکی گەورە بکاتەوە .

(71) W. Lewis, Op. Cit., pp. 102-103.

(72) Ibid, p. 105.

(73) "Renaissance and Reformation 1300-
1648", Edited by G.R. Elton, Second
edition, New York, P. 109.

(٧٤) : بگەڕێرەوە لای : ئەلێن فیلدرین ، سەرچوەی پێشوو ، ل ١٢-١٣ .

(75) A. Ridolfi, Op. Cit., p.9.

(٧٦) : بگەڕێرەوە لای : ئەلین فیدین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢-١٣ .

(٧٧) : مەکیاڤیللی ، میر ، ل ٦ «پێشەکی» .

(78) "The Civilization of the Renaissance in

Italy", An Essay by J. Burckhardt, New-York and Toronto, p. 93.

(٧٩) : أ. ك. جيفيليكۆف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٧ .

(٨٠) : ف. رۆتینبۆرگ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١٢-١١٣

(٨١) : ئەنتۆنیۆ گرامشی ، میری نوێ ، مەسەلەکانی زانستی سیاسەت لە مارکسیەتدا وەرگێڕانی زاهی شرقاو قیس الشامی ، بیروت ، ١٩٧٠ ، ل ٣٥ .

(82) R. Ridolfi, Op. Cit., pp. 196-197.

(٨٣) لەناو ئەو چەندین سەرچاوەیەدا کە بۆ ئامادە کردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە گەڕاومەتەوە سەریان تەنیا جیفیلیکۆف بایەخی تەواوی بەم باسە گرنگە داوە .

(٨٤) : أ.ك. جیفیلیکۆف ، سەرچاوەی پێشوو . ل ١٠٣ .

(٨٥) : لە هەمان سەرچاوە وەرگیراوە ، ل ١٠٦ .

(٨٦) : هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٧ .

(٨٧) : وتەکە لە هەمان سەرچاوە وەرگیراوە ، ل ١١١ .

(٨٨) : زۆربەی مێژوونووسان بە شێوەیەکی رووت‌وقووت ئیشارەتیان بەم وتەیە داوە ، واتە بەبێ نیشاندانی ئەو بارودۆخەی تیایدا وتراوە کە ئەوە بایەخێکی تایبەتی ی دەداتێ.
بۆ نموونە بگەرێرەوە سەر :

.(R. Ridolfi, Op. Cit., p. 241; F. Chabod, op. Cit., p. 142.

(٨٩) : مەکیافیللی زاراوەی «پێغەمبەری بێ‌چەك»ی لە کاتی قسەکردنیدا لە بارەی رەبەنی فلۆرنسایی شۆڕشگێری هاوچاخی خۆیەوە (سافۆنارۆلا) بەکارهێناوە.لەم رووەوە سەلماندویتی کە سەرکەوتن تەنیا بەشی پێغەمبەرە چەکدارەکان بوومو دەبێ . «میر-بەشی شەشەم» .

(٩٠) : بەهۆی نەخۆشی‌یەکەوە لە گەدەیدا مردوە کە رەنگە ئارام لە بەربڕان کارێکی گەورەی تێکردبێ .

(٩١) : گەلێ لە مێژوونووسان مەکیافیللی نەك فرانسیس بیکۆن ، بە داهێنەری رێبازی لێگەڕان (أستقرائی) دادەنێن .

(٩٢) : لە ف.ی. رۆتینبۆرگەوە وەرگیراوە ، سەرچاوی پێشوو ، ل ١١١ .

(٩٣) : سەرەرای ئەو شالأوەش سیاسی یەکان بە فراوانی لەسەر خوێندنەوەی «میر» بەردەوام بوون . (بگەڕێرەوە سەر

C. Hayes, Modern Europe to 1870, New York,

1959, p. 26).

(٩٤) : ف.ی. رۆتینبۆرگ . سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١٤ .

(٩٥) : بگەڕێرەوە سەر «ئەنسیکلۆپیدیای فەلسەفی» بەزمانی رووسی ، جزمی سێیەم ، مۆسکۆ ١٩٦٤ ل ٢٨٠ .

(٩٦) : ڤۆلتێر پەیوەندی یەکی پتەوی لەگەڵ ژمارەیەك لەو پادشا ئەوروپایی یانەدا هەبوو کە خۆیان بە پشتگیری کەری بزوتنەوەی رۆشنکاری (تنویر) نیشاندەدا ، لەوانە فردریکی گەورەو قەیسەری رووسیا کاترینی دووەم .

(٩٧) : بگەڕێرەوە لای أ.ك. جیفیلیکۆف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٠ .

(٩٨) : ك. مارکس و ف. ئینگلس ، بەرهەمەکانیان بە زمانی رووسی ، چاپی دووەم ، جزمی یەکەم . ل ١١١ .

(٩٩) : ف. ی. رۆتینبۆرگ ئەو وتەیەی ئینگلسی بۆ ناونیشانی کتێبەکەی دەربارەی سەردەمی راپەڕین هەڵبژاردوە (بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی ژمارە ٤) .

(١٠٠) : ك. مارکس و ف. ئینگلس ، بەرهەمەکان ، جزمی ٢٠ ، ل ٣٤٦ .

(١٠١) : دوای گەرانمان بە ناو هەر پەنجاو پێنج بەرگەکەی دواچاپی بەرهەمەکانی لینیندا ، هیچ ئیشارەتێکمان بە مەکیاڤیللی تێدا نەدین .

(١٠٢) : بگەڕێرەوە سەر : «دەمەتەقێ» ، پێشەکی ، ل ١٥-١٧ ، ف.ی. رۆتینبۆرگ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤٤ .

H. Butterfield, Op. Cit., pp. 81-83.,;J. Plamenatz,

Op. Cit., p. 42; J.R. Strayer and others, The

Mainstream of Civilization, New York, 1974,

p. 408.

(١٠٣) : نووسەریش هەن کە ناپلیون پۆناپارت بە «نوێنەرێکی راست و دروست»ی مەکیاڤیللیزم دادەنێن . بۆ نموونە بگەڕێرەوە سەر :

(103) "The Prince", p. 22 (The Introduction).

H. Butterfield, Op. Cit., p. 102)

(١٠٤) : بگەڕێرەوە لای ئەنتۆنیۆ گرامشی، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٣و شوێنی تریش .

(١٠٥) : سانتیاگۆ کاریللۆ، ئەورۆ کۆمۆنیزم و دەوڵەت ، وەرگێرانی د. سعاد محمد خضر ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٤ .

(١٠٦) : لە أ.ك. جیفیلیکۆفەوە وەرگیراوە ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠١

(107) "The Prince", p. 21 (The Introduction).

(١٠٨) : پشتمان بەو چاپە بەستوە کە شێخ ئەلیاس خلیل زخریا ، بیروت ١٩٦٣ ، ساغی کردۆتەوەو پەراوێزی لێداوە .

(١٠٩) برادەر دوکتۆر ناجی حسن دەیەوێ بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەم باسە بدوێ .

(١١٠) بگەڕێرەوە سەر : ئیف لاکۆست ، أبن خلدونی ناودار ، وەگێرانی میشال سلیمان ، بیروت ، بێ یە ، ل ١٥٦ .

(١١٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٩ .

(112A) Creasy, History of the Ottoman Turks Beirut, 1961, pp. 252-253.

(١١٣) قسەی یەکێکە لەو وەگێرە سوریایی یانەی لای فەرەنسایی یەکان لە هێرشەکەیاندا بۆ سەر میسر لەگەڵ محمد علی ی گەورەدا لە سەردەمی خۆیدا ئیشی کردوە .

(١١٤) بۆ درێژەی باس بگەڕێرەوە سەر : دوکتۆر جمال الدین الشیال ، مێژووی وەرگێرانو بزوتنەوەی رۆشنبیری لە سەردەمی محمد علیدا ، قاهرە ، ١٩٥١ ، ل ٧٨–٨٢ ، ١٦٦–١٦٧ ، ٢١٦ .

(١١٥) دەربارەی لاوازی ی وەرگێرانەکە بگەڕێرەوە سەر ئەو بەراوردەی دوکتۆر جمال الدین الشیال لە ل ٢١٦ی کتێبەکەیدا کردویتی . دەبێ ئەوەش بڵێین کە دەستووسی ئەم وەرگێرانە هێشتا ماوەو لە (دار الکتب)ی میسریدایە .

(١١٦) «کتێبی میر کە بریتی یە لە مێژووی میرایەتی یە رۆژئاوایی یەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا» ، دانانی نیکۆلا مەکیافیللی ، وەرگێرانی پارێزەر محمد لطفی جمعە ، قاهرە ١٩١٢ .

(١١٧) دەقی «میر» لە وەرگێرانە عەرەبی یە دووەمەکەیدا لە ١٤٨ لاپەرە دایە .

(١١٨) هەمان سەچاوە ، ل ٣٥ . (١١٩) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٣ .

(١٢٠) لە ساڵی ١٩٦٠دا وەرگێرانێکی نوێ ی میر لە لایەن خیری حادەوە بڵاوکرایەوە کە هەتا ئێستا چەند چاپێکی لێدەرچوەو لە پاڵ دەقی «میر» خۆیدا ، وتەیەکی مۆسۆلینی و پێشەکی یەکی فراوانی کریستیان گاوس و بە دوادا چوونێکی فاروق سعدی، وەك پاشکۆیەك لە دواداوایی کتێبەکەدا لە گەڵدان .

(١٢١) پارێزەر محمد لطفي جمعه وەك لە پێشەكی‌یەكەیدا بۆ «میر»و لە شێوەی وەرگێرانەكەیدا دەردەكەوێ ، خاوەنی رۆشنبیری‌یەكی بالاّ بووە ، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لە رێگەی یەكێ لە ئەوروپایی‌یەكانەوە نەبێ كە مەدح‌وستایشی زۆری‌و نموونە هێنانەوەی بەردەوامی لەسەر مەكیاڤیللی سەرنجی راكێشاوەو ئەوە وای‌لێكردوە بە دوای «میر»دا بگەرێ‌و وەری‌بگێرێ ، دەنا چی‌تری دەربارەی مەكیاڤیللی نەبیستوە .

(122) "Encyclopedia Brittannica", Vol. XI,vChicago-London, 1974, pp. 227,230.

(123) "Encyclopedia Americana", Vol. 18,vNew York, 1976, pp. 52-53.

(١٢٤) «ئەنسكلۆپیدیای فەلسەفی»، بە زمانی رووسی ، جزمی سێ‌یەم ، مۆسكۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٢٨٠–٢٨١ .

(١٢٥) «ئەنسكلۆپیدیای مێژووی سۆڤیاتی»، بە زمانی رووسی ، جزمی هەشتەم ، ١٩٦٥ ، ل ٩٣٣–٩٣٤ .

(١٢٦) «ئەنسكلۆپیدیای گەورەی سۆڤیاتی»، بە زمانی رووسی ، چاپی دووەم ، جزمی ٢٥ ، مۆسكۆ ١٩٦٤ ، ل ١٠٦–١٠٧ ، هەروەها چاپی سێ‌یەم ، جزمی ١٥ ، مۆسكۆ ، ١٩٧٤ ، ل ٢٤ (٧٠٩–٧١١) .

(١٢٧) «مێژووی جیهان»، بە زمانی رووسی ، جزمی چوارەم ، مۆسكۆ ، ١٩٥٨ ، ل ١١٥ .

(128) C. J. Hayes, Op. Cit., pp. 18, 115.

(١٢٩) مەبەستمان ، ئیسلی وّكەری عەمیدی پێشووی كۆلیجی كامبیۆنە .

(١٣٠) بگەرێرەوە سەر ل ١٩ ، ٢٢ی پێشەكی‌یەكەی لیسلی وّكەر لە «دەمەتەقێ»دا .

(131) "Action and Conviction in Early Modern Europe", editors J.K. Rabb and J.E. Seigel, Princeton, New Jersey, 1969, p. 26.

سیفەتی دامەزرێنەری زانستی‌ی سیاسەت بە لایەنی كەمەوە لە نیو سەدە لەمەوبەرەوە ، لە پالّ ناوی مەكیاڤیللیدایە .

(132) F. Gilbert, Op. Cit., pp. 183, 199.

(133) R. Palmer and J. Colton, Op. Cit., pp. 43.

(١٣٤) بگەرێوە سەر . ف . ی . رۆتینبۆرگ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٧–١٠٨ .

(135) R. Ridolfi, Op. Cit., pp. 251-254.

(136) R. Weiss, The Spread of Italian Humani- sm, London, 1964, p. 83.

(١٣٧) أ. ف. جیفیلیكۆف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩١ .

# له نیکۆلۆ مەکیاڤیللی یەوە
# بۆ لیۆرانسۆی مەزنی کوڕی
# بیارۆ دی میدیتچی (١)

خەڵکی پیشەیان وەهایە کاتێ دەیانەوێ خۆیان لە میرێك نزیك بکەنەوە ، بەهەلا دەدەن جۆرە دیاری‌یەکی پێش‌کەش بکەن کە بە باوەڕی خۆیان گرانبەها بێ ، یا لەو بابەتە شتانە بێ کە دەزانن میر هۆگریانە . بەم شێوەیە دیاری بە زۆری لە بابەتی ئەسپ‌و چەك‌و جل‌و بەرگی رازاوە بە زێڕو گەوهەرو زۆر کەل‌وپەلی جوانی‌تر کە شیاوی شان‌و شکۆی میران بن ، بە سەریاندا دادەبارێن . سا منیش لەبەر ئەوەی حەز دەکەم سووکە بەڵگەیەك بۆ نیشانەی دڵسوزی‌ی خۆم بەرامبەر بە جەنابی پایەبەرزتان پێشکەش بکەم ، لە ناو ئەو شتانەدا کە هەمن ، هیچی وەهام نەدی‌یەوە مایەی شانازی پێوەکردنم بێ‌و لای خۆم جیگەی ڕێزلێنانێکی زۆر بێ ، ئەو زانستی‌یەم نەبێ کە دەربارەی کردارو رەفتارە پیرۆزەکانی گەورەپیاوان هەمەو لە ئەنجامی ناق‌کردنەوەیەکی دوورو درێژی خۆمەوەو شارەزاییم لە کارەسات‌و بەسەر هاتەکانی ئەم سەردەمەی ئێستامان‌و وردکردنەوەی ڕووداوەکانی رابرووداد ، دەستم کەوتوە .

ئینجا دوای خۆماندووکردنێکی زۆر بە وردبوونەوەو کۆڵینەوەوە لە کردارو رەفتارەکانی ئەو پیاوە مەزنانە . گەیشتمە چەند ئەنجامێك کە ئەوەتا لە چوارچێوەی بەرگێکی بچووکدا . پێشکەش بە پایەبەرزتانی دەکەم . من هەرچەندە وایدادەنێم‌ئەم

کارە شیاوی ئەوە نی‌یە پایەبەرزتان لێمی وەربگرن ، بەڵام باوەڕم بە مرۆڤپەروەریتان دەخاتە سەر ئەو رایەی کە هەست‌و سۆزتان بۆ وەرگرتنی کتێبەکەم دەبزوێ ، چونکە برواتان هەیە کە من لەوە زیاترم لە وزەدا نی‌یە دیاری‌یەکتان لەمە بایەخدارتر پێشکەش بکەم کە دەزانم یاریدەتان دەدا لە ماوەیەکی کورتدا لە هەموو ئەو کاروبارانە حاڵی ببن کە من فێریان بووم‌و ساڵانێکی زۆری پڕ لە تەریکی‌و مەترسیم بۆ فێربوونیان بەسەر بردوون . هەوڵیشم نەداوە کتێبەکەم بە رستەی درێژدرێژ ، یا بە نەقش‌ونیگاری وشەی پڕبەدارو ، یا پلپلەو زلزلەی رەنگینی دروستکراوی ئەوتۆ برازێنمەوە کە گەلێ لە نووسەران بۆ تاس‌و لووسدانی بەرهەمەکانیان پەنایان دەبەنە بەر . چونکە من تەنیا هێندەم ناوونابانگ بۆ کتێبەکەم دەوێ کە لە سایەی بایەخداری‌و سەنگینی‌ی باسەکەیەوە بۆی ساز بێ . من دڵنیام هیچ لەخۆبایی‌بوونێك لەوەدا نی‌یە کە مرۆڤێکی تەریکی سەرکز بێتە بنشبەوەو خۆی لە هەوڵدانی باسکردنی حکوومەتەکانی میران هەڵبقورتێنی‌و ڕێنمایی‌یان بکا ، چونکە وێنەگرانی دیمەنەکانی سروشت ناو دۆڵ‌و نشێوەکان دەکەنە مەڵبەند ، هەتا لەوێوە وێنەی قەڵاو چیاکان ڕەسم بکەن ، هەروەکوو دەچنە سەر گردو هەڵەتەکان هەتا بەسەر دەشت‌و نشێواندا بڕوانن‌و دیمەنی راستەقینەیانیان دەسگیر بێ . بەم پێ‌یە تۆش دەبێ میرێك بیت تا بتوانیت بە وردی شارەزای دڵ‌ودەروونی گەل ببیت ، هەروەکوو پێویستە یەکێك بیت لە کوروکاڵانی گەل تا بتوانیت تەبیعەتی میران بناسیت .

جا ئاخۆ بەم حسابە ، بۆم هەیە تکا لە پایەبەرزتان بکەم ئەم دیاری‌یە بچووکەم ، بە هەمان گیانی پێشکەش کردنەکەیەوە لێ‌وەربگرن؟ خۆ ئەگەر لوتفتان نواندو پەیڕەوی ناوەرۆکی ئەم کتێبەتان کرد ، ئەوا دوایی پێدەزانن چ حەزێکی بەتەوژم لە دڵدایە بتانبینمەوە گەیشتبن بەو مەزنی‌یەی کە بەهرەو خۆشبەختی‌ی خودی خۆتان بۆی لە سەرپێن .

ئەگەر پایەبەرزتان مەرحەمەت بفەرموون‌و لەو کەشکەلانی فەلەکەتانەوە سەیری ئەم پەنای سەرکزی‌یە بکەن کە تیایدا داسەکناوم ، ئەوا پێدەزانن چ ئازارێکی گەورەو گران کە بەدبەختی‌یە نەگریسەکەم تووشی کردووم ، لە ناهەق دەچێژم .

# ١

# شێوەکانی حکوومەت و جۆری دامەزراندنیان

گشت ئەو حکوومەت و مەملەکەتانەی لە رابوردوودا فەرمانڕەوایی نەژادی ئادەمیزادیان کردووەو ئاتێستاش دەیکەن ، لە دوو شێوە بەدەر نین : یا شێوەی جەمهووری یەتە ، یاخود شێوەی پادشایەتی یە . پادشایەتیش یا میراتگری دەبێ کە بەدرێژایی ساڵانێکی دوورودرێژ ، حوکم کردن لە ناو کەسانی یەك بنەماڵەدا ئەم دەست و ئەو دەستی پێدەکرێ ، یاخود تازە دروست دەبێ و دێتە کایەوە . ئەم پادشایەتی یە تازە دروست بووەش ، یا لە هەموو شتێکیدا نوێ دەبێ وەك حاڵەتی (میلان) کە فرانسیسکو سفورزا[٢] خۆی تێدا کرد بە پادشا ، یاخود پاشکۆیەکی نوێ دەبێ و دەدرێتە پاڵ مەملەکەتی میرێکی میراتگر ، واتە میرەکە دەیداتە پاڵ مەملەکەتەکەی خۆی وەك حاڵەتی مەملەکەتی (ناپۆلی)[٣] کە پادشای ئیسپانیا حوکمی دەکا . ئینجا ئەم جۆرە دراوەپاڵەش ، یا ئەوەتا بەم شێوە حوکمە راهاتوو بووە لەبەر ئەوەی ژێردەستەی میرێکی تر بووە ، یاخود دەوڵەتێکی سەربەست بووەو بەلام لە رێگەی هێزی سوپایی تایبەتی میرەکەوە ، یا هێزی کەسانی ترەوە ، یا لە رێگەی خۆشبەختی و تواناو دەسەلاتێکی تایبەتی یەوە دراوەتە پاڵ مەملەکەتی ئەم میرە .

٢

# پادشایەتی ی میراتگری

لەم بەشەدا باسی جەمهوریەت ناکەم ، چونکە لە شوێنێکی تردا بە دووروودرێژی لێ‌یەدەدوێم ، (٤) بەڵکوو باسی پادشایەتی دەکەم‌و لەو رێ‌وشوێنانە دەدوێم کە شێوە جۆراوجۆرەکانی پادشایەتی ی پێ‌ بەرێوە دەبرێن‌و دەپارێزرێن . جا بەرادەی یەکەم ، ئەرکی پاراستنی پادشایەتی ی میراتگری کە خەڵکی تیایدا بە بنەماڵە فەرمانڕەواکە راهاتوون ، ئاسانترە وەك لە ئەرکی پاراستنی پادشایەتی‌یەکی نوێ ، چونکە لەویاندا تەنیا ئەوە بەسە کە پیاو دەسدرێژی نەکاتە سەر ئەو پاشماوە میراتییانەی خەڵکی ئاشنایان بوون‌و بشتوانێ لەگەڵ هەر دۆخێکی چاوەڕواننەکراودا خۆی بگونجێنێ . میر ئەگەر کوششبکارو کارامە بێ ، هەمیشە دەتوانێ لەم رێگایەوە پایەوپلەی خۆی بپارێزێ ، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە مەگەر هێزێکی بێ‌ئامانی زۆر کاریگەر بێتە کایەوەو لەو پایەوپلەیەی دەرپەڕێنێ . تەنانەت ئەگەر دەریشپەڕێنرا ، هێشتا هەر دەتوانێ کە هەر هێندەی میرە تازەکە سووکە پرێشکێکی بەختەرەشی گرتی‌یەوە ، ئەم پایەوپلەی پێشووی خۆی وەربگرێتەوە .

نموونەش بۆ ئەمەی وتمان ئیتالیایە کە دۆق فیزار توانی لە ساڵی ١٤٨٤دا لە رووی هێرشی و پەلاماری ڤینیسیایی یەکان و[٥] لە ساڵی ١٥١٠دا لە رووی هێرش و پەلاماری پاپا یۆلیۆسدا خۆی رابگرێ ، ئەویش لە سایەی یەك شتەوە بوو کە تەمەن درێژیی بنەماڵەکەی بوو لە فەرمانڕەوایی کردنی شارەکەدا . جا لەبەر ئەوەی کارێکی ئاسایی یە کە هیچ دووبەرەکی یەك بە حوکمی پێویستی و ناچاری ، نەتوانێ قەوارەی میرێکی خاوەن هەقی شەرعی بشڵەقێنێ ، هەروەها ئەوەش کارێکی ئاسایی یە کە گەل ئەو میرەی زۆر خۆش بوێ . چونکە ئەگەر ئەو خراپەکاری یانەی لێ یەوەشێنەوە لە رادەبەدەر نەبن و خەڵکەکە ناچاری بوغزاندنی نەکەن ، ئەوا بە لایانەوە ئاسایی دەبێ کە بە پەرۆشەوە هۆگری ببن و بەدرێژایی ساڵانی حوکمرانی یەکەی بەزم و رەزمی تازەبازی و نوێ کردنەوە فەرامۆش بکەن ، چونکە هەر ئاڵ و گۆڕێك لە رژێمی حوکمدا هەردەم رێگا بۆ ئاڵ و گۆڕێکی تر خۆش دەکا .

# ٣

# پادشایەتی تێکەڵاو

کۆسپ‌و تەگەرە هەمیشە یەخەی پادشایەتی‌ی نوێ دەگرن . چونکە دەوڵەت ئەگەر لەو بابەتە نەبێ کە تازە دروست بووبێ ، بەڵکوو لە ڕێگەی ئەندامەتی‌یەوە بێ لم دەوڵەتێکی تێکەڵاودا ، ئەوا بەرادەی یەکەم ئاژاوەی لە ئەنجامی ئەو کۆسپ‌و تەگەرە ئاسایی‌یانەوە تێدا سەرهەڵدەدا کە لە هەموو مەملەکەتە تازەکاندە ڕوودەدەن ، لەبەر ئەوەی کە خەڵکی لە حەزوئارەزووی خۆیانەوە بە هیوای چاککردنی باری ژیانیان ، روو لە گۆڕینی حوکمڕانەکانیان دەکەن . ئینجا ئەم باوەڕە هانیاندەدا بۆ شۆڕش‌بەرپاکردن دژی ئەو حوکمڕانانەی خەڵەتاندبوویانن ، بەتایبەتی ئەگەر بە تاقیکردنەوە بۆیان دەرکەوتبوو کە باری ژیانیان لە خراپەوە بۆ خراپتر چووە . ئەمەش ئەنجامێکی دروستی هۆیەکی بەڵگەنەویستی ترە کە بریتی‌یەلەو ئەشکەنجەو ئازارە بێ‌پەروایەی سەربازەکانی حوکمڕانە نوێ‌یەکە بە خەڵکی ئەو مەملەکەتەی دەنۆشن کە میرەکە خستوێتی‌یە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە ، یا بریتی‌یە لەو زەرەروزیان‌و دەسدرێژی‌کردنە لە ژمارەنەهاتووانەی لە داگیرکاریەکەی دەوەشێنەوە .

بەم شێوەیە تۆ هەردەم دوژمندار دەبیت و دوژمنانیشت لەوانە دەبن کە لە ئەنجامی داگیرکردنی ولاتەکەیاندا زەرەرمەند بوون . وەکی تر ناشتوانیت دۆستایەتیت لەگەڵ ئەوانەدا بپارێزیت کە بۆ دەسگیرخستنی ئەم مەملەکەتازەیە یاریدەیان دابوویت ، چونکە لە تواناتدا نابێ هەموو هیواو ئاواتەکانیان بەجێ بێنیت . هەروەکوو ئەوەشت لە وزەدا نابێ کە بە توندوتیژیو بە سەختی رووبەروویان ببیتەوە ، لەبەر ئەوەی وا هەست دەکەیت کە قەرزێکیان بەسەرتەوە هەیە . لەبەر هەموو ئەم هۆیانە ، تۆ لەشکرەکانت چەندە بەهێزیش بن ، هێشتا هەر پێویستیی هەرە زۆرت بە سۆزو خۆشەویستیی خەڵکەکە دەبێ تا بتوانیت ولاتەکەیان داگیر بکەیت . ئینجا رەنگە ئەم قسانەم ئەو هۆیانە روون بکەنەوە کە بوونە مایەی دەرپەراندنی پادشای فەرەنسا لویسی دوانزەیەم[٦] لە (میلان)و هەر دوای داگیرکردنیشی لە سایەی لەشکرە بەهێزەکانی یەوە بە ماوەیەکی کەم .

لە کاتێکدا ئەو هێزەی دەری پەراند ، بریتی بوو لە تەنیا لەشکرە پچووکەکەی لۆدفیکۆ[٧] کە هەر لە سەرەتاوە دیاربوو ئەو ئامانجەی پێی بەدی دەهێنرێ ، چونکە ئەو خەڵکەی لە سەرەتادا بە رەزامەندیی خۆیانو بە خۆشنوودی یەوە دەرگای شارەکەیانیان بۆ پادشای فەرەنسا خستە سەرپشت ، هەرزوو هەستیانکرد کە ئەو هیواو ئاواتانەی بە تەمایان بوون ، وەك بلقێکیسەر ئاو بوونو هیچ کام لەو سوودو مەسلەحەتانەیان دەسگیر نەبوو کە چاوەڕوانی بوون . بەم جۆرە نەیانتوانی لە ژێر باری فەرمانرەوایی میرە تازەکەیاندا بمێننەوە ، لەبەر ئەوەی لیی بەگومان بوون .

بەلام هەقە ئەوەش بوترێ کە ئەو حوکمرانەی مەملەکەتێکی لیهەڵگەراوە داگیر دەکاتەوە ، ئەمجارەیان بە ئاسانی لە دەستی نادا . چونکە ئەنجامی وریابوونەوەی بە دوای شۆرشەکەدا ، وای لێدێ لە رووی پارێزگاری کردنەوە لە پایەوپلەی خۆی ، کەمتر توندوتیژی لە سزادانی تاوانبارانو گرتنی گومانلێکراواندا بنوێنێو کەمتر هەوڵی خۆبەهێزکردن لە ئاستی لایەنە لاوازەکانی خۆیدا بدا . جا هەرچەندە تەنیا سەرهەڵدانی یەکێکی وەك دۆق لۆدفیکۆ لەسەر سنووری میلانەوە کارێکی وای کرد فەرەنسا لە جاری یەکەمیدا دەسەلاتی بەسەر شارەکەدا لە کیس بچێ ، بەلام لە جاری دووەمدا

ئەو دەسەلاتو سەروەری‌یەی بەسەر شارەکەدا وەختێك لە دەس چوو کە هەموو جهانی لیّ راست‌بووەوەو لەشکرەکانی شکێنرانو ناچار کران ئیتالیا جیّ بهێلّن ، ئەمیش لە سایەی ئەو هۆیانەوە بوو کە لەوەبەر لیّیان دووام . بەلاّم بە هەرحالّ ، لە هەردوو جاردا دۆراندی .

من ئەوەبوو هۆیە گشتی‌یەکانی دۆراندنەکەی جاری یەکەمیانم باس کردنو ئینجا ئێستا دێمە سەر شی‌کردنەوەی هۆیەکان لە جاری دووەمداو روونکردنەوەی ئەو ریّو شوێنانەی کە فەرەنسا دەیتوانی پەیڕەویان بکا تا ،نەیەلیّتەوە روویدا ، یا ئەو ریّوشوێنانەی کە هەر حوکمڕانێکی تری وەك پادشای فەرەنسا ، ئەگەر لە وەزعی ئەمدابووایە . دەبوو پەنایان بەرێتەبەرو کەچی نەیکرد . جا سەرەتا دەبیّ ئاگادار بین کە ئەو دەولّەتانەی بە چوونەپالّ دەولّەتێکی تر کە لەوەبەر هەبووە یەکدەگرنو کە رەنگە هەردوو لا لە یەك نەتەوە بنو بەیەك زمان بدوێن یاخود وەهاش نەبن ، پاراستنی چوونەپالّەکەی تێدا زۆر ئاسان دەبیّ ، بە تایبەتی ئەگەر دەولّەتە دراوەپالّەکە بە سەربەستی رانەهاتبیّ . بەلاّم لێرەدا بۆ بەدووگرتنی وەزعەکە لە مەترسی ، پێویستە ئەو بنەمالّەیەی لەوەبەر حوکمڕانی‌ی دەولّەتەکەی کردوە لە رەگ‌وریشەوە بن‌بڕ بکریّو ئیتر ئەوەی دەمێنێتەوە تا بلّیّی ئاسانە ، چونکە باروودۆخە باوەکەی رابوردوو تێکناچیّو ناشلّەقیّو خەلّکەکەش لە سایەی هەر حوکمڕانێکی تازەیاندا کە دێت ، حەز بە هێمنیو ئاسوودەگی دەکەن . نموونەش بۆ ئەمە بەروونی لە بۆرگندیاو بریتانیو گاسکۆنیاو نۆرماندیادا دەردەکەویّ کە لە دمێکەوە لەگەلّ فەرەنسادا یەکیانگرتوە . ئەم ولاتانە ئەگەرچی هەندیّ جیاوازی‌یان لەرووی زمانەوە لە نێواندا هەیە ، بەلاّم نەریت‌وخووی خەلّکەکە لە هەموویاندا تا رادەیەکی زۆر وەك یەکەو دەتوانن شان‌بەشانی یەکەوە بڕۆنو زۆر بە رێك‌وپێکیو برایانە پێکەوە بژین . بۆیە هەر کەس کە دەیەویّ دەست بەسەر ئەم جۆرە مەملەکەتانەدا بگریّو مەبەستی لیّ لە دەستیان نەدا ، دەبیّ هەمیشە دوو شتی زۆر بایەخداری لە پێش‌چاو بن : یەکەمیان قەلاچۆکردنی بنەمالّە حوکمڕانەکەی پێشووەو دووەمیشیان گۆڕینێکی بنەرەتی نەخاتە ناو جۆری یاساو باج‌سەندنی مەملەکەتە دراوەپالّەکەوە . بەم شێوەیە هەردوو

ولاّت دەتوانن لە ماوەیەکی زۆر کورتدا یەك‌بگرنو یەك دەوڵەت پێك‌بهێنن.
یەکەمیان قەلاچۆکردنی بنەرەتی نەخاتە ناو جۆری یاساو باج‌سەندنی مەملەکەتە دراوەپاڵەکەوە . بەم شێوەیە هەردوو ولاّت دەتوانن لە ماوەیەکی زۆر کورتدا یەك‌بگرنو یەك دەوڵەت پێك‌بهێنن .
بەلاّم پیاو کە ناوچەیەکی جیاواز لە زمانی خەڵکەکەی‌و لە جۆری یاساو نەریت‌وخوویاندا دەخاتە سەر مەملەکەتەکەی خۆی ، ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی تووشی دێن گەلێ گەورەو سەخت دەبن‌و تەخت‌کرنیان بە نیازی پاراستنی مەملەکەتە تازەکە . خۆشبەختی‌و کۆشش‌و تەقەلایەکی بێ‌وچان‌و بەردەوامی دەوێ . رەنگیشە باشترین رێ‌وشوێن‌و چاکترینیان لە ئاسوودەبەخشیدا ، ئەوە بێ کە حوکمرانە نوێیەکە بارەگای خۆی بگوێزێتەوە بۆ مەملەکەتە تازەکە ، چونکە ئەم بڕیارە مەملەکەتەکەی سەلامەت‌ترو تەمەن‌درێژتر دەکا ، وەك چۆن تورکەکان لە ولاّتی یۆناندا کردیان . ئەوان ئەگەرچی بۆ هێشتنەوەی یۆنان لە ژێر چنگیاندا پەنایان بردە بەر گەلێ رێ‌وشوێنی‌تر . بەلاّم لە راستیدا ئەگەر تورکەکان خۆیان نەچوونایەتە ناو ولاّتی یۆنانەوەو تیایدا نیشتەجێ نەبوونایە ، ئەو کارەیان بۆ ساز نەدەبوو ، لەبەر ئەوەی کە بوونی داگیرکەر خۆی لە ناوچەکەدا یاریدەی دەدا هەست بەهەر ئاژاوەیەك لە ساتی روودانیدا بکاو یەکسەر چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە . لە کاتێکدا ئەگەر لێی دوور بوو . دوای ماوەیەك ئینجا دەبیبسێ کە ئەو وەختە چارەسەرکردنی زەحمەت دەبێ . زیاد لەمە . ئەوسا ناوچە داگیرکراوەکەش نابێتە مەیدانی رمبازێنی حەزو ئارەزووی کاربەدەستانی حوکمرانە داگیرکەرەکەو رەعیەتەکەش لە رێگەی پەیوەندیکردنی راستەوخۆوە بە حوکمرانەکە خۆیەوە ، دەتوانن ئەو دادپەروەری‌یە دەسگیر بخەن کە بە ئاواتی‌یەوە دەبن . ئینجا لەبەر ئەوەی رەعیەت هەمیشە حەز دەکەن ملکەچی‌ی خۆیان بۆ حوکمرانەکەیان دەربخەن ، ئەمە هانیان دەدا بۆ خۆشویستنی ، یا ئەگەر خۆشیشیان نەوێ هەر هیچ نەبێ لێی دەسلەمێنەوە . هەروەها ئەگەر دەوڵەتێکی بێگانە نیازی پەلاماردانی ئەو خاکە داگیرکراوەی هەبێ ، ئەوا بوونی میرەکە تیایدا وای لێدەکا لە هەنگاوبۆنانیدا سڵ بکاتەوە ، چونکە دەزانێ کە دەرپەڕاندنی ئەو میرە لە

بارەگاکەی چەندە زەحمەت و بە ئەرك دەبێ . بەڵام گومانی تێدا نی یە کە باشترین چارەسەر ، دروست کردنی مرۆمۆڵگە لە شوێنێك یا دوو شوێنی ستراتیژیداو هەندێ لە خەڵکی ولاتە داگیرکارەکەی تێدا نیشتەجێ بکرێ . چونکە یا دەبێ ئەم پلانە جێبەجێ بکرێ ، یاخود دەبێ هێزێکی گەورەی سەربازی لە ولاتە داگیرکراوەکەدا بهێڵرێتەوە . ئەم مرۆمۆڵگانە ئەرکێکی کەم دەخەنە ئەستۆی میر . ئەو کە هەندێك لە رەعیەتەکەی خۆی بۆ ئەو شوێنانە دەنێرێ ، لە سەرەتادا هێندەی دەکەوێتە سەر کە مەسرەفێکی زۆر کەمیان بکێشێ و هەر ئەوەندە بێ پێی بژین . بەم کردەوەیەشی خراپەی تەنیا بۆ ئەو کەسانە دەبێ کە زەوی و خانووبەرەیان بۆ نیشتەجێ کردنی خەڵکە تازەکە لێداگیردەکرێ . ئەوانەش ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەڵکی ولاتە داگیرکراوەکە پێکدەهێنن کە دوای لە دەس چوونی زەوی یەکانیان لات و هەژار دەکەون و دەربەدەری ئەم لاوئەولا دەبن و لە توانایاندا نابێ زیان بە میر بگەیەنن . لە کاتێکدا خەڵکەکەی تر کە هیچ خراپەیەکیان لەگەڵدا نەکراوە ، بۆ دڵڕاگرتنی حوکمرانەکەو لە ترسی ئەوەی بە دەردی زەوی لێداگیرکراوەکانیان نەبا ، بە ئاسانی هێمنی و ئاسایشی خۆیان دەپارێزن . بە کورتی ئەم مرۆمۆڵگانە هیچی ئەوتۆ لەسەر میر ناکەون و دانیشتووانیشی لایەنگیرو دڵسۆزی دەبن و کەمتر لەو خەڵکەی ولاتەکە بۆی زەرەربەخش دەبن کە هەژارو دەربەدەر بوون و ئەوانیش وەك وتمان دەسەلاتی زیان گەیاندنیان بە میر نابێ . ئینجا پێویستە لەوەش بەئاگا بین کە ئێمە دەبێ لەگەڵ خەڵکدا یا بە بەزەیی بین یا قەلاچۆیان بکەین ، چونکە ئەوانە لە توانایاندا هەیە تۆڵەی خراپەکاری ی بچووك بکەنەوە ، بەڵام لە ئاستی تۆڵەسەندنەوە لە خراپەکاری ی گەورەو کاریگەردا دەستە وستانن . لەبەر ئەوە ئەگەر ویستمان دەست لە مرۆڤێك بوەشێنین دەبێ هێندە کاریگەر بێ کە بە دوایدا تووشی ترس لە تۆڵەسەندنەوەی نەبین .

وەکی تر هێشتنەوەی هێزی سەربازی لە بری مرۆمۆڵگە مەسرەفێکی دەخاتە ئەستۆی میر کە گشت دەسکەوتی دەوڵەتەکە بەرگەی ناگرێ و لە ئەنجامدا موڵکە تازەکە زیانی پێ دەبەخشێ نەك قازانج . ئەمە جگە لە دڵشکاندنی سەرجەمی خەڵکی ولاتە داگیرکراوەکە کە دەبینن لەشکرێك لە خاکەکەیاندا خۆی داکوتاوە . ئەم جۆرە

هەستکردنەش بە دڵشکاوی هەموو خەڵکەکە دەکا بە دوژمنێکی ئەوتۆ کە دەتوانن زەرەر ببەخشن . چونکە ئەوان ئەگەرچی ژێرکەوتوون ، بەڵام هێشتا لەسەرماڵو موڵكو لە خاکی خۆیاندان . بەم جۆرە هێزی سەربازی بەهەر حاڵێك بێ بیکەڵکە ، لە کاتێکدا مرۆمۆڵگ گەلێ بەکەڵکە . هەروەها فەرمانڕەوای هەر ناوچەیەکی بێگانەی داگیرکراو . وەك باسم کرد ، دەبێ خۆی بکاتە پێشەواو پارێزەری دراوسێی لاوازەکانیو هەوڵیش بدا بەهێزەکانیان لاواز بکاو پاراستنیانی لە شاڵاوی حوکمڕانێکی بێگانەی بەهێزو دەسەڵاتی وەك خۆی لا مەبەست بێ . ئینجا ئەوسا دەبینیێ لە لایەن ئەو دراوسێیانەوە کە بە هۆی زیادەخوازی یا ترسەوە لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن ، هەمیشە داوای دەستێوەردانی کاروباریانی لێدەکرێ . ئەمە کتومت لە ئیتۆلییەکانی ڕوودا کاتێ ڕۆمانەکانیان بۆ وڵاتی یۆنان بانگ کردو ئیتر ئەمانیش سەیریان کرد هەر ناوچەیەو لەسەر خواستی خەڵکەکەی دەچنە ناوییەوە . چونکە ئەوە بنەمایەکی گشتییە کە وەختێ بێگانەیەکی بەهێز دەچێتە ناو میرایەتییەکەوە ، کەسانی لاواز لە دانیشتووانی یەکسەر دەبنە پشتیوانی . هاندەریشیان بۆ ئەمە حەسوودیبردنیانە بەوانەی لەوەبەر کاروباریانیان گرتبووە چنگ . بەم شێوەیە حوکمڕانە تازەکە لە ڕاکێشانی وردە پیاوماقوولانو دەسڕۆیشتووانیدا بە لای خۆیدا ، زەحمەتییەکی ئەوتۆ نابینێ . چونکە بە تەواوی حەزو ئارەزووی خۆیانەوە پشتگیریی ئەو دەوڵەتەی دەکەن کە بنیادی ناوە . بەڵام بەهەرحاڵ دەبێ وریابێو نەیەڵێ بگەنە ڕادەی بەهێزیو دەسەڵاتدارییەکی زۆرو ئیتر لە ڕێگەی هێزەکانی خۆیو پشتگیریکردنی ئەو پیاوماقوولانەوە ، بە ئاسانی دەتوانێ خاوەنهێزەکان لە میرایەتییە نوێیەکەیدا لەناو بەرێو لە هەڵسووڕاندنی کاروباری میراتییەکەیدا خۆی ببێتە تاقە حوکمڕان . ئینجا ئەو میرەی لە فەرمانڕەوایی کردندا ئەم ڕێگەیە ناگرێتەبەر کە باسم کردو لێی لادەدا ، ئەوا هەرچییەکی دەسگیر بووبێ لە دەستی دەداو بگرە لە ماوەی فەرمانڕەواییکردنە کورتەکەشیدا ، تووشی گێچەڵو کۆسپو کەندێکی لەژمارەنەهاتوو دەبێ .

ڕۆمانەکان لە هەموو ئەو ناوچانەدا کە داگیریان دەکردن هەمیشە لەسەر ئەم سیاسەتە دەڕۆیشتن . مرۆمۆڵگیان تێدا دروست دەکردن‌و خەڵکەکەی خۆیانیان لە ناودا نیشتەجێ دەکرد . وردە پیاوماقولانیان لە خشتە دەبردو ماوەی بەهێزبوونیشیان نەدەدان ، یا ئەوانەی بەهێز بوونایە لە دەسەڵاتیان دەخستن . هەروەکوو نەیاندەهێشت هیچ حوکمڕانێکی بێگانەی‌تر جی‌پێی لە وڵاتی ئەوانەدا بکاتەوە . حاڵەتی وڵاتی یۆنان لەم ڕووەوە نموونەیەکی دەگمەنەو من بۆتانی دەخەمەڕوو . ئەوەبوو ڕۆمانەکان بە سەرێك ئاخی‌یەکان‌و ئیتۆلی‌یەکانیان [8] کردە دۆستی خۆیان‌و مەملەکەتی مەکدۆنیایان [9] لەناوبردو ئەنتاکی‌یەکانیان دەرپەڕاند ، بە سەرێکیشی ماوەیان نەدا ئاخی‌و ئیتۆلی‌یە دۆستەکانیان ناوچەکانی خۆیان بەرفراوان بکەن‌و پەل بۆ دوورتر بهاون . هەروەکوو گوێیان نەدایە ئەو تەماعەی کە (فیلیپ) [10] بە نیازی دۆستایەتی بەستن لە گەڵیاندا دەیخستە بەریان ، لەوەختێکدا نەبێ کە سەرکزو لاوازیان کرد . هەروەها ماوەیان بە ئەنتیۆخۆسیش [11] نەدا دەست بەسەر هیچ بەشێکی یۆناندا بگرێ ، ئەگەرچی بەهێزیش بوو .

ئەوەی ڕۆمانەکان لەم حاڵەتانەدا کردیان ، دەبێ گشت ئەو میرە ژیرانەش بەبێ لێ‌لادان بیکەن کە بایەخ نەك تەنیا بە کاروباری حاڵی‌حازریان دەدەن ، بەڵکوو بیریان بۆ ئەو ناکۆکی‌یانەش دەچێ کە چاوەڕوانی ڕوودانیان لە دوارۆژدا دەکرێ ، هەتا خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو خۆلادان لە مەترسیان ئامادەبکەن ، چونکە چاوەڕوانکردنی ڕوودانیان وا لە مرۆڤ دەکا بتوانێ بە ئاسانی چارەسەریان بکا . بەڵام ئەگەر گوێ نەداتێ تا ڕوودەدەن ، چارەسەر کردنەکە بێ‌سوود دەبێ ، لەبەر ئەوەی دەبینێ نەخۆشی‌یەکە ئەو وەختە بنجی داکوتاوە . ئەمە تەواو لەگەڵ نەخۆشی‌ی سنگدا دەگونجێ کە دوکتۆرەکان دەربارەی دەڵێن :- لە سەرەتایدا دەسنیشانکردنی زەحمەتەو چارەسەرکردنی

ئاسانە ، بەڵام ئەگەر ماوەیەکی بە سەردا تێپەڕی‌و خرایە پشت گوێ ، ئەوا دەسنیشانکردنی ئاسان دەبێ‌و چارەسەرکردنی زەحمەت . جا لە کاروباری دەوڵەتیشدا کت‌ومت وەها دەکەوێتەوە . چونکە پێزانینی خراپەکاری پێش ڕوودانی ،

کە ئەمە بۆ مرۆڤی ژیر کارێکی زەحمەت نی یە ، ری ی بۆ خۆش دەکا بە ئاسانی چارەسەری بکا . لە کاتێکدا ئەگەر کەم ئەقڵی بووە هۆی مانەوەو بەردەوام بوونی تا وای لێ بێ هەموو کەس بتوانێ دەسنیشانی بکا ، ئەوا چارەبۆدۆزینەوەی لە تواناداَ نابێ . بۆ نموونە رۆمانەکان بەر لە ماوەیەکی زۆر هەستیان بە روودانی هەر ئاژاوەو سەرپێچی کردنێك دەکردو بەو پێ یە چارەسەریان بۆ دەدۆزی یەوە . پیشەشیان وەها بوو کە نەیەڵن پەرە بسێنێ نەوەکوو ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ . لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان دەیانزانی کە خۆبەدوورگرتن تا سەر لە شەڕ کارێکی بێ هوودەیەو تەنیا دەتوانرێ دوا بخرێ کە دواخستنەکەش بە زۆری سوودی لایەکەی تری تێدا دەبێ . بۆیە بریاریاندا لەگەڵ فیلیپو ئەنتیۆخۆسدا لە یۆناندا بجەنگن ، تا نەیەڵن شەڕەکە بکەوێتە ناو ئیتالیاوە . ئەمە لە کاتێکدا رۆمانەکان ئەو وەختە دەیانتوانی خۆیان لە هەردوو جەنگەکە بەدوور بگرن . بەڵام نەیانکردو گوێشیان نەدایە سوودبینین لە دواخستنیان کە ئەوە لە رۆژگاری ئێستادا بۆتە پەندێكو بەسەر زمانی هەر یەکێك لە پیاوە زۆر ئاقڵەکانمانەوەیەو دەڵێن دەبێ چێژی دواخستن لە دەس نەدەین ، بەڵکوو وایان بە باش زانی کارەکە بدەنە دەست لایەنی چاکەو راستگۆیی هەستونەستی خۆیان ، چونکە رۆژگار هەموو شتێکی لێدەوەشێتەوە ، دەشێ بەوپەری کەمتەرخەمی یەوە یا خێر بدا بە دەستەوە یا شەڕ .

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر فەرەنساو بزانین ئایا ئەویش کاروباری وەها مەیسەر کرد؟ من باسی شارل [١٢] ناکەم ، بەڵکو لە لویس دەدوێم کە کردارەکانی فەرەنسامان بە شێوەیەکی باشتر نیشاندەدەنو دەسگرتنی بەسەر ئیتالیادا ماوەیەکی درێژتری خایاند . لەم پێداچوونەوەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو بۆ هێشتنەوەی دەوڵەتە بێگانەکەی ژێردەستەی لە چنگیدا ، تەواو بە پێچەوانەی قسەکانی منەوە هەڵسوڕاوە . ئەوەبوو ڤینیسیایی یەکان پادشا لویسیان بۆ ئیتالیا بانگ کرد تا لە رێگەی ئەوەوە دەسگیرخستنی نیوەی لۆمباردیا بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن . من لەسەر چوونەکەی و لەسەر ئەو دەورەی هیچ لۆمەی ناکەم ، چونکە ئەوێك کەزۆر ئارەزووی چوونەناو ئیتالیاوەی دەکرد ، تەنانەت بێ ئەوەی هیچ دۆستێکیشی لە وڵاتەکەدا

هەبێ ، وەختێ سەیری‌کرد وا لە ئەنجامی کردەوەو هەڵس‌و کەوتەکانی شارلی پادشاکەی پێش خۆیەوە هەموو دەرگاکانی لە رووودا داخراون ، ناچار بوو دەست بخاتە ناو هەر دەستێکی دۆستایەتی‌خوازەوە کە بۆی درێژ بکرێ . دەشگونجا ، ئەگەر لە کردارەکانی تریدا ئەو هەڵانەی نەکردایە کە کردنی ، نەخشەو پلانەکانی تری بە خێرایی سەرکەوتن بەدی‌بێنن .

پادشا کە لۆمباردیای سەندەوە ، هەرزوو ئەو ناوو ناوبانگەشی وەرگرتەوە کە شارل لە دەستی دابوو . ئینجا بە دوایدا جەنەوا چووە ژێر رکێفی‌یەوەو فلۆرەنسایی‌یەکان[13] بوونە دۆستی‌و مارکیزی مانتواو[14] دۆقەکانی فیراراو[15] بەنتیڤۆگلی‌و[16] خانمی فۆرلی‌و[17] گەورە پیاوانی فاینزاو[18] پیزارۆو[19] ریمینی‌و کامێرینیۆو بیومبینۆو خەڵکی لۆکاو پیزاو[20] سی‌یەنا[21] هەموو کەوتنە هەڵپەی دڵ‌راگرتن‌و دۆستایەتی‌بەستن لە گەڵیدا . گومانیشی تیدا نی‌یە ڤینیسیایی‌یەکان دەرکیان بە ئەنجامی سەرکێشی کردنی خۆیان کردو زانی‌یان چۆن تەقەلادانیان بۆ دەسگیرخستنی چەند شارێکی لۆمباردیا ، بووە هۆی دەسگرتنی پادشا بەسەر دوو لە سێ بەشی ئیتالیادا .

هەروەها پادشا زەحمەتێکی ئەوتۆی لە پاراستنی ناوو ناوبانگ‌و مەملەکەتەکانیدا لە ئیتالیادا تووش نەدەهات ، ئەگەر پەیرەوی ئەو ئامۆژگاریانەی بکردایە کە لەوەبەر باسم کردن‌و بە پەرۆشەوەو بە باوەرێکی پتەوەوە ، باڵی بەسەر ئەو هەموو دۆستانەیدا بکێشایە کە بە ژمارە زۆرو بە شان‌و شکۆ پەتیارە بوون‌و هەمیشە لە ژێر باری ترسیشدا بوون ، یا لە کلێسە یاخود لە ڤینیسیا کە ئەمە وای لێدەکردن لە دەوری ئەو گردبنەوەو ئەم گردبوونەوەیەش لە دەوری لە رووی ئەو کەسانەدا کە هیشتا خاوەن شان‌وشکۆو هێز بوون دڵنیایی بۆ دە رەخساند . بەڵام ئەو لە باتی ئەوەی وەها کردار بکا ، هات هەر هێندەی پێ‌ی نایە ناو میلانەوە ، بە یاریدەی پاپا ئەلکساندەر[22] بۆ داگیرکردنی رۆمانا پێچەوانە جووڵایەوەو بە هۆی ناهوشیاریەوە ، دەرکی پێ نەکرد کە ئەو بەم کردەوەیەی دەس‌بەرداری ئەو دۆستانەی دەبێ کە پەنایان بردبووە بەری‌و داوایان لێ‌کردبوو بیانپارێزێ‌و لە ئەنجامیشدا خۆی بێ هێز دەکاو تین‌وتوانا بە کلێسە

دەبەخشێ . لەبەر ئەوەی کەدەسەلاتێکی (دنیایی)ی دەخستە پاڵ دەسەلاتە (ئاینی)یەکەی کە ئەمە هێزێکی هێجگار گەورەو گرانی دەدایە . ئیتر کە ئەم یەکەمین هەڵەیەی لیوەشایەوە ، ناچاربوو بە دوایدا گەلێ هەڵەی تریش بکا چونکە هەوڵدانی بۆ بەرگرتن لە تەماعکاری‌ی ئەلکساندەرو رێ‌پێ‌نەدانی بیێتەوە حوکمرانی تۆسکانیا ، ناچاری کرد بگەڕێتەوە بۆ ئیتالیا . بگرە ئەو بە پەرەپیێدانی هێزی کلێسەو‌بە لەدەسدانی دۆستەکانیشی‌یەوە نەوەستا ، بەڵکو پەلی تەماعی بۆ مەملەکەتی ناپۆلیش هاویشت‌و لەگەڵ پادشای ئسپانیادا لە نێوان خۆیاندا بەشیان کرد . بەم جۆرە دوای ئەوەی تاکە سەروەری ئیتالیا بوو ، هات یەکێکی لەگەڵ خۆیدا کردە هابەش کە دەشیا هەر زیادە خوازێك لەوانەی لە حوکمرانی‌یەکەی لالووت بوون ، بۆ داواکردنی هەقی خۆی پەنای بەرێتە بەر . هەروەها لە جیاتی ئەوەی ئەو پادشایە لەسەر تەختی حوکمرانی لە مەملەکەتەکەدا بهێڵێتەوە کەسەر بە خۆی بوو ، کەچی ئەوی لاداو یەکێکی وەها لە جێ دانا کە دەیتوانی لە ولاتەکە دەری‌پەڕێنێ .

حەزکردن بە موڵکداری غەریزەیەکی سروشتی‌و کارێکی ئاسایی‌یە . جا وەختێك دەسەلاتداران لەم حەزەدا سەرکەوتن بەدەس دێنن ، هەمیشە ستایش دەکرێن‌و قەت تانووتیان لێ نادرێ . بەلام ئەگەر تووشی ژێرکەوتن هاتن‌و سەرەرای ژێرکەوتنەکەش هەر تەقەلایان‌دا بەهەر نرخێك بێ حەزەکەبەدی بێنن ئەوا گوناهێکی ئەوتۆ دەکەن کە دەهێنێ لە عۆیەیدا توندوتیژترین لۆمەیان ئاراستە بکرێ . لەبەر ئەوە ، ئەگەر فەرەنسا لە توانایدا هەبووایە بەتەنیا هێزی خۆی ناپۆلی داگیر بکا ، دەبوو بیکا . بەلام کە نەیدەتوانی ، ئەوا کارێکی هەڵە بوو لەگەڵ ئسپانیادا بەهاوبەشی بیکا . ئێمە ئەگەرچی دەتوانین هۆ بۆ بەشکردنی لۆمباردیا لەگەڵ ڤینیسیایی‌یەکاندا بدۆزینەوە ، لەبەر ئەوەی بەشکردنەکە بووە بەهانەیەك بۆ پادشای فەرەنسا تا لەو رێگەیەوە پێ بنێتە ناو ئیتالیاوە ، بەلام هیچ هۆیەکمان بۆ ئەم بەشکردنە نوێ‌یە بۆ نادۆزرێتەوە کە جێگەی لۆمەکردنە ، چونکە هیچ پێویستی‌یەك نەی سەپاندو بە کارێکی بەجێ‌ی نەدایە قەڵەم .

کەوابوو لویس ئەم پێنج هەڵەیەی کرد : دەوڵەتە بچووکەکانی پلیشاندەوە ، هێزو دەسەڵاتی یەك تاکە حوکمرانی لە ئیتالیادا بەرفراوانکرد ، بێگانەی هینایە ناو وڵاتەکەوە . هەوڵی نەدا لە وڵاتەکەدا نیشتەجێ بێ ، هەروەك هیچ مرۆمۆڵگەو خەڵکێکی خۆیشی تێدا دانەنا . بەڵام لەگەڵ ئەم هەڵانەشدا هێشتا هەر دەیتوانی ، ئەگەر بژیایەو هەڵەی شەشەمی لێنەوەشایەتەوە کە داگیرکردنی دەوڵەتی ڤینیسیاییەکان بوو . خۆی لە زەرەرو زیانیان بپارێزێ ، بەڵێ . ئەو ئەگەر کڵێسەی بەهێز نەکردایەو ئیسپانیاییەکانی نەهێنایەتە ناو ئیتالیاوە ، ئەم هەنگاوەی بۆ سەر پێشێلکردنی ڤینیسیاییەکانو زەلیلکردنیان کارێکی پێویستو رەوا دەبوو . بەڵام دوای کردەوەکانی پێشووی ، دەبوو بە هیچ کلۆجێ بڕیار لەسەر تێکشاندنی ڤینیسیانەدا . چونکە ئەگەر ڤینیسیاییەکان لەسەر هێزدارییەکەیان بمانایەتەوە ، نەیاندەهێشت کەسانی تر بەهیچ جۆرێ خۆیان لە قەرەی لۆمباردیا بدەن . یەکەم لەبەر ئەوەی رازی نەدەبوون هیچ هەنگاوێك بنرێ کە مسۆگەرکردنی ناوچەکەی بۆ خۆیان تێدا نەبێ ، دووەم چونکە کەسانی تریش ئارەزووی ئەوەیان نەدەکرد ناوچەکە لە چنگ فەرەنسا رزگار بکەنو بیدەن بە ڤینیسیا ، هەردوولاشیان پێکەوە نەدەکرد .

خۆ ئەگەر مرۆڤێك هەبێو سووربێ لەسەر ئەوەی بڵێ گوایە پادشا لویس دەستی لە رۆمانا بۆ ئەلکساندەرو لەناپۆلی بۆ ئیسپانیا بەردا تا خۆی لە شەر بەدوور بگرێ ، من لە وەرامیدا ئەو هۆیانە دووپات دەکەمەوە کە لەوەبەر باسم کردنو دەڵێم : پیاو دەبێ بۆ خۆبەدوورگرتن لە شەر ، ماوەی روودانی ئاشووبو سەرپێچیکردن نەدا ، چونکە ماوەپێدانی لە شەر بەدووری ناگرێ ، بەڵکوو شەرەکە بۆ سوودو بەرژەوەندی دوژمنەکانی دوا دەخا . هەروەها ئەگەر کەسانێکی تر هەبن بڵێن گوایە پادشا بەڵێنی ئەو پرۆژەیەی بۆیە بە پاپادا ، تا بۆی ببێتە پاداشتێك بەرامبەر بە رزگارکردنی لە پەیوەندیی ژنو مێردایەتییەکەیو[23] بەرامبەر بە بەخشینی پلەی کاردینالێتی بە رۆهان . من بەو قسانەم وەرامیان دەدەمەوە کە لە دواییدا لە باسی بەڵێنەکانی میرو چۆنێتی کارپێکردنیاندا دەیانکەم . بەم جۆرە پادشا لویس لەبەر ئەوەی هیچ یەکێك لەو مەرجانەی رەچاو نەکرد کە میرەکانی تر لە کاتی داگیرکردنی ناوچەیەکداو بۆ

هێنتنەوەی لە ژێر دەستیاندا دەیانکرد . لۆمبارْدیای لە دەس خۆیدا . ئەمەش وەنەبێ موجیزەیەك بووبێ‌و رووی دابێ . بەڵکوو کارێکی ئاسایی‌و لە جێی خۆیدا بوو . ئینجا دوایی کە ڤالنتینۆی کوڕی پاپا ئەلکساندەر کە بە قەیسەری بۆرجیا[٢٤] ناو دەبرێ . رۆمانای داگیرکرد . من لەگەڵ کاردینال رۆهاندا لە شاری نانت لەم باسە دووام . کاردینال پێ‌یوتم کە ئیتالیایی‌یەکان هیچ لە کاروباری سیاسەت تێ‌ناگەن . ئەگەر تێ‌بگەیشتنایە قەت ماوەیان بە کڵێسە نەدەدا بگاتە ئەم رادەی مەزنی‌یەی . چونکە تاقیکردنەوە نیشانیداوین کە مەزنی‌ی کڵێسەو بەهێزی‌ی ئیسپانیا لە ئیتالیادا ، دروستکراوی دەستی فەرەنسا بوون‌و ئەنجامە کەشی بە ماڵوێرانی‌ی فەرەنسا خۆی شکاوەتەوە . لەمەوە بنەمایەکی گشتی‌ی ئەوتۆمان دەسگیر دەبێ کە بە دەگمەن هەڵەی تێدەکەوێ . بنەماکە دەڵێ :

ئەو کەسەی هەوڵی بەهێزکردنی خەڵکی دەدا ، حوکمی ماڵوێرانی‌و خاپووبوون بەسەر خۆیدا دەدا ، چونکە ئەو هێزە لە یەکێك لە دوو رێگەوە پەیدا دەبێ ، یا تەڵەکەبازی یاخود هێزی سەربازی کە هەردووکیان لای ئەو کەسەی دەگاتە پلەی بەهێزی‌و دەسەلأتداری ، جێگەی گومانلێکردن دەبن .

# ٤

# ئەوهۆیانەی نەیانهێشت مەملەکەتەکەی دارا دوای مردنی ئەسکەندەر کە داگیری کرد دژی میراتگرەکانی شۆڕش بکا

ئەگەر بە چاوی بایەخ پێدانەوە بڕوانینە ئەو زەحمەتی یەی دەوڵەتێك لە پاراستنی دەسەلاتیدا بەسەر دەوڵەتێکی تردا کە تازە داگیری دەکا تووشی دێ ، پیاو لە ئاستی ئەسکەندەری گەورەدا [٢٥] سەری سوڕ دمێنێ کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا بووە سەروەری هەموو ئاسیاو هەر هێندەشی گشت ئەم ناوچە بەرفراوانەی داگیرکرد ، کۆچی دوایی کردو ئەم مردنەشی وای دەخستە زەینەوە کە گوایە هەموو ئەو ناوچانە هەرخێرا ، بە ڕووی حوکمڕانە نوێیەکانیاندا دەتەقنەوە . کەچی میراتگرەکانی دەسەلاتی خۆیانیان بە سەریاندا پاراست و هیچ زەحمەتی یەکی ئەوتۆیان تووش نەهات ، تەنیا ئەوە نەبێ کە بە هۆی تەماعکاری ی خودی خۆیانەوە لە بەینیاندا ڕووی دا .

بۆ وەرامدانەوەی ئەم سەرسوڕمانەش دەڵێم : مێژوو دوو جۆرە مەملەکەتی بە خۆیەوە دیوە کە بە دوو شێوەی جیاواز فەرمانڕوایی دەکرێن . یا میرێك و مووچەخۆرانی حوکمی دەکەن کە ئەم مووچەخۆرانە بە فەرمایشت و پیاوەتی میرەکە خۆی دادەمەزرێنرێن و لە هەڵسوڕاندنی کاروباری مەملەکەتەکەدا یاریدەی دەدەن .

یاخود میرێك‌و چەند سەر دارێك (بارۆن) حوكمی دەكەن كە لە سایەی نەژادرەسەنی‌یانەوە . نەك بە فەرمایشتی میر . دەبنە خاوەنی ئەو پایەوپلەیەی هەیانە .

جا هەر یەكێ لەو بارۆنانە خاوەنی ناوچەیەكی تایبەتی خۆی دەبێ كە حوكمی دەكاو خەڵكێكیشی لە ژێر سایەدا دەبن كە بەسەروەری خۆیانی دەزانن‌و لە ئەنجامدا پابەندیان دەبن . میر لەودەوڵەتانەدا كە خۆی‌و مووچەخۆرەكانی حوكمی دەكەن ، دەسەلاتێكی گەورەو فراوانتری لە چنگدا دەبێ ، چونكە لە دەوڵەتەكەدا لەو بەولاوە كەسێكی‌تر خاوەنی پلەوپایەی بەرز نابێ . خۆ ئەگەر تاعەتكردنی كەسانێكی‌تری تیادا سەپێنرابێ ، تەنیا لەبەر ئەوەیە كە وەزیرو مووچەخۆری ئەون نەك لەبەر شەخسی خۆیان . بگرە خەڵكەكە هیچ سۆزێكیان بەرامبەر ئەوان لە دڵدا نابێ .

رەنگە نموونەی هەردوو ئەم جۆرە حكومەتە لە سەردەمی ئێستاماندا ، حكومەتی توركەكان و مەملەكەتی فەرەنسا بێ . سەڵتەنەتی توركیا ئێستا یەك حوكمڕان حوكمی دەكاو ئیتر ئەوەكانی‌تر هەموو خزمەتكەرو مووچەخۆری ئەون . مەملەكەتەكەش كراوە بە چەند سنجقێك‌و حوكمڕانەكە مووچەخۆری جۆر بەجۆری كارگێڕیان بۆ دەنێرێ كە هەر وەختێ ئارەزووی لێ بێ دەستیان لە كار دەكێشێتەوەو هەر كاتێ ویستی دەیانگۆڕێ . بەلام پادشای فەرەنسا بە ژمارەیەكی زۆری سەرداران دەوری تەنراوە كە رەعیەتەكانیان بە سەرەوەری خۆیانیان دەزانن‌و خۆشیاندەوێن ، هەروەكوو خاوەنی ماف‌و دەستە بەرەیەكی ئەوتۆی خۆیانن كە پادشا لە وزەیدا نی‌یە لێیانی بێبەری بكاو ئەگەر كردیشی ، خۆی تووشی مەترسی دەكا . ئینجا ئەگەر لە وەزعی ئەم دوو دەوڵەتە بكۆڵینەوە . بۆمان دەردەكەوێ كە داگیركردنی مەملەكەتی توركەكان زۆر زەحمەتە . هەرچەندە ئەگەر دەوڵەتێك بۆی لوا داگیری بكا ، ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ لە ژێر دەستی خۆیدا بیهێڵێتەوە . یا رەنگە داگیركردنی مەملەكەتی فەرەنسا لە زۆر لایەنەوە ئاسان بێ . بەلام هێشتنەوەی لە ژێر چنگدا كارێكی سەخت‌و زەحمەت دەبێ .

هۆی زەحمەتی‌ی داگیركردنی مەملەكەتی توركیا لەوەدایە كە داگیركەر ناتوانێ بۆ جێبەجێكردنی ئەم جۆرە كارە پەنا بەرێتە بەر میرەكانی مەملەكەتەكە . هەروەكو بۆی

ئالوێ بە هیوای ئەوە بێ کاری هات‌و نەهاتەکەی لە ڕێگەی شۆڕشێکەوە بۆ ببرێتە سەر کە کەسانێکی نزیك لە شەخسی حوکمڕانەکەوە بەرپای بکەن . ئەوەش هەر لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشتر لەم بەشەدا لێ‌یاندوام . چونکە ئەوانە کە هەموو کۆیلەن‌و بە شەخسی حوکمڕانەکەوە بەندن ، زەحمەتە بە بەرتیل‌پێدان لە خشتە ببرێن ، بگرە ئەگەر کراش لەوە دەستەوستان‌تر دەبن بتوانن گەلەکەیان بەشداری شۆڕشەکەیان بکەن‌و هویەکانیشیم لەوەبەر باسکردن . بۆیە ئەو کەسەی پەلاماری سوڵتانی تورکیا دەدا . لەبەر ئەوەی ڕووبەڕووی لەشکرێکی یەکگرتوو دەوەستێتەوە ، دەبێ پشت بە هێزی خۆی ببەستێ نەك بە ئاشووب‌و ئاژاوە لە ریزی دوژمندا . بەڵام ئەگەر توانی بە سەریدا زاڵ بێ‌و لە مەیدانی جەنگدا شکاندنێکی ئەوتۆ بیشکێنێ کەئیتر تواناى سەرلەنوێ لەشکرکردنەوەی نەمێنێ ، ئەوسا هیچی ئەوتۆ لە بەردەم داگیرکەردا نامێنێ لێ‌ی بترسێ . تەنیا ئەندامانی بنەماڵەی میرە تورکەکە نەبێ کە ئەگەر هات‌و قەلاچۆی کردن‌و ڕەچەڵەکی بڕینەوە ، ئیتر ببڕای ببڕ هیچ شتێك نامێنێ ترسی لێ پەیدا بکا . چونکە ئەوانیتر لە لای گەل خاوەنی هیچ جێ‌وڕێ‌یەك نین . بگرە لەبەر ئەوەی داگیرکەرەکە تەنانەت پێش سەرکەوتنیشی هیچ هیوایەکی پێ‌یان نەبووە ، بۆی هەیە دوای سەرکەوتنی هەر ترسیشی لێ‌یان نەبێ .

کەچی حاڵ لەگەڵ ئەو مەملەکەتانەدا کە لە بابەتی فەرەنسان بە پێچەوانەوە دەکەوێتەوە . لێرەدا داگیرکەر دەتوانێ لە ڕێگەی لەخشتەبردنی یەکێك لە بارۆنەکانی ناو مەملەکەتەکەوە بە ئاسانی داگیری بکا ، بەتایبەتی کە هەردەم ژمارەیەك لە نارازی‌و ڕق هەڵگرتووان‌و ئاڵ‌وگۆڕخوازان هەر لە کایەدا دەبن . ئەمانە لەبەر ئەو هۆیانەی ڕوونم کردنەوە ، دەتوانن ڕێگات لەبەردەمدا بۆ خۆش بکەن‌و گەیشتنت بە سەرکەوتن ئاسان بکەن . بەڵام ئەگەر دوایی ویستت ئەوەی بۆتە موڵکت لە ژێر دەستی خۆتیدا بهێڵیتەوە ، کەندو کوسپێکی لە ژمارەنەهاتووتت دێنەڕێ‌و هەر ئەو کەسانەش دەیانخەنە سەر ڕێگات کە لەوەبەر یاریدەیان داویت ، یا تۆ ئازارت پێگەیاندوون . ئەوانە وەنەبێ تەنیا لە ئەندامە ئازاردراوەکانی بنەماڵەی میرەکە بن . بەڵکوو لەو سەردارنەش دەبن کە بەردەوام ئامادەن بۆ سەرکردایەتی کردنی هەر شۆڕشێکی نوێ .

ئیتر تۆش کە نەدەتوانیت رازی‌یان بکەیت‌و نە لە بنەڕەتەوە لە ناویان بەریت ، هەر هێندەی ئەوان هەڵێکی لەباریان بۆ هاتە کایەوە دەوڵەتەکەت لە دەس دەچێ .

ئیستا ئەگەر لە چۆنێتی حکوومەتەکەی دارا [٢٦] بکۆڵیتەوە ، دەبینیت کە لە بابەتی رژێمی حوکمی ئیستای تورکەکان بووە . بۆیە ئەسکەندەر ناچار بوو یەکەمجار پەلاماری ولاتەکە بداو تەنانەت پێش بەدی هێنانی سەرکەوتنیش حکوومەتەکەی لە ناوبەرێ . ئینجا کە دارا مرد ، دەوڵەتە داگیرکراوەکە ئەنجامی ئەو هۆیانەی لەوەبەر باسم کردن ، بەبێ ئاژاوە لە ژێر چنگی ئەسکەندەردا مایەوە . یا ئەگەر میراتگرەکانی ناکۆکی‌یان نەکەوتایەتە بەینەوە ، دەیانتوانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە هێمنی‌و ئاشتی‌یەوە حوکمی ولاتەکە بکەن ، چونکە ئەو شەڕو ئاژاوەیەی تیایدا بەرپابوو دەسکردی خۆیان بوو . بەلاّم زۆر زەحمەتە بتوانرێ هەر بەم شێوەیە دەست بەسەر ولاتێکی وەك فەرەنسادا بگیرێ . بۆیە بووە هۆی بەرپابوونی زنجیرەیەك شۆڕش لە فەرەنساو ئیسپانیاو یۆناندا دژی رۆمانەکان ، لەبەر ئەوەی لەم ولاتانەدا چەندین میرایەتی هەبوون کە مانەوەی یادگارو بیرەوەری‌یەکانیان ئەو داگیرکاری‌یەی رۆمەکانی شلۆق دەکردو دەیخستە بەر مەترسی‌ی هەرەس هێنانەوە . بەلاّم وەختێ رۆمانەکان توانی‌یان ئەو یادگارو بیرەوەری‌یانە بن‌بڕ بکەن‌و بە تەواوی بیانسڕنەوە ، لە سایەی تەمەن‌درێژی‌ی ئیمپراتۆریتی‌یەکەیانەوە ، بوونە سەروەرێکی ئەوتۆ کە کەسێك نەتوانێ شان لە شانیان بدا . بگرە کە ناکۆکی لە نێوان رۆمانەکان خۆشیاندا رووی دەدا ، هەریەکەیان دەیتوانی پشت بە لایەنگیری‌کردنی ئەو بەشەی میرایەتی‌یەکە ببەستێ کە دەسەلاّتی خۆی تێدا چەسپاندبوو ، چونکە دوای قەلاچۆکردنی بنەماڵەکانی پادشاکانی لەوەبەرە رۆمانەکان بوونە تاقە حوکمرانێك کە دانیان پێدا بنرێ . ئینجا ئەگەر بە باشی لەم کاروبارانە ورد ببینەوە ، بەبێ سەرسوڕمان بۆمان دەردەکەوێ کە چۆن ئەسکەندەر بە ئاسانی توانی ئاسیا لە ژێر دەستی خۆیدا بهێڵێتەوەو بۆچی ئەوانی‌تری وەك پیرۆس‌ی‌و [٢٧] کەسانی‌تر لە پاراستنی دەسەلاّتی خۆیاندا بەسەر ولاّتە داگیرکراوەکاندا تووشی زەحمەتی بوون . ئەم جیاوازیەش لەوەوە نەهاتبوو . کە داگیرکارەکە لێهاتوو بووە یا لێهاتوو نەبووە . بەڵکوو ئەنجامی جیاوازی‌ی وەزعی ولاّتە داگیرکراوەکان خۆیان بووە .

٥

# فەرمانڕەوایی کردنی ئەو شارو مەملەکەتانەی کە لەپێش داگیرکردنیاندا لەژێر سایەی یاسای تایبەتی خۆیاندا ژیاون .

ئەگەر ئەو دەوڵەتەی ڎاگیردەکرێ ، لە ژێر سایەی یاسای تایبەتی خۆیدا بە سەربەستی ڕاهاتبێ ، ئەوا سێ ڕێگە بۆ هێشتنەوەی لە ژێر چنگدا هەن . یەکەمیان ڕووتکردنەوەیەتی لە هەمووشتێك . دووەمیان نیشتەجێبوونی میرە داگیرکارەکەیە تیایدا . سێهەمیشیان وازهێنانە لە خەڵکەکەی کە لە ژێر سایەی یاسای تایبەتی خۆیاندا بژینو تەنیا باجیان لێبسێنرێو حکومەتێکی وەهایشی تیادا دابنرێ کە پشت بە کەمایەتییەکی سەر بە میر ببەستێ . ئەم جۆرە حکوومەتەی میر خۆی دروستی دەکا ، دەزانێ مانەوەی بەندی ڕاگرتنی دۆستایەتیی میرو خۆخستنە بن باڵێتی . بۆیە ئەوپەڕی هەوڵدەدا ئەو دوو شتە لە دەست نەدا . هەروەها ئەو شارەی بە سەربەستی ڕاهاتبێ ، بۆ کوڕوکاڵانو هاووڵاتیانی خۆی نەبێ ، بە ئاسانی مل نادو ڕێگای ڕاستیش بۆ هێشتنەوەی لە ژێر چنگدا هەر ئەمەیە .

با لەم ڕووەوە ئەوە بکەین بە نموونە کە لە سپارتاییەکانورۆمانییەکانی ڕوودا . سپارتا (٢٨) لە ڕێگەی دروستکردنی دوو حکوومەتەوە لە کەمایەتییەکان دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەسیناو (٢٩) تیبەدا (٣٠) پاراست ، کەچی لە ئەنجامدا دەسەڵاتەکەی لە

دەس چوو . بەلاّم رۆمانەکان بۆ پاراستنی دەسەلاّتی خۆیان بەسەر کاپواو[٣١] کرتاجەو[٣٢] نۆمانتیادا ، ئەم شارانەیان ویّرانو خاپوور کردو دەسەلاّتەکەیان لە دەس نەچوو . کەچی وەختیّ ویستیان بە هەمان شیّوەی سپارتاییەکان ، دەسەلاّتیان بە سەر یۆناندا بپاریّزنو وازیان لە شارەکانی هیّنا بە سەربەستی لە ژیّر سایەی یاساکانی خۆیاندا بژین ، سەرنەکەوتن . لەبەر ئەوە ناچاربوون بۆ ئیدامەپیّدانی دەسەلاّتیان بە سەریاندا ، هەندیّك لە شارەکانی ئەو ولاّتە کاول بکەن . چونکە لەم حالّەتەدا هیچ ریّگایەکی مسۆگەر بۆ هیّشتنەوەی ئەو دەسەلاّتە لەبەردەمدا نی یە ، تەنیا رووتکردنەوەی ولاّتەکە نەبیّ لە هەموو شتیّكو هەر کەسیّکیش دەست بەسەر شاریّکی سەربەستدا بگریّو خاپووری نەکا ، خۆی دوایی لەسەر دەستی ئەو شارەدا تووشی خاپوور بوون دەبیّ ، لەبەر ئەوەی هەردەم بە ناوی سەربەستییەوەو بە ناوی نەریتە کۆنەکانیانەوە کە چەند رۆژگاریان بە سەردا تیّپەریّ . لە بیر ناچنەوەو سوودو بەرژەوەندی نویّ نابنە مایەی پشتگویّخستنیان و هۆی هاندان بۆ یاخیبوون هەر دەبیننەوە . واتە هەر حوکمرانیّکی نویّ ، چەندە بکاو بکۆشیّ . تا خەلّکەکە تەفروتوونا نەکاو پەرتو بلاّویان نەکاتەوە ، ناتوانیّ ناوی شارەکەیانو نەریتەکانیان لە بیر بەریّتەوە ، بەلّکوو ئەو نەریتانەیان هەمیشە لە یاد دەمیّنیّو هەر هیّندەی دەرفەتیّك هەلّبکەویّ دەیانهیّننەوە کایەوە ، وەك چۆن شاری پیزا دوای سالاّنیّکی دوورودریّژی داگیرکردنی لە لایەن فلۆرنساییەکانەوە کردی . بەلاّم ئەگەر ئەو شارو ناوچانە لە ژیّر سایەی حوکمرانیّك یا میریّکدا بە ژیانی سەرشۆری راهاتبووبنو داگیرکارەکە بنەمالّەی میرەکەی پیّشووی لە ناوبردبیّ ، ئەوا خەلّکەکەیان کە فیّری تاعەتکردننو میرەکەی لەوەبەریان لە دەس چووە ، لە هەلّبژاردنی میریّکی نویّدا لە ناو خۆیانداو بۆ خۆیان دەستەوستان دەبن . جگە لەوەی کە ناشزانن چۆن لە ژیّر ئالاّی سەربەستیدا بژین . لەبەر ئەوە لە یاخیبووندا تەمبەلّ دەبنو میرە داگیرکارەکە زۆر بە ئاسانی دەتوانیّ بە لای خۆیدا رایانبکیّشیّو جیّ پیّی خۆی لە ناوچەکەیاندا قایم بکا . وەکیتر رژیّمی جەمهووری گەلیّ گورجو گولّو زۆر رقاوی دەبیّو بە توندی مەیلی تۆلّەسەندنەوە دەکاو خەلّکەکەیشی ناتوانن بیرەوەریی سەربەستییە پیرۆزەکەی لەوەبەری خۆیان لە یاد بکەن . لەبەر ئەوە مسۆگەرترین ریّگا بۆ دابینکردنی ، یا تەواو خاپوورکردنیّتی ، یاخود نیشتەجیّبوون تیایدا .

٦

# ئەو مەملەكەتانەی تازە بە هێزی چەكی تایبەتی و بە لێهاتنەوە داگیركراون

پێویستە كەس لەوە سەرسام نەبێ كە من سەبارەت بە پەیوەندی مەملەكەتە تازەكان بە میرو دەوڵەتەوە، ئیشارەتم بە چەند نموونەیەكی گەلێ مەزن‌دا ، چونكە خەڵكی هەمیشە ئەو رێگایە دەگرنەبەر كە لەوەبەر كەسانی‌تر پیا یدا رۆیشتوون‌و لە كرادریشیاندا لاسایی كەسانی پێش خۆیان دەكەنەوە . ئینجا لەبەر ئەوەی هیچ مرۆڤێك ناتوانێ بە تەواوی شوێن‌پێ‌ی ئەوانی پێش خۆی هەڵبگرێ‌و بە جوانی‌و رێك‌وپێكی لاسایی‌یان بكاتەوە ، دەبێ ئەم مرۆڤە كەم‌توانایە هەردەم ئەو رێگایە بگرێتەبەر كە گەورەپیاوان پێشتر هەنگاویان بە سەردا ناوەو تەنیا لاسایی هەرە سەركەوتووەكانیشیان بكاتەوە . سا ئەگەر لە وزەیدا نەبوو بگاتە رادەی مەزنی‌یەكەی ئەوان . ئەوا هەر هیچ نەبێ دەتوانێ هەندێ لە رەنگ‌و رووی ئەوان بگرێ‌و بەم كردارەشی لەو تیرهاوێژە وردبینە دەچێ كە كاتێ دەیەوێ نیشانێكی مەودا دوورتر لە

ڕادەی ئاسایی بپێکێ‌و بەمەودا دووریەکە ئاشنایە ، نیشان زۆر بەرزتر لەو شوێنە دەگرێتەوە کە مەبەستێتی . نەك لەبەر ئەوەی حەز دەکا تیرەکەی بگاتە ئەو بەرزاییە ، بەڵکوو بەو هیوایەی بۆ پێکانی نیشانەکە یاریدەی بدا . بەم پێیە من دەڵێم : ئاسانی‌و زەحمەتی‌ی دەسگرتن بەسەر مەملەکەتێکی تازەدا کە دەکەوێتە ژێر دەستی میرێکی نوێوە . بەندی بەهێزی‌و لاوازی‌ی تواناو دەسەڵاتی میرەکەیە . جا کە بەرزبوونەوەی هەر کەسێکی ئاسایی بۆ پلەیمیرایەتی ، وای لێ چاوەڕوان دەکرێ ، یاگەلێ لێهاتوو بێ یاخود خۆشبەخت بێ . ناچار وەها دێتە پێش چاو کە هەر یەکێ لەم دوو سیفەتە لە هەندێ لەو گیروگرفتە زۆرانەدا کە ڕوودەدەن ببێتە هۆی سووك‌کردنی باری شانی . لەگەڵ ئەمەشدا ئەوانەی زۆر پشتیان بە خۆشبەختی نەبەستوە ، زیاتر لە کەسانی‌تر توانای خۆیان لە پاراستنی مەملەکەتەکانیاندا سەلماندوە . ڕەنگیشە نیشتەجێ‌بوونی میر خۆی لە مەملەکەتە تازەکەیدا ، لەبەر نەبوونی کەسێکی وەها کە جێگەی بگرێتەوە ، گیروگرفتەکانی ئاسان کردبێ . بەڵام ئەگەر بچمە سەر باسی ئەو زاتانەی بە **بەهرەوەریو بە لێهاتوویی خۆیان نەك بە پشتبەستن بە خۆشبەختی بوونەتە میر ،** بەش بە حاڵی خۆم مووساو[٣٣] کۆرش‌و[٣٤] ڕۆمۆلۆس‌و[٣٥] سیزیۆس‌و[٣٦] کەسانی وەك ئەوان بە مەزنترینیان دادەنێم . جا هەرچەندە دەبێ خۆمان لە باسکردنی مووسا بەدوور بگرین ، چونکە ئەو تەنیا جێ‌بەجێ‌کارێکی فەرمانی خودا بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە پیرۆزی‌ی ئەو پایەیەی‌کردیانە شیاوی قسەکردن لەگەڵ خودادا ، دەبێ جێگەی ڕێزلێنان‌و مەدح‌و ستایش‌کردن بێ . بەڵام کۆرش‌و هاوتاکانی کە چەندین مەملەکەتیان دامەزراندو ئەوانیش جێگەی ڕێزلێنان‌و ستایش‌کردنن ، ئەگەر لە کردارە تایبەتی‌یەکان‌و ڕێ‌وشوێنەکانیان بکۆڵینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ کە لەوەکانی مووسا زۆر جیاواز نین ، ئەگەرچی ئەم پشتی بە سەروەرێکی مەزن بەستبوو کە خودایە . بەڵێ ، ئەگەر لە ژیانو لە کارە بەناوبانگەکانیان وردبینەوە ، دەبینین هەموو قەرزاری ئەو فرسەتانەن کە بارودۆخێکی ئەوتۆی بۆ دەرەخساندن ، کام شێوە بەچاك دەزانن وەهایان هەڵسووڕێنن .

چونکە ئەگەر ئەو فرسەتانەیان بۆ هەڵنەکەوتایە ، بەهرەوەری‌یەکەیان بە فیرۆ دەچوو ، هەروەکوو ئەگەر بەهرەوەر نەبوونایە فرسەتەکان بەبێ لە چنگ‌گرتن‌و سوود

لیٚبینین تیٚدەپەڕین .

بەم شێوەیە مووسا دەبوو ببینیٚ کە چۆن گەلی ئیسرائیل لە میسردا بوونەتە کۆیلەو میسری‌یەکان دەیانچەوسێننەوە ، تا ئارەزووی رزگاربوونیان لە کۆیلەیەتی لا پەیدا بیٚو بۆ ئەم مەبەستە دوای بکەون . هەروەها پێویست بوو رۆمۆلۆس نەتوانیٚ لە (ئەلپا)دا بمێنێتەوەو لە کاتی لە دایك‌بوونیدا چوار دیوارێك نەیگرتبێتە خۆی ، تا بتوانیٚ ببێتە پادشای رۆماو[3] بنیادنەری میللەتێك تیایدا . یا پێویست بوو کۆرش سەرنج بداتە فارسەکان‌و ببینیٚ کە چەندە لە ئیمپراتۆریێتی‌ی میدی‌یەکان[3] داخ‌لەدڵن‌و ئەمانیش ببینیٚ چۆن بەسەربردنی ژیان بە ئاشتی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خاووخلیچکی کردوون . یا سیزیۆس بۆی نەدەکرا تواناو لیٚهاتوویی خۆی بخاتە روو ، ئەگەر خەڵکی ئەسینای بە پەرت‌و بڵاوی‌و دژبەیەکتر نەدیایە . بەم جۆرە فرسەتەکان بۆ ئەوانە بوون بە مایەی بەخت‌و ئینجا لە سایەی بەهرەوەری‌ی باڵای خۆیانەوە ، توانی‌یان سوودیان لیٚبینن‌و لە ئەنجامیاندا سەربەرزی‌یان بە وڵاتەکانیان پیٚبەخشن‌و تالعیانی نەش‌ونما پیٚبکەن‌و پتر سەریانی پیٚ بەرز بکەنەوە .

ئەو بابەتە کەسانەی لە ریٚگەی بەهرەو توانای قاڵبووی خۆیانەوە دەگەنە پلەی میرایەتی ، بە زەحمەتێکی زۆر مەملەکەتەکانیان دەسگیر دەبیٚ ، بەڵام لە هەمان کاتدا بە ئاسانی دەتوانن جڵەوگیری‌یان بکەن . هەندیٚ لەو زەحمەتی‌یەشی لە پلەی دامەزراندندا تووشی دەبن ، ئەنجامی ئەو یاساو سیستمە نویٚیانەیە کە دەبیٚ بۆ جیٚ‌پیٚ قایم‌کردنی خۆیان‌و چەسپاندنی بیانهێننە کایەوە . ئیمە دەبیٚ لەوە بەئاگابین کە زەحمەت‌ترین شت لە جیٚ‌بەجی‌کردنداو زۆرترینی لە تووش‌هاتنی ژێرکەوتنداو سەخت‌ترینی لە دەس بۆبردنیدا ، دامەزراندنی رژێمێکی نویٚیە بۆ هەڵسووراندنی کاروبار . چاکەخواز هەمیشە دوژمنی لە ریزی کەسانێکەوە بۆ پەیدا دەبن کە سوودیان لە رژێمە کۆنەکە بینیبیٚ . هەروەکوو دۆستی بوودەڵە لەوانەدا دەبینێتەوە کە رژێمە نویٚیەکە قازانجیان پیٚدەگەیەنیٚ . ئەم بوودەڵەیی‌یەشیان تا رادەیەك لە ئەنجامی هەست‌کردنیاندا دەبیٚ بە ترس‌و سام لەو دوژمنانەیان کە یاسا پارێزگاری‌یان لیٚدەکا ، یا تارادەیەك لە ئەنجامی ئەو سیفەتی

گومانکردنەدا دەبێ لە هەرشتێکی نوێ کە لە نەژادی ئادەمیزاددا هەیە ، چونکە مرۆڤ باوەڕ بە شتی نوێ ناکا تا بە شێوەیەکی زانسنییانەی راستو دروست تاقیینەکاتەوە . کەوابێ وەزعەکە بەم جۆرە دێتە پێشچاو ێ ـ کە چاکەخوازێکی نوێ پەیدا دەبێ ، دوژمنەکانی بە حوماسەتی هاوولاتییەکەوە هێرشی دەبەنە سەر ، بەلام دۆستەکانی بە ساردوسڕیو بێوەرەیییەوە پارێزگاریی لێدەکەنو ئیتر ئەو لەم بەینەدا دەکەوێتە بەر مەترسییەکی گەورەوە . ئینجا ئەگەر ویستمان بە وردی لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوە ، پێویستە سەرنج بدەینو بزانین ئایا نوێخوازەکان سەربەخۆن یاخود پشتیان بە خەلکیتر بەستوە . ئەمەش وا دەگەیەنێ کە ئایا ئەوانە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکانیان ، بە ناچاری هاواریان بردۆتە بەر خەلکیتر ، یاخود لە باریاندا هەبووە بە زەبری هێز ئیرادەی خۆیان بسەپێنن . چاکەخوازان لە حالەتی یەکەمدا سەرکەوتن بەدیناهێننو هیچیان دەسگیر نابێ . بەلام ئەگەر پشتیان بە هێزو دەسەلاتی خۆیان بەستو توانییان بەکاری بهێنن ، بە دەگمەن رووذەدا ژێر بکەون . بەم جۆرە ڕۆژگار سەلماندوێتی کە پێغەمبەرە چەکدارەکان توانیویانە ولاتان داگیر بکەنو سەر بکەون ، بەلام پێغەمبەرە بێچەکەکان بە پێچەوانەوە . سەرباری ئەوەی وتمان دەبێ بزانین گەلان تەبیعەتیان جیاجیایە . رەنگە قایل کردنیان بەم مەسەلە یا بەویان ئاسان بێ ، بەلام راگیرکردنیان لەسەر ئەو قایلبوونە زۆر زەحمەتە . بو یە سەپاندنی مەسەلەکە بە سەریاندا دەبێتە ناچاریو تەنانەت ئەگەر هەولیاندا لە قایلبوونەکەیان پاشگەز ببنەوە ، دەبێ بە زۆر بخرێنەوە ژێر باری . ئەگەر مووساو کۆرشو سیزیۆسو رۆمۆلۆس چەکدار نەبوونایە ، نەیاندەتوانی بۆ ئەو ماوە دوورودرێژە ، خەلکی ناچاری رێزلێنانی یاساکانیان بکەن . وەکیتر لە سەردەمی ئێستاماندا دیمان کە جیرۆلامۆ ساڤۆنارۆلا (٢٨) وەختێ گەلەگەی کەوتنە لێهەلگەڕانەوەی ، لە یاسا تازەکانیدا ژێرکەوت ، چونکە ڕێو شوێنیکی وەهای بە دەستەوە نەبوو ئەو کەسانەی لە پالێ خۆیدا پێ بهێلێتەوە کە بە خێرایی باوەڕیان پێهێنا ، یا لێهەلگەڕاوەکانی بۆ باوەڕ پێهێنانەوەی پێ ناچار بکا . بەم پێیە ئەو بابەتە کەسانە زەحمەتییەکی زۆریان دێتەڕێ ، لەبەر ئەوەی ڕووبەڕووی زۆر مەترسی دەبنەوەو دەبێ لە ڕێگەی

بەهرەداریو بەتواناییو لێهاتوویی خۆیانەوە بە سەریاندا زاڵ بن. ئینجا ئەگەر ئەو زاڵبوونەیان بەسەر کۆسپو تەگەرەکاندا بۆ رەخساو دوای لەناوبردنی هەموو دوژمنەکانیان ، خەڵکی کەوتنە رێزلێنانو دەس بەسنگەوە بۆگرتنیان ، ئەوسا ئیتر هەردەم خاوەنی هێزو دەسەڵات دەبنو دەستی جەزرەبەلێدان نایانگاتیو بەختیارو سەربەرز دەژین .

هەر وەها دەمەوێ نموونەیەکی کەمێ پایە نزمتر بخەمە پاڵ ئەو نموونە پایەبڵندانە ، چونکە بۆ بەراوردکردن لە گەڵیاندا دەگونجێو دەشێ وەك نموونەیەك بۆ گشت حاڵەتەکان بەکار بهێنرێ ، ئەویش باسی هێیرۆی سیراکۆزەیی یە کە لە ریزی جەماوەری گەڵەوە بەرز بووەوەو گەیشتە پلەی میرایەتی ی سیراکۆزەو[40] بەخت یاریدەی دا ئەو هەلەی پێ ببەخشێ کە سیراکۆزەیی یە چەوساوەکان بیکەنە پێشەوای خۆیان ، دەنا ئیتر ئەو بە لێهاتوویی خۆی بە پلەی میرایەتی گەیشت ، تەنانەت داوێن پاکیو چاکەخوازی یەکەی لە ژیانی تایبەتی ی خۆیدا ، وای کرد کە هەندە کەسێك دەربارەی وتبێتیان : کابرا بۆ حوکمرانی کردن لە هیچی کەم نی یە تەنیا بوونی مەملەکەتێك نەبێ کە حوکمی بکا . هێیرۆ یەکێك بوو لەوانەی سوپا کۆنە ئیختیاری یەکەی تێكو پێك داو سوپایەکی تری دامەزراندو دۆستایەتی یە کۆنەکانی وازلێ هێنانو دۆستایەتی ی تازەی لە جێ بەستنو بەم جۆرە لە سایەی سوپاکەیو ئەو دۆستانەوە کە خۆی هەڵیبژاردن ، توانی لەسەر بناغەیەکی ساغڵەم مەملەکەتێك دابمەزرێنێو ئیدامەی پێبداو لەم ئیدامەپێدانەشیدا ، تووشی ئەو ئەركو زەحمەتی یە نەبێ کە لە دامەزراندنیدا تووشی بوو بوو .

## ٧

# ئەو مەملەکەتانەی کە بە یارمەتی ئەم وئەو یابە یارمەتی بەخت داگیرکراون

رنگە ئەوانەی لە ریزی گەلەوە سەرهەڵدەدەن‌و لە رێگەی خۆشبەختی‌یەوە بەرز دەبنەوەو دەگەنە پلەی میرایەتی ، لەم‌بەرزبوونەوەیەدا تووشی زەحمەتی‌یەکی زۆر نەیەن . بەڵام لە پاراستنی پایەوپلەکەدا زەحمەتی‌یەکی گەورەیان بە کوڵکەوە دەبێ . ئەوانە لە کاتی سەرکەوتنندا رووبەرووی کۆسپ‌و تەگەرەیەکی ئەوتۆ نابنەوە ، چونکە بە سەریاندا بازد دەدەن . بەڵام کە جێ‌پێ‌یان قایم بوو ، ئیتر هەر خێرا سەریەشەیان بۆ پەیدا دەبێ . ئەم حاڵەتە ئەوانەش دەگرێتەوە کە دەوڵەت بە سەروەت‌و سامان دەکرن ، یا لە رێگەی پێ‌بەخشینەوە لە لایەن ئەم‌وئەوەوە دەسگیریان دەبێ ، وەك چۆن لە یۆنان‌و شارەکانی ئەیۆن‌و[41] هەلیسپۆنتدا[42] روویداو ئەوەبوو دارا بۆ پارێزگاری لێکردنی ناوچەکان بە ناوی ئەوەوەو بۆ پاراستنی سەربەرزی‌و سەلامەتی‌ی خۆی ، چەند میرێکی تیادا خولقاندن . هەروەکوو ئەو ئیمپراتۆرانەش دەگرێتەوە کە لە رێگەی بەرتیل پێدانی سوپاوە ، لە ریزی گەلەوە سەریان هەڵداوەو بەرز بوونەتەوە .

ئەم جۆرە میرە بە تەواوی پشت بە نیازپاکی‌ی ئەو کەسانە دەبەستێ کە شانوشکۆی بەرز دەکەنەوەو ئینجا بە خۆشبەختی‌ی خۆی کە ئەم دوو شتە بەردەوام‌بوون‌و ئۆقرەگرتنیان بۆ نی‌یە . ئەم جۆرە کەسانە نازانن چۆن پارێزگاری لە پایەوپلەی خۆیان بکەن‌و لە ،وەزعێکیشدا نابن بتوانن نەخشەیەك بۆ پارێزگاری لێکردنەکە دابنێن‌و جێ بەجێ‌ی بکەن . ئەو مرۆڤەی هەموو ژیانی خۆی وەك کەسێکی ئاسایی بەسەردەبا ، ئەگەر بلیمەتێکی گەورە نەبێ ، ناتوانێ شارەزای چۆنێتی فەرمانڕەوایی‌کردن بێ ، جگە لەوەی کە لە وەزشیدا نابێ وەزعی خۆی رابگرێ ، چونکە نابێتە خاوەنی هێزێکی بەتەنگەوەهاتووی دڵسۆز . بۆیە ئەو دەوڵەتانەی بەخێرایی بنیاد دەنرێن ، وەك هەموو ئەو کاروبارانەی بە سەرەتایەکی خێراو گەشەسەندنێکی بە پەلە دەس پێدەکەن ، لە باریاندا نابێ رەگ‌وریشەیەکی قووڵ بۆ خۆیان دابکوتن‌و بە فراوانی پەل‌وپۆ بهاون . لەبەر ئەوە هەر هێندەی رەشەبایەك هەڵیکرد ، ئیتر دەکەونە بەر مەترسی‌ی هەرەس‌هێنانەوە ، مەگەر ئەو کەسەی لەم رێگایەوە دەبێتە میر وەك وتم بلیمەتێکی مەزن بێ کە ئەمە یاریدەی دەدا بە خێرایی‌و لە ساتی خۆیدا ، بە فریای پاراستنی ئەو پارووە بکەوێ کە بەخت هاویشتبوویە کۆشی‌یەوەو ئینجا لا لە دارشتنی ئەو بنچینانە بکاتەوە کە کەسانی تر پێش گەیشتن بە پلەی میرایەتی ، ئاسایی بیری لێدەکەنەوە .

من لێرەدا لە ناو ئەو رووداوانەدا کە لە یادمن ، دوو نموونە بۆ هەردوو رێگای گەیشتن بە پلەی میرایەتی ، واتە لێهاتوویی‌و خۆشبەختی دەهێنمەوە . ئەو دووانەش فرانسیسکۆ سفۆرزاو قەیسەر بۆرجیان . فرانسیسکۆ بە رێگای ئاشتیداو بە هۆی لێهاتوویی‌و مەزنی‌ی خۆیەوە توانی لە پلەی هاووڵاتی‌یەکی ئاسایی‌یەوە بگاتە پلەی میرایەتی‌ی میلانۆ دوای تەخت‌کردنی هەزارەها کۆسپ‌و تەگەرە ، ئینجا بۆی کرا بە ئاسانی دەسکەوتەکەی خۆی بپارێزێ . بەڵام لەولای ترەوە قەیسەر بۆرجیا کە بە دۆق فالنتین ناسرابوو ، لە رێگەی دەست‌رۆیشتوویی باوکی‌یەوە توانی دەوڵەتێك دەسگیربخا ، کەچی هەر هێندەی ئەو دەست‌رۆیشتوویی‌یە نەما ، ئەمیش دەوڵەتەکەی لە دەس چوو ، ئەگەرچی هەر چی‌یەك پێویست بوو کە پیاوێکی

بەتوانای وردبین بۆ جێ‌پێ‌قایم‌کردنی خۆی لە دەوڵەتێکدا کە بە لەشکرو دۆستایەتی ی کەسانی تر دامەزرابێ بیکا ، کردی . من لەوەبەر وتم : ئەوەی پێشەکی بنچینە بۆ خۆی دانەنێ ، رەنگە بۆی بلوێ بە هۆی بەهرەو توانای لە رادەبەدەری خۆیەوە لە دواییدا دابینێ ، هەرچەندە ئەمە سەریەشەی بۆ ئەندازیارەکەو مەترسی ی بۆ بیناکەش تێدایە . ئینجا ئەگەر پیاو بێت و لە کردارەکانی دۆق و رێبازەکەی وردبێتەوە ، دەبینێ کە ئەو بنچینانەی بۆ قایم‌کردنی دەسەلاتە داهاتووەکەی خۆی دانابوون ، زۆر کۆلك‌و پتەو بوونەو باوەڕیشم وایە کە باسکردنیان بێ‌هوودە نی‌یە ، چونکە من وای دەبینم کە کارو کرداری هیچ تازەمیرێك لەوەکانی ئەو باشتر نابێ . بەلام بەدی‌نەهێنانی سەرکەوتن تیایاندا هەرگیز بە هۆی هەڵەی خۆیەوە نەبوو ، بەڵکوو لە ئەنجامی ئەوپەڕی بەدبەختی‌و خراپ‌بۆهاتنەوە بوو .

هەروەها پاپا ئەلیکساندەری شەشەم بۆ گەورەو گران‌کردنی شان‌وشکۆی کورە دۆقی خۆی ، ناچار بوو روو بەرووی گەلێ زەحمەتی ، لە پاشەڕۆژیدا ببێتەوە . باوکە سەیری کرد هیچ رێگایەك بۆ گەیاندنی کورەکەی بەپلەی حوکمرانی‌کردن لە کایەدا نی‌یە تەنیا ئەوە نەبێ کە میرایەتی بخاتە ژێر چنگی کڵێسەوە . ئەمە لەکاتێکدا کە دەشیزانی دۆقی میلان‌و ڤینیسیایی‌یەکان ماوە نادەن هەوڵدانی ئەم بۆ زەوت‌کردنی چەند شارێکی پاپایەتی سەر بگرێ ، چونکە ڤینیسیا پارێزگاری‌لێکردنی فایینزاو ریمینی ی گرتبووە ئەستۆی خۆی . هەوەها پاپا سەیری کرد هێزە سوپایی‌یەکانی ناو ئیتالیا ، بەتایبەتی ئەوانەی دەگونجا ئامانجەکانی ئەم بەدی‌بێنن ، لە ژێر دەسەلاتی ئەو کەسانەدان کە لەفراوان‌بوونی هێزی پاپا دەترسن . لەبەر ئەوە نەدەکرا پشتیان پێ‌ببەستێ ، چونکە سەراپایان لە ژێر سەرکردایەتی بنەماڵەی ئۆرسینی‌و کۆلۆنادا[٤٣] بوون . بۆیە وەزعەکە وای پێویست دەکرد ئاشووبێکی وەها بخرێتەوە کە ئەو بارودۆخە سەرانسەر هەڵگێڕێتەوەو کەمێکیش ئاژاوە لە ناو دەوڵەتەکانی ناو ئیتالیادا بنێتەوە ، تا ئەو بتوانێ هەندێکیان بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە . ئەویشی ویستی ئاسان بوو ، ڤینیسیایی‌یەکانی بۆ رەخسا کە چەند هۆیەکی تر وای لێکردبوون فەرەنسایی‌یەکان بۆ ئیتالیا بانگ بکەن‌و ئیتر پاپاش لە لای خۆیەوە ، نەك هەر دژی

بانگ‌کردنەکە نەوەستا ، بەڵکوو بەرزگارکردنی پادشا لویس لە پەیوەندی‌ی ژن‌و مێردایەتی‌یەکەی رێگایشی بۆ خۆش کرد . بەم شێوەیە پادشای فەرەنسا بە یاریدەی ڤینیسیایی‌یەکان‌و بریار لەسەردانی ئەلیکساندەر هاتە ئیتالیاوە . ئیتر هەر هێندەی ئەو پێ‌ی نایە ناو میلانەوە ، پاپا بووە خاوەنی ئەو هێزە سوپایی‌یەی کە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی پرۆژەکەی خۆی لە رۆمانادا پێویستی پێ‌ی هەبوو ، ئەمەش کارێك بوو کە بەپێ‌ ناوو ناوبانگەکەی پادشای فەرەنسا ، بۆی نەدەلوا بەدی‌ی بێنێ . ئینجا کە دۆق (٤٤) بوە خاوەنی رۆماناو بەسەر کۆڵۆناشدا سەرکەوت ، دوو شت رێگەی پێگرت . یەکەمیان گومان‌کردنی لە دڵسۆزی‌ی هێزەکانی خۆی . دووەمیان گومان کردنی لە نیازو مەبەستی فەرەنسا . واتە دۆق لە لایەکەوە دەترسا هێزەکانی ئۆرسینی کە پشتی پێ‌ بەستبوون لێ‌ی هەڵگەرێنەوەو تەنیا بەوەشەوە نەوەستن کە نەیەڵن مەملەکەتەکەی لەوە زیاتر بەرفراوان بکا ، بەڵکوو هەرچی‌یەکیشی کردبوو لێ‌ی زەوت بکەن . لەولای ترەوە دەترسا کە پادشای فەرەنساش هەمان هەڵوێستی هەبێ . ئینجا ئەوەبوو سەبارەت بە ئۆرسینی گومانەکەی لا بووە یەقین ، چونکە هەرهێندەی فاینبزای داگیرکردو کەوتە پەلاماردانی پۆڵۆنا ، سەرنجی‌دا هێزەکانی ئۆرسینی لە هێرش‌بردندا دوودڵن . سەبارەت بە پادشاش هەروەها کەوتەوەو سەیری کرد نایەڵێ پرۆژەی هێرش‌بردنەکەی بۆ سەر تۆسکانیا جێ‌بەجێ بکا ، بەتایبەتی دوای ئەوەی دۆقی‌یەتی ئۆربینۆی هێنابووە ژێر بار . ئەوسا دۆق بریاری‌دا ئیتر پشت بە لەشکری کەسانی‌ترو خۆشبەختی‌یان نەبەستێ . یەکەم کارێکیش کە کردی ، لاوازکردنی حیزبی ئۆرسینی‌و کۆڵۆنا بوو لە رۆمادا ، بە راکێشانی لایەنگرەکانیان بە لای خۆیدا کە زۆربەیان لە پیاوماقوولان بوون ، ئەویش لە رێگەی بەخشش‌و دیاری‌پێدانێکی زۆرو دامەزراندنیانەوە بە سەرکردەو کارگێری وەها کە لەگەڵ پایەوپلەیاندا بگونجێ . بەوە لە ماوەی چەند مانگێکدا توانی پەیوەندی‌ی دڵسۆزی‌یان بۆ حیزبە کۆنەکانیان بپچرێنێ‌و وایان لێ بکا بایەخ تەنیا بەو بدەن . بە دوایدا توانی بنەماڵەی کۆڵۆنا لەناوبەرێ‌و کەوتە چاوەروانکردنی هەلێکی لەبار بۆ لەناوبردنی سەرکردەکانی ئۆرسینیش . ئیتر کە هەڵکەوت کۆی لێ‌نەکردەوەو لە دەس خۆی نەدا ، ئەویش بەوەی کە وەختێ

ئۆرسینی‌یەکان سەیریان کرد مەزنی‌ی دۆق‌و بەهێزی‌ی کڵێسە مانای ماڵوێرانی‌ی ئەوان دەگەیەنێ ، هەڵسان ئەنجومەنێکی راوێژکارانیان لە ئۆربینۆ لە ناوچەی بیرۆجینۆدا بەست‌و شۆرشیان لە ئۆربینۆدا بەرپاکردو ناوچەی رۆمانا ئاژاوەی تێکەوت‌و دۆق کەوتە بەر مەترسی‌یەکی بێ‌سنوورەوە ، بەلام ئەم بە یاریدەی فەرەنسایی‌یەکان بەسەر هەمووان‌دا زاڵ‌بوو . ئینجا کە بە تەواوی جڵەوی کەوتەوە دەست ، بریاری‌دا باوەر نەبە فەرەنسایی‌یەکان‌و نەبە هیچ هێزێکی بێگانەی‌تر نەکا ، تا پشت بە سوێندخواری لە گەڵیاندا نەبەستێ ، بەڵکوو پەنا بەرێتە بەر فروفێڵ . بۆیە دۆق زۆر هوشیارانە راستی‌ی ئامانجەکانی خۆی خەشارداو تەنانەت ئۆرسینی‌یەکان خێرا کەوتنە هەوڵدانی ئاشت‌بوونەوە لە گەڵیداو سینیۆر پاولۆیان بۆ ئەم مەبەستە کردە نوێنەری خۆیان کە دۆق لە رێگەی زمان‌شیرینی‌و دیاری‌پێ‌بەخشینی‌یەوە لە جل‌و بەرگی رازاوەو پارەو ئەسپ . توانی ترس‌و گومانی لە دڵ دەربکاو لە ئەنجامدا ئۆرسینی‌یەکان ، ساکارانە قایل بوون بگەرێنەوە بۆ سینیگاگلیاو[٤٥] دەستیدا بوونە نیچیرێکی دەستەمۆ . ئینجا دۆق کە دوای لەناوبردنی ئەو سەرکردانەو راکێشانی لایەنگرەکانیان بۆ رێزی دۆستانی خۆی‌و هەروەها دەسگرتنی بەسەر هەموو ناوچەکانی رۆماناو میرایەتی‌ی ئۆربینۆداو دوای مسۆگەرکردنی خۆشەویستی‌و دڵسۆزی‌ی خەڵکەکەش ، بەتایبەتی کە هەستیان کرد حوکمرانی‌یەکەی سوودیان پێ‌دەبەخشێ . ئیتر کەوتە دانانی بناغەیەکی ساغڵەم بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی .

جا لەبەر ئەوەی ئەم لایەنە . دەهێنێ لە لایەن کەسانی‌ترەوە سەرنجی بدرێتی‌و لاسایی بکرێتەوە . وا من لە باسکردنی غافل نابم . ئەوەبوو وەختێ رۆمانای داگیرکرد . ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەلاتی چەند حوکمرانێکی لاوازی ئەوتۆدا بوو کە تەنیا بە تەنگ رووتاندنەوەی خەڵکەکەوە بوون نەک فەرمانرەوایی‌یان بکەن . یا هۆی دووبەرەکی‌یان لە نێواندا بخولقێنن نەک یەکیان پێ‌بگرن . بەم جۆرە ناوچەکە کەوتبووە ژێر چەپۆکی راوورووت‌کردن‌و کاری چەتەگەری‌و پەلاماردان‌و هەموو شێوەکانی ئاژاوەو ئاشووبەوە . لەبەر ئەوە بریاری‌دا خێرخوای ئەوتۆ لە ناوچەکەدا دابمەزرێنێ کە خەڵکەکە بخاتە ژێر باڵی هێمنی‌و تاعەتکردن‌و ملدان بۆ حوکمرانی کردنی ئەو . بۆ ئەم

مەبەستەش ریمیرۆ دی ئۆرکۆی کردە نوێنەری خۆی کە بە دڵرەقو لێهاتوو ناسرابوو ، ئەوپەڕی دەسەڵاتیشی دایە ، جا ئەم کابرایە لە ماوەیەکی کورتدا توانی سەرکەوتنێکی گەورە لە چەسپاندنی ئاسایش لە ناوچەکەداو لە یەکێیگرتنیدا وەدەس بێنێ کە ئەمە وای لە دۆق کرد دادگایەکی (مدنی)ی بۆ دادپەروەری لە مەڵبەندی ناوچەکەدا دامەزراندو حاکمێکی بە توانای کردە سەرۆکیو بڕیاریدا هەر شارەو پارێزەرێکی تێدا بۆ خۆی دابنێ . ئینجا لەبەر ئەوەشی کە دەیزانی توندوتیژیو ستەمکاری یەکەی لەوبەر دەبێ هەستی رقو کینەی لە بیروهۆشی جەماوەری گەلدا خوڵقاندبێ ، بۆ سڕینەوەی بەسەرهاتەکان لە مێشکیانداو بە مەبەستی راکێشانیان بە تەواوی بە لای خۆیدا ، بڕیاریدا وەهایان بۆ دەربخا کە هەرچی کارێکی نەگریسانە لە رابوردووەدا کراوە ، هیچی بە فەرمانی ئەم نەبووە ، بەڵکوو دروستکراوی دەستی وەزیرەکەی بووەو هەرهێندەشی هەلی بۆ هەڵکەوت ، فەرمانیدا جەستەی بکەن بە دوو کەرتەوەو لە مەیدانی گشتی ی شاری سیزایینادا هەڵیواسنو لەوحێکی تەختەو خەنجەرێکی خوێناویش لە تەنیشتی یەوە دابنێن . درندەیەتی ی ئەم کردەوەیە هەستێکی تێکەڵ لە رەزامەندیو سەرسوڕمانی لای گەل وروژاند . بەڵام با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان .

ئینجا ئیتر دۆق کە هەستی بە دەسەڵاتداری ی خۆی کردو کەوتە پێکەوەنانی سوپایەکی تایبەتیو ئەو هێزانەی دەوروپشتی خۆی تێکشکاندن کە لە وزەیاندا هەبوو جەزرەبەی لێبدەنو دواجار خەمی ئەو مەترسی یانەی نەما کە لە کایەدا بوون ، سەیری کرد ئەگەر بیەوێ لەسەر داگیرکاری بەردەوام بێ ، دەبێ کارێکی وەها بکا کە لە لایەن فەرنساوە رێزی لێبنرێ ، چونکە دەرکی کرد کە پادشای فەرەنسا دوای هەستکردنی بەو هەڵەیەی خۆی کە کردبووی ، ئیتر هیچ یاریدەیەکی نادا . بەم جۆرە بە سەرێکێ کەوتە گەڕان بە دوای هاوپەیمانی نوێداو بە سەرێکیش تەقەلادانی خۆنزیککردنەوە لە فەرەنسایی یەکان بە بۆنەی ئەو هێرشەوەی پادشاکەیان بۆ پەلاماردانی مەملەکەتی ناپۆلی ، بە نیازی یاریدەدانیان دژی ئیسپانیایی یەکان کە شاری جا یتیایان ئابلۆوقە دابوو ئامادەی کردبوو . مەبەستیشی دڵنیابوون بوو لێیان کە ئەگەر

بهاتایەو ئەلیکساندەری باوکی لە ژیاندا بمایە ، دەیتوانی ئەم ئاواتە بەدی بێنێ .

ئەمە ئەو کارو کردارانە بوون کە دۆق بۆ روو بەروو بوونەوەیان وەختی خۆی کردنی . بەڵام سەبارەت بە دوارۆژی ، لەوە دەسڵەمی یەوە کە سەرۆکی نوێ ی نیمچە دەوڵەتەکانی کڵێسە یەکێك لە دۆستەکانی خۆی نەبێ و تەقەلا بدا ئەو ناوچانەی لێ بسێنێتەوە کە ئەلیکساندەر پێ ی بەخشی بوون .

بۆ لەروودا وەستانی ئەم ترسە بڕیاری دا چوار رێگا بگرێتە بەر : یەکەمیان لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانەی سەر بەو بنەماڵە حوکمڕانانە بوون کە مەملەکەتەکانیانی لێ زەوت کردبوون ، تا ماوە نەدا پاپا تازە فرسەتی پشت پێ بەستنیانی چنگ بکەوێ . رێگای دووەم مسۆگەرکردنی دۆستایەتی ی سەردارانی رۆما بوو تا بە هۆی ئەوانەوە بەری سەرکێشی کردن لە پاپا بگرێ . رێگای سێ یەم بریتی بوو لە بەکارهێنانی ئەوپەری تین و توانای بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا . بەڵام چوارەمیان بریتی بوو لە سازدانی گەورەترین هێز کە لە تواناداىی لە پێش مردنی پاپای باوکی دا پێکی بێنێ ، تا بتوانێ بە تەنیا خۆی لە رووی یەکەمین هێرشدا کە دەکرێتە سەری خۆی رابگرێ . جا ئەوەبوو وەختێ ئەلیکساندەر مرد ئەو لە چوار ئامانجەکە سیانیانی بەدی هێنابوون و چوارەمیشیان بە رێوە بوو بەدی بهێنرێ . واتە توانی بووی ژمارەیەکی زۆر لە میرە لە میرایەتی خراوەکان بکوژێ یا فرسەتی گرتنیانی بۆ هەڵکەوتبوو کە لە ژمارەیەکی کەم بەولاوە کەسیان رزگاریان نەبوو بوو . هەوەکو توانی بووی سەردارانی رۆما بداتە پاڵ خۆی و دەسەڵاتی تەواوی خۆیشی بەسەر کۆمەڵگادا بچەسپێنێ . لە کاتێکدا بۆ مەملەکەتەکان کارێکی وەهای کردبوو کە ببێتە سەرووەری گشت تۆسکانیاو پیرۆجیاو[٤٦] بیۆمبینۆ بکاتە موڵکی خۆی و باڵیش بەسەر پیزادا بکێشێ . ئینجا کە دڵنیا بوو ئیتر هیچ شتێك لە کایەدا نەماوە ترسی لە فەرەنسایی یەکان پێ پەیدا بکا ، چونکە ئیسپانیایی یەکان بە شێوەیەکی ئەوتۆ لە ناپۆلی دەریانپەڕاندبوون کە ناچار بن ئەوانیش هەوڵ بدەن دۆستایەتی ی ئەم مسۆگەر بکەن و دڵی رابگرن ، بە تەواوی دەستی بەسەر پیزادا گرت و بە دوایدا هەرخێرا لۆکاو سی یەناش ، بە هۆی رق و کینەیانەوە بەرامبەر بە ڤینیسیایی یەکان لە لایەکەوەو لەبەر ترس و سامیان لەم لە لایەکی ترەوە ، سەریان بۆ

شۆڕ کرد ، جگە لەوەی کە ڤینیسیایی‌یەکان خۆشیان لەو وەختەدا داهاتو بەروبوومیان لە کزیدا بوو . جا ئەگەر هەر لەو ساڵەدا کە ئەلیکساندەری تێدا مرد ، لە مەملەکەتە تازەکانیشدا بە چەشنی کۆنەکانی سەرکەوتنی بەدی بهێنایە ، ئەوا بەبێ هیچ پشت‌بەستنێك بە دەسەڵاتو بە خۆشبەختی‌ی کەسانی‌ترو تەنیا لە سایەی هێزو بازووی خۆیەوە ، هێندەی تواناو دەسەڵاتو ناوبانگ دەردەکرد کە بۆ ئیدامەپێدانی ئەو سەروەری‌یەی بەس بن . بەڵام ئەلیکساندەر مردو مردنەکەشی لەوەختێکدا بوو کە تەنیا پێنج ساڵ بەسەر ئەو رۆژەدا تێپەڕی‌بوو کە قەیسەر بۆرجیا یەکەمجار شمشێری تیدا بەلادا کردبوو . ئەوسا دۆق سەیری کرد کە ئەگەرچی رۆمانا بە تەواوەتی ملی بۆ داوە ، بەڵام نەخشەکانی تری لە هەوادا لە نێوان دوو دوژمنە لەشکری بەهێزدا ، بە هەڵواسراوی ماونەتەوەو خۆیشی بە دەست چەند نەخۆشی‌یەکی کوشندەوە دەناڵێنێ . بەڵام ئازایەتی‌و بەتوانایی‌یەکەی دۆق لەرادەبەدەر بوون‌و لە پەیدا کردنی دۆست‌و لە فەوتاندنی دوژمنیشدا دەستێکی باڵای هەبوو . هەروەکوو لە دانانی نەخشەو ڕێ‌وشوێن‌و لە چەسپاندنیاندا لە ماوەیەکی کورتدا ، زۆر شارەزا بوو . لەبەر ئەوە ئەگەر دوو لەشکرە دوژمنەکە دەوریان نەتەنیایەو خۆیشی لە رووی تەندروستی‌یەوە وەزعی باش بووایە ، دەیتوانی بەسەر هەر کۆسپ‌و تەگەرەیەکدا زاڵ بێ . جا ئێمە ئەگەر ئەو راستی‌یەمان لە پێش‌چاو گرت کە دەڵێ :

لە کاتێکد کە ئەو لە رۆمادا لە سەرەمەرگدا بوو ، رۆمانا بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك بە هێمنی لە چاوەڕوانکردنیدا مایەوە ، یا وەختێك باگلیۆنی‌و(٤٧) ڤیتیللی‌و ئۆرسینی بە هێزەکانیانەوە چوونە ناو رۆماوەو کەسێکیان نەدی پشتگیری‌ی ئەمان بکاو دژ بەو بیزوێ ، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو بنچینانەی دایمەزراندبوون چەندە کۆك‌و پتەو بوون . تەنانەت ئەو دەیتوانی نەهێڵێ هیچ کەسێك بۆ پاپایەتی هەڵبژێردرێ کە خۆی نەیەوێ ، ئەمە ئەگەر لە کاتی مردنی ئەلیکساندەردا سیحەتی باش بووایە ، هەرچی‌یەکی حەز پێ‌بکردایە بۆی بەدی دەهات‌و بەرگەی هەموو چورتمێکیشی دەگرت . دۆق لەو رۆژەدا کە یۆلیۆسی دووەمی تێدا هەڵبژێردرا بە پاپا ، بۆی باسکردم کە ئەو بیری لە هەموو ئەو شتانە کردبۆوە کە رەنگ‌بوو لە وەختی مردنی باوکیدا

رووبدەن‌و چارەسەریشی بۆ هەموویان دانابوو تەنیا یەك شت نەبێ کە قەت بە بیریدا رانەبوردبوو ، ئەویش نزیك‌بوونەوەی خۆی بووە لە مردن‌و لە هەمان رۆژی مردنی باوکیدا .(٤٨)

ئینجا من کە بە هەموو ئەم کردارانەی دۆقدا دەچمەوە هیچی وەهایان تێدا نابینم بهێنێ لە سەری لۆمە بکرێ ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ، من خۆم بە ناچار دەبینم دۆق بە نموونەیەکی ئەوتۆ دابنێم کە دەبێ هەموو ئەوانەی لە رێگەی چەك‌و خۆشبەختی‌ی کەسانی‌ترەوە دەگەنە پۆپەی دەسەلاتداریێتی ، وەك رووی‌دا ، شوێن‌پێ‌ی هەڵبگرن ، چونکە ئەوێك کە بە ئازایەتی‌و زیادەخوازی‌یەکی زۆر ناسرابوو ، لە توانایدا نەبوو لەوە زیاتر بکا کەکردی‌و نەخشەو پلانەکانیشی بە هۆی مردنی باوکی‌و بەخۆشکەوتنی خۆیەوە نەبووایە ، شکستی‌یان نەدەهێنا . هەموو ئەو کەسانەی وای دەبینن کە دەبێ لە رێگەی قایمکردنی جێ‌پێ‌ی خۆیانەوە لە رووی دوژمناندا پارێزگاری لە میرایەتی‌یە تازەکەیان بکەن‌و دۆستیان هەبن‌و داگیرکاری بە زەبری هێز یا بە خەڵەتاندن‌و فرت‌و فێڵ بەدی‌بێنن‌و هەم خۆشەویستی‌و هەم ترس‌و سام بەسەر رەعیەتەکەیاندا بسەپێنن‌و رێزلێگرتن‌و تاعەتکردن بەسەر سەربازانیانداو پلیشاندنەوەی هەر یەکێك کە رەنگ بێ سەریەشەیان بۆ پەیدا بکاو داهێنانی نەریتی‌ تازە لە بری هی کۆن‌و پەنابردنە بەر دڵرەقی‌و بە رەحمی پێکەوەو جوامێری‌و ناجوامێری لە یەك کاتداو بلاوەپێکردنی هێزی سەربازانی ئیختیاری‌ی کۆن‌و پێکهێنانی هێزێکی نوی‌و پاراستنی دۆستایەتی لەگەڵ پادشاو میراندا بە شێوەیەك ناچاریان بکا بە سەرێك بۆی سوودبەخش بن‌و بە سەرێکیش سڵ لە جەزرەبەی دەستی بکەنەوە ، هەموو ئەوانە دەبێ کردارەکانی ئەم پیاوە بە پەسەندترین نموونە بۆ پەیرەوکردن دابنێن . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بزانین کە گوناهی هەرە گەورەی ئەم پیاوە ، رەنگە لە لایەنگیری‌کردنەکەیدا بێ بۆهەڵبژاردنی یۆلیۆسی دووەم بە پاپا . چونکە وەك لەوەبەر وتم ئەو ئەگەرچی نەیدەتوانی قسەی خۆی لە هەڵبژاردنی پاپایەکدا کە خۆی ببەوێ زاڵ بکا ، بەلام دەیتوانی بە هیچ کلوجێ ماوە نەدا کەسێك بۆ پاپایەتی هەڵبژێردرێ کە یەکێك بێ لەو کاردینالانەی ئەم لەوەبەر ئازاری دابن‌و زەرەری پێ‌گەیاندبن ، یا

یەکێك بێ لەوانەی کە لە حاڵەتی بوونیدا بە پاپا . ئەم ناچار بیێ لێی بترسێ . چونکە مرۆڤ یا بە هۆی رقو کینەوە یاخود لە ئەنجامی ترسدا خراپەکاری دەکا . ئەو کاردینالانەی ئەم ئازاری دابوون ، ژمارەیەکی زۆر بوونو گرنگترینیان سان پیترۆ ئادڤینکۆلاو کۆلۆناو[49] سان جیۆرجیۆو ئەسکانیۆ[50] بوون .

جگە لەمانە ئیتر هەر کامێك لە کاردینالەکانی تر بۆ سەرتەختی پاپایەتی هەڵبژێردرایە . ئەو پاپا تازەیە لەم دەترسا ، تەنیا رۆهانی فەرەنسایی و کاردینالە ئیسپانیایی یەکان نەبن کە یەکەمیان بە هۆی ئەو پەیوەندی ی خزمایەتی یەوەی لەگەڵ پادشای فەرەنسادا هەیبوو ، خاوەنی دەسەلاتێکی گەورە بوو ، ئەوانی تریش پابەندی ئەو ئەرکو پەیوەندی یانە دەبوون کە بە دۆقەوە دەیبەستنەوە . بۆیە دۆق لەبەر ئەم هۆیانە دەبوو یەکێك لە کاردینالە ئیسپانیایی یەکان بۆ پاپایەتی هەڵبژێرێ ، یا ئەگەر ئەوەشی پێنەدەکرا دەبوو بریار لەسەر هەڵبژاردنی کاردینال رۆهان بدا نەك سان پیترۆ ئادڤینکۆلا [51] ئینجا گومان لەوەدا نی یە ئەو کەسەی وای بۆ دەچێ کە گوایە گەورەپیاوان وەختێ سوودو بەرژەوەندێکی تازەیان دەسگیر دەبێ کۆنە ئازارو گێچەڵ پێکردنی لەوەبەریان لە بیر دەچێتەوە ، دەکەوێتە هەڵەیەکی گەورەوە . دۆقیش لەم رووەوە هەڵەی کردو هەڵەکەیشی بۆی بووە هۆی تێکشکانێکی ئەوتۆ کە هەڵسانەوەی بۆ نەبوو .

٨

# ئەوانەی لە رێگەی چەپەڵکاری یەوە دەگەنە میرایەتی

لەبەر ئەوەی دوو رێگای تریش هەن بۆ گەیشتن بە میرایەتی کە بە هیچ جۆرێ پەیوەندی‌یان بە بەخت‌و لێهاتووی‌یەوە نی‌یە ، پێویستە هەر وا ئاسایی بە سەریاندا رانەبوورین ، هەرچەندە ئەگەر باسمان لە شێوەی کۆماری بووایە ، دەتوانرا فراوانتر لی‌یان بدوێین. یەکەمی ئەو دوو رێگەیەش بریتی‌یە لەوەی مرۆڤێك بە هۆی بەکارهێنانی ری‌و شوێنی چەپەڵ‌و نەگریسەوە بگاتە پلەی میرایەتی . بەڵام دووەمیان بریتی‌یە لەوەی یەکێ لە ریزی جەماوەری گەلەوەو بە هۆی پشت‌گرتنی‌یەوە لە لایەن هاوولاتی‌یەکانی‌یەوە بەرزبکرێتەوەو بخرێتە سەر تەختی میرایەتی‌ی ولاتەکەی . جا من لە باسکرنی رێگای یەکەمدا دوو نموونە دێنمەوە ، یەکەمیان کۆن‌و ئەوتریان هاوچاخ ، بەڵام بەبێ ئەوەی لە لایەنی چاکەو خراپەی ئەم رێگایە بدوێم ، چونکە وایتێدەگەم دوو نموونەکە بۆ قایل‌کردنی ئەو کەسە بەسن کە خۆی بۆ لاسایی‌کردنەوەیان بە ناچار دەبینێ .

ئاگاتۆکلیسی[٥٣] کە چووە سەر تەخت‌و بووە پادشای سیراکۆزە ، لە پەراگەندەترین‌و نزمترین چین بوو لە ولاتەکەیدا . باوکی لە پیشەسازی‌ی گۆزەو دیزە دروستکردندا ئیشی دەکرد . لە کۆری جۆرە ژیانێکدا پەروەردە بووبوو کە لە هەموو

پلەکانیدا پڕی لە شەڕخواهیو بەدکاری بوو . بەڵام لە پاڵیدا چ بە ئەقڵو چ بە لەش گورجوگۆڵ بوو . بۆیە کاتێ چووە ریزی سەربازانی ئیختیاری‌یەوە ، توانی پلە بە دوای، پلەدا سەربکەویو لە ئەنجامدا بگاتە پایەی گەورەی قازی‌یان (بریتۆر) لە سیراکۆزەدا . ئەوسا بڕیاری‌دا ببێتە میرو لە ڕێگەی ستەمکاری‌یەوەو بەبێ پەنابردنەبەر یاریدەوەرگرتن لە کەسانی‌تر ، پارێزگاری لەو مافەی خۆی بکا کە دەستوور پێ‌یبەخشی بوو . ئەم نیازەی خۆی لای هامیلکاری[٥٤] کرتاجەیی درکاند کە ئەو وەختە لە سکلیادا دەجەنگاو سەرلەشکر بوو . جا بەیانی‌یەکیان بە بیانووی ڕاوێژکردنەوە سەبارەت بە هەندێ باس‌وخوازی زۆر بایەخدار کە پەیوەندی‌یان بە جەمهووریەتەوە هەیە ، پیاوماقوولانی سیراکۆزەو ئەنجومەنی پیرانی شارەکەی بانگ کردە لای خۆی .

ئیتر هەر هێندەی ئیشارەتێکی‌دا ، سەربازەکانی دەستیان کردە سەربڕینی ئەندامانی ئەنجومەنو پیاوماقوولانی شارو دوای دڵنیابوونی لە کوشتنیان ، بەبێ ئەوەی هیچ ترسێکی لە ناکۆکی‌ی ناوخۆ هەبێ ، شارەکەی داگیرکردو کەوتە حوکم‌کردنی . بە دوایدا ، هەرچەندە کرتاجەیی‌یەکان دوو جار شکاندیانو شارەکەیان لێ ئابلووقەدا ، بەڵام لە ئەنجامدا توانی بیپارێزێ ، ئەوسا بەشێك لە هێزەکانی بۆ بەردەوام‌بوونی پارێزگاری لێکردنی تێدا جێ‌هێشتو بە بەشەکانی‌تر پەلاماری کەناری ئەفریقای‌دا . هەروەکوو لە ماوەیەکی کورتدا توانی سیراکۆزە ئازاد بکاو لە ئابلووقەدان ڕزگاری بێ‌و کرتاجەیی‌یەکانیشی ناچار کرد داوای بەستنی پەیمانی ئاشتی‌ی لێ‌بکەنو واز لە دورگەی سکلیا بێنن بۆ ئاگاتۆکلیسو قایل بن کە تەنیا ئەفریقایان لە ژێر چنگدابێ ، ئەمە بێگومان دوای ئەوەی چەند جەزرەبەیەکی توندوتیژی لێدان . ئینجا هەر کەسێ بیەوێ لە سیفەتو کردارەکانی ئەم پیاوە بکۆڵێتەوە ، بۆی دەردەکەوێ کە هیچی وەهایان تێدا نی‌یە بدرێتە پاڵ بەخت ، چونکە وەك وتم ئەو لە گەیشتنی‌دا بە میرایەتی منەتباری هیچ کەسێك نەبووە . بەڵکوو لە ڕێگەی بەرزبوونەوەیەوە لە ڕیزی هێزی سەربازانی ئیختیاری‌یەوەو خۆخستەبەر مەترسی‌ی هەزارەها چەڵەمەو کۆسپو تەگەرەوە پێ‌یگەیشت . ئەوساش ئیتر بە جۆرە ڕێ‌وشوێنێك پاراستی کە هەرگیز خاڵی نەبوو لە

ئەرك‌و ئازارچەشتن‌و مەترسی‌و لە ئازایەتیش . بێگومان ئێمە هەق ئەوەمان نی‌یە سیفەتی پاکی‌و چاکەکاری بدەینە پاڵ ئەو کەسەی هاوولاتی‌یەکانی خۆی دەکوژی‌و ناپاکی لە برادەرو دۆستەکانی دەکاو پشت دەکاتە پەیمانەکانی‌و بەزەیی‌و دینداری دەخاتە لاوە . رەنگە مرۆڤ بتوانێ لە رێگەی ئەم کردارانەوە بە میرایەتی بگا . بەلاّم ناتوانێ بگاتە سەربەرزی . ئەگەر بێت‌و ئێمە لایەنە چاکەکانی ئاگاتۆکلیس وەربگرین کە لە رووبەروو بوونەوەی مەترسی‌و زاڵبوون بە سەریداو لە پتەوی‌و بەهێزی‌ی ورەیدا لە رووی کۆسپ‌و تەگەرەو تەخت‌کردنیاندا خۆیان دەنوێنن ، ئەوا دەبینین هیچ هۆیەك نی‌یە وامان لێ‌بکا پایەوپلەیەکی نزمتری لە هەر یەکێ لە سەرکردە بەناوبانگەکانی بۆ دابنێین . بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا دڵرقی‌یە جانەوەرانەکەی‌و بێ‌بەشی‌یەکەی لە هەستی مرۆڤانەو لە پاڵیاندا ئەو هەموو زوڵم‌و زۆرە لەژمارە نەهاتووەی کە کردنی ، ماوەمان نادەن بە یەکێ لەو پیاوە بەناوبانگانەی دابنێین . هەروەکوو لە تواناماندا نی‌یە ئەوەی بۆی بەدی هێنرا بیدەینە پاڵ بەخت یا چاکەکاری ، چونکە پەنای نەبردبووە بەر هیچیان .

هەروەها لە رۆژانی ئێستاشماندا ، لە سەردەمی پاپا ئەلیکساندەری شەشەمدا ، ئۆلیڤیرتۆ داڤیرمۆ بە هەتیوی گەورە بوو ، جیوڤانی فۆگلیانی‌ی(٥٥) خاڵی بەخێوی کردو هەر لە هەرزەکاری‌یەوە کردی‌یە سەربازو خستیە ژێر سەرکردایەتی‌ی پاولۆ ڤیتللی‌یەوە ، (٥٦) تا دوای مەشق‌کردن‌و پێگەیشتنی لەو قوتابخانە سەختەدا ، پایەیەکی سەربازی‌ی زۆر باشی دەستکەوت. ئینجا کە پاولۆ مرد ، لە ژێر سەرکردایەتی‌ی ڤیتیلۆزۆی(٥٧) برای پاولۆدا بووە جەنگاوەرێك‌و دوای ئەوەش بە ماوەیەکی کەم ، لە سایەی زیرەکی‌و زۆرزانی‌و گورج‌وگۆڵی‌ی خۆیەوە ، بووە یەکێك لە سەرکردەکانی هێزە جەنگاوەرەکان . بەلاّم کە سەیری کرد مانەوەی لە ژێر سەرکردایەتی کەسانی‌تردا بۆ یەکێکی وەك ئەو سووکی‌یە ، بڕیاری‌دا شاری ڤیرمۆ بە یارمەتی‌ی هەندێ لە هاوولاتیانی کە کۆیلەیەتی‌یان لە سەربەستی لا پەسەندتر بوو ، هەروەها بە پشتگیری کردنی لە لایەن ڤیتللی‌یەوە داگیر بکا ، بو ئەم مەبەستەش نامەیەکی بۆ جیوڤانی‌ی خاڵی ناردو تیایدا نووسی‌بووی کە بۆ بینینی ئەوو شارەکەی زۆر بە پەرۆشەوەیەو حەز دەکا

دوای ماوەیەکی دوورودرێژی ئاوارەبوون ، مەملەکەتەکەی خۆی بەسەر بکاتەوە .
هەروەها نووسیبووی ئەوێك کە تووشی گەلیٚ زەحمەتیو ماندووبوون بووە تا گەیشتۆتە پلەی شەرافەتمەندیو لەبەر ئەوەشی کە وای پیٚخۆشە هاوولاٚتی‌یەکانی خۆی بە جۆرێك ببینێتەوە بۆی دەربکەویٚ کە رەنجی بە فیرۆ نەچووە ، دەیەویٚ خۆبەناو شارکردنیدا رادەی شانوشکۆی بنوێنیٚو بۆ ئەم مەبەستەش نزیکەی سەد سوارێك لە برادەرانو دەستو پێوەندانی خۆی لە گەڵدا دەبیٚ . هەروەکوو تکای لە خاڵی کردبوو فەرمان بدا بە خەڵکی فیرمۆ کە پێشوازی‌یەکی وەهای بکەن نیشانەی رێزلێنانی بیٚ ، چونکە ئەو خۆنیشاندانە تەنیا مانای پێشوازی‌لیٚکردنی ئەو ، ئۆلیڤیرتۆ ، ناگەیەنیٚ ، بەڵکوو مانای رێزنانە لە جیوڤانی خۆیشی کە ئەوی پێگەیاندوەو دەرسی داداوە . جیۆڤانی لە بەپیرەوەچوونی خوشکەزاکەیدا کەمتەرخەمی‌ی نەکردو خەڵکی شارەکەی بۆ پێشوازی‌کردنو رێزلێنانی‌هان‌داو دوایی ماڵەکەی خۆیدامیوانداری‌کرد. ئینجا ئۆلیڤیرتۆ دوای چەند رۆژێك چاوەروانکردن ، پیلانە چەپەڵو نەگریسەکەی خۆی بەم جۆرە نەخشە کێشا : خاڵیو هەموو گەورە پیاوانی فیرمۆی بۆ داوەتێکی گەورە بانگ‌کرد . کە نان خوراو ئاهەنگ‌گێرانی ئاسایی‌ی لەو بابەتەی لەم جۆرە داوەتانەدا دەکریٚ دەستی پێکرد ، ئۆلیڤیرتۆ بە نەزاکەتەوە هەندیٚ باس‌وخوازی گرنگی بۆ لێدوان هێنایە کایەوەو کەوتە باسکردنی مەزنی‌ی پاپا ئەلیکساندەرو قەیسەری کوریو پرۆژەکانیان . بەلاٚم وەختیٚ جیوڤانیو ئەوانی‌تر کەوتنە وەرامدانەوەی ، ئەو یەکسەر راپەری‌یە سەرپیٚو وتی : ئەم جۆرە باسانە دەبیٚ بە پەنهانی باس بکرێنو ئیتر خۆی کشانەوەو چووە ژوورێکی تەنیشتەوە . هەرخێرا جیوڤانیو پیاوماقوولەکانیش دوای کەوتن . ئەوسا هەرهێندەی دانیشتنو داینەنیشتن ، ئەو سەربازانەی خۆیان بۆ مەلاٚس دابوون ، لیٚیان دەرپەرینو پەلاماریان‌دانو هەموویانیان قەلاچۆکرد . دوای کوشتارەکە ئولیڤیرتۆ سواری ئەسپەکەی بوو ، بە شەقامەکانی شارەکەدا رابوردو چووە ماڵی (سەرۆکی قازی‌یانیشی) ئابلۆوقەدا . ئیتر خەڵکەکە هەموو لە ترساندا ناچاری تاعەتکردنو دامەزراندنی حکوومەتێکی تازە بوون کە ئەویان بە سەردا کردە میر .
ئینجا وەختیٚ هەموو ئەوانەی لەناوبردن کە دەترسا پیٚی رازی نەبنو دەستی

لیێبوەشێنن ، دەوری خۆی بە ژمارەیەکی نوێ لە کەسانی مەدەنیو عەسکەری تەنی . تەنانەت لەو تەنیا ساڵەدا کە حوکمرانی ناوچەکە بوو ، بە جێ‌پێ‌قایمکردنی خۆیەوە لە فیرمۆدا نەوەستا ، بەڵکوو کارێکی وەهای کرد هەموو دراوسێکانیشی لیێ بترسن .

ستەم بوو حوکمی ئۆلیڤیرتۆ هەرەس بێنێ ئەگەر ماوەی بە قەیسەر بۆرجیا نەدایە ، لە مەسەلەی گرتنی ئۆرسینیو ڤیتیللی لە سینیگاگلیادا لە خشتەی بەرێ وەك لەوەبەر باسم کرد ، چونکە ئەو خۆیشی هەر ساڵە وەختێك دوای ئەو قەسابگەرییە بە کۆمەڵەی کردی ، گیراو لەگەڵ ڤیتیلۆزۆی مامۆستای لە جەربەزەیی و دڵرەقیدا ، کوژرا .

رەنگە مرۆڤ وا هەبێ بە لایەوە سەیر بێ کە ئایا چۆن ئاگاتۆکلیس و ئەوانەی لە بابەتی ئەون ، توانیویانە دوای زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەکی فرت‌وفێڵ و خیانەتکاری و کرداری دڕندانە ، بێ‌ترس و بە دڵنیایییەوە بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر لە وڵاتەکانیاندا تەمەن بەرنەسەرو هەم لە رووی دوژمنانی دەرەوەدا پارێزگاری لە خۆیان بکەن و لە پیلان‌لێکردنی رەعیەتەکەی خۆشیان بەدوور بن . ئەمە لە کاتێکدا کەسانێ هەبووبن لە ئەنجامی دڵرەقییاندا نەیانتوانیبێ نە لە وەختی ئاشتیو نە لە وەختی ئاژاوەو شەردا ، پارێزگاری لە پایەوپلەی خۆیان بکەن . بۆ وەرامدانەوەی ئەم سەرسوڕمانە دەڵێم : من باوەڕم وایە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوەیەی کردارە نەگریسەکانی پێ‌کراوە ، واتە ئایا شێوەکە باش براوەتە سەر یا خراپ . من لێرەدا ئەگەر ماوەمان بدرێ وشەی باش بدەینە پاڵ خراپەکاری ، ناوی شێوەی باش لەو کردارانە دەنێم کە پێویستیی مسۆگەرکردنی ئەمن و ئاسایش وای کردوە بکرێن ، بە مەرجێك ئیدامەیان پێ‌نەدرابێ و دوایی گۆڕدرابن بە جۆرە کردارێك کە ئەوپەری سوودیان بۆ خەڵکەکە هەبووبێ . بەڵام شێوە خراپەکە ئەو کردارە چەپەڵانە دەگرێتەوە کە هەرچەندە لە سەرەتادا کەمیش بووبن ، بەڵام لە ئەنجامدا لە بری ئەوەی کەمتر ببنەوە وردە وردە ژمارەیان زیادی کردوە . جا ئەوانەی پەیرەوی شێوەی یەکەم دەکەن ، دەتوانن وەزعی خۆیان لەگەڵ خوداو لەگەڵ مرۆڤاندا چاك بکەن ، کت‌ومت وەك ئاگاتۆکلیس کردی . بەڵام ئەوانی‌تر قەت لە توانایاندا نابێ پارێزگاری لە خۆیان و وەزعی خۆیان بکەن .

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە داگیرکەر- لە کاتی داگیرکردنی دەوڵەتێك لە دەوڵەتاندا ، دەبێ ئانوسات و یەکڕەمی چی بۆ بەرپاکردنی کردارە چەپەڵ و نەگریسەکانی پێویستە بیکات و ئیتر نەکا هەر ڕۆژە ناڕۆژێك بگەڕێتەوە سەریان . بەم جۆرە ، لە ڕێگەی نەکردنی ئاڵوگۆڕی تازەوە ، دەتوانێ بە هۆی گەلێ پرۆژەی سوودبەخشەوە بۆ گەلەکەی ، دڵنیایی و ئاسوودەگی ی لە ناودا بلاوبکاتەوەو بە لای خۆیدا رایبکێشێ . بەلام ئەوەی رێبازێکی جیاواز لەمە دەگرێتە بەر ، چ بە هۆی ترسنۆکی یەوە بێ یا لە ئەنجامی وەرگرتنی ئامۆژگاری ی گەندەڵدا ، ئەوا ناچار دەبێ هەردەم لە سەرپێ بێ و شیری لە کالان هەڵکێشابێ ، چونکە بە هیچ کلۆجێ ناتوانێ پشت بە گەلەکەی ببەستێ ، لەبەر ئەوەی کە ئەوانیش ئەنجامی دووپاتکردنەوەی خراپەکاری بەرامبەریان لە لایەن ئەمەوە ، ناتوانن پشتی پێ ببەستن . هەروەها خراپەکاری کە کرا پێویستە یەکڕەمی و سەرانسەری بکرێ . چونکە ئەمە سیفەتی بلاوبوونەوەی کاریگەری یەکەی بزر دەکاو دوٓاجار شوێنەوارێکی زۆر خراپ جێ ناهێلێ . وەکی تر سوودو قازانج دەبێ تنۆك تنۆك برژێنرێتە ناو دەمەوە ، هەتا گەل تامی بچێژی و لەزەتی لێ ببینێ . ئینجا سەرباری هەموو ئەمانەش ، میر دەبێ لە ناو رەعیەتەکەیدا بژی ، بەلام بە شێوەیەك کە ماوە نەدا چ خۆشبەختی و چ بەدبەختی بەری کاروانی پێ بگرن . چونکە ئەو پێویستی یانەی لە رۆژانی سەخت و تووشدا دێنە کایەوە ، ناچارت دەکەن ئامادەی رووبەروو بوونەوەیان ببیت ، هەروەکوو رەنگە هیچ خێرخوایی یەك کە دەیکەیت ، لەم جۆرە کاتەنەدا سوودی بۆت نەبێ ، لەبەر ئەوەی رای گشتی وای بۆ دەچێ کە پێویستی بە سەرتیدا سەپاندووە ، بۆیە ناتوانیت هیچ جۆرە سوودێکی لێ دەسگیر بخەیت .

# ٩

# میرایەتی یە میللی یەکان

ئێستا دێینە سەر ئەو حاڵەتەی کە هاوولاتی یەك ، نەك لە رێگەی پیاوکوژی و خراپەکاری یەکی بێ شومارەوە ، بەڵکوو بە هۆی پشتگرتنی لە لایەن برا هاوولاتی یەکانی یەوە بە پلەی میرایەتی دەگا . ئەو حاڵەتە پێ یدەوترێ «میرایەتی ی میللی» . جا مرۆڤ بۆ گەیشتن بەم پایەیە نابێ سەروبەر پشت بە لێهاتوویی و بە بەخت ببەستێ ، بەڵکوو پێیستبە پتر پشت بە فێڵبازی ببەستێ و ئینجا بەختیش دەبێتە یاریدەدەری . هەروەها گەیشتن بەم پایەیە لە رێگەی خواستی جەماوەرەوە دەبێ ، یا لە ئەنجامی پشتگیری کردنەوە لە لایەن سەردارانەوە کە ئەم دوو دەستە دژ بە یەکە لە هەموو شارێکدا هەن .

دژایەتی یەکەشیان لەوەوە دێ کە جەماوەر حەز دەکەن لە چنگ دەسەلاتی گەورەپیاوان رزگاریان بێ و گەورەپیاوانیش حەز دەکەن بەسەر جەماوەردا دەسەلاتدارو حوکمران بن . لەو بەیەکدادانی سوودو مەسلەحەتەدا ، یەکێك لەم سێ ئەنجامە پەیدا دەبێ : یا دروست بوونی حکوومەتێکی دکتاتۆری ، یا حکوومەتێکی

سەربەست . وەیاخود حکوومەتێك کە هەم کۆت‌و پێوەند دەسەپێنێ‌و هەم بوارو دەرفەت دەدا . ئینجا حکوومەتی یەکەمیان یا لەگەڵ پێك‌دێ یا لە سەردارانو پێکهاتنەکەشی بەندی ئەو فرسەتە ناوکۆیی‌یانە دەبێ کە بۆ هەریەکە لە دوو دەستە دژ بە یەکەکە هەڵدەکەون . چونکە وەختێ سەرداران لە بەربەرەکانی‌کردن لەگەڵ گەلدا هەست بە دەستەوستانی دەکەن . لە هەڵداندا بە شان‌وشکۆی یەکێك لە خۆیانو لە بەرزکردنەوەیدا بۆ پلەی میرایەتی یەکدەگرن . بۆ ئەوەی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ئەودا ، بتوانن ئیرادەی خۆیان بسەپێنن‌و نەخشەو پلانەکانیان بەدی‌بێنن . هەروەها لەولای تریشەوە ، وەختێ گەل لە بەربەرەکانی کردن لەگەڵ سەرداراندا . خۆی بە دەستەوستان دەبینێ ، هەوڵدەدا میرێکی ئەوتۆ بخوڵقێنێ‌و بە شانو باهوویدا هەڵبدا کە لە ژێر سایەی دەسەڵاتیدا هەست بە داڵدەدراوی بکا . بەڵام ئەو میرەی بە یاریدەی سەرداران بە پایەی میرایەتی دەگا ، بۆ پارێزگاری‌کردن لە میرایەتی‌یەکەی زیاتر تووشی زەحمەتی دێ وەك لەو میرەی لە ڕێگەی گەلەوە دەیگاتێ . لەبەر ئەوەی یەکەمیان کۆمەڵە سەردارێك دەورەی دەدەن کە خۆیان بە هاوشانی دادەنێن‌و بەوە لەو توانایە دەکەوێ کە بە پێ‌ی حەزو ئارەزووی خۆی فەرمانڕەوایی بکاو گەل بەڕێوەبەری . لە کاتێکدا ئەوەی گەل دەیگەیەنێتە پلەی سەرکردایەتی‌کردن . خۆی بە تاك‌و تەنیاو بێ هاوشان دەبینێ‌و لە ژمارەیەکی کەم بەولاوە کەس بەربەرەکانێ‌ی لەگەڵدا ناکا . سەرباری ئەمە ، قەت ناکرێ سەرداران بە گرتنی ڕێگای دادپەوەری‌و ئازارنەدانی خەڵکی رازی بن‌و بێنە ژێربار ، لە کاتێکدا رازی‌کردنی جەماوەری گەل بە گرتنی ئەم ڕێگایە ئاسانە ، چونکە ئامانجەکانی گەل پاك‌و بێگەردترن لە ئامانجەکانی سەرداران . ئەمان دەیانەوێ زوڵم‌و زۆر بکەن‌و ئەوان تەنیا هێندەیان مەبەستە خۆیان لە زوڵم‌و زۆر بپارێزن . لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە میر ناتوانێ خۆی لە گەلێکی بە ژمارە زۆری رق‌لێ‌هەلگرتوو بپارێزێ ، بەڵام دەتوانێ خۆی لە دوژمنایەتی‌ی سەردارانێکی بە ژمارە کەم بپارێزێ . هەروەها خراپترین شت کە دەشێ میرێك لە گەلێکی رق‌هەڵگرتووی چاوەڕوان بکا ، دەسبەردانێتی لە میرەکەی . لە کاتێکدا ئەوەی کە دەبێ لە سەردارە رق‌هەڵگرتووەکانی چاوەڕوان بکا ، تەنیا دەسبەرداربوون نابێ ، بەڵکوو بریتی دەبێ لە

بەربەرەکانی‌کردنێکی توندوتیژو کاریگەریش . جا لەبەر ئەوەی کە ئەمان لە جەماوەری گەل دووربین‌ترن ، هەردەم بۆ خۆرزگارکردن لە سەرپێن‌و بۆ چوونەپال ئەو دوژمنەی چاوەروانی زال‌بوونی لێدەکەن ، ئامادەن . وەکی‌تر میر بەبێ گەل ناتوانێ بژی . بەلاّم دەتوانێ بەبێ تەنیی دەوری خۆی بە سەرداران بژی ، چونکە بۆی هەیە لەهەر وەختێکدا بیەوێ ، سیفەتی سەرداریان پێ‌ببەخشێ‌و لێشیانی بسێنێتەوە ، هەروەکوو بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی پلەوپایەیان بەرزو نزم بکاتەوە .

جا بۆ زیاتر رۆشن‌کردنەوەی ئەم بەشەی لێدوانەکەم ، دەمەوێ بڵێم : ئەرکی سەرشانی میر وا پێویست دەکا کە بە یەکێك لە دوو شێوە مامەلە لەگەڵ سەرداراندا بکا : یەکەمیان بە بەرێوەبردنیان بە جۆرێك کە-پشت‌بەستنی تەواویان بە لوتف‌و سۆزی میر مسۆگەر بکا . دووەمیشیان کە بەم شێوەیە بەرێوە نەبرێن . ئینجا تۆ دەبێ ئەو کەسانەت خۆش‌بوێ‌و رێزیان لێ‌بنێیت کە بەبێ هیچ تەماعێك پابەندت دەبن . بەلاّم ئەوانەی خۆیانت لێ بەدوور دەگرن ، دەبێ بە دوو شێوەی جیاواز تێیان بروانیت : هەندێکیان ترسنۆکی‌و بێ‌ورەیی پاڵیان پێوە دەنێ بۆ گرتنی ئەم جۆرە هەڵوێستەو لەم حاڵەتەدا تۆ دەبێ سوود لەو بابەتە کەسانە ببینیت‌و راوێژیان پێ بکەیت‌و بیرورایان وەربگریت کە بەمە ئەوانیش لە لای خۆیانەوە لە رۆژانی خۆشیدا رێزت لێ‌دەنێن‌و لە حاڵەتی تووشی‌و تەنگانەشدا هیچ ترسێکت لێ‌یان نابێ . لە کاتێکدا ئەگەر خۆبەدووگرتنەکەیان بە هۆی نیازو مەبەست‌و تەماعی تایبەتی‌یانەوە بێ ، ئەوا دەبێتە بەڵگەی زیاتر بیرکردنەوەیان لە خۆیان وەك لە تۆ . بۆیە میر دەبێ لە ئاستی ئەم بابەتە کەسانەدا وریا بێ‌و وەك دوژمنێکی نهێنی تێ‌یانبروانێ‌و ئەوەیان لێ‌چاوەروان بکا کە هەرهێندەی ئەم تووشی تەنگانەیەك بوو ، بەبێ هیچ گومان ئەوان هەوڵی تێکشکاندنی دەدەن .

هەروەها ئەو میرەی بە هەڵبژاردن لە لایەن گەلەوە بە پلەوپایەکەی دەگا ، دەبێ پارێزگاری لەو دۆستایەتی‌یەی لەگەڵ گەلدا بکا بۆی رەخساوەو بزانێ کە گەل تەنیا هێندەی دەوێ لە زۆرداری رزگاری بێ . بەلاّم ئەو میرەی لە رێگەی سەردارانەوەو بە پێچەوانەی ئیرادەی گەلەوە دەگاتە ئەو پایەیە ، دەبێ بەر لە هەموو شتێ هەوڵ بدا

هەستو سۆزی گەل بە لای خۆیدا رابکێشێ . ئەمەش کارێکی ئاسانە ئەگەر بێتو باڵی داڵدەدانی بە سەردا بکێشێ . ئینجا لەبەر ئەوەی خەڵکی بە تەبیعەت وەهان کە بەرامبەر بەو کەسەی چاوەڕێی خراپەیان لێدەکردو کەچی چاکەیان لێ بینی ، هەست بە قەرزارییەکی گەورە دەکەن ، ئەوا ئەو گەلە وای لێدێ ئەم میرەی لاپەسندتر بێ وەك لە یەکێك کە خۆی هەڵیبژاردایە . میر دەتوانێ بە زۆر شێوەی جۆراوجۆر کە بە پێی بارو زرووف دەگۆڕێن و بەندی هیچ ڕێوشوێن و یاسایەکی دەسنیشانکراو نین ، هەستو سۆزی گەل بە لای خۆیدا رابکێشێ . بەهەر حاڵ من لە کۆتاییدا دەمەوێ بڵێم : لەسەر هەر میرێك پێویستە کە دۆستایەتیی گەلەکەی مسۆگەر بکا ئەگینا لە کاتی تەنگانەو نەهامەتیدا هیچ پەنایەك نابینێتەوە هاواری بەرێتە بەر .

بۆ نموونە ئەوەبوو (نابیس) (٥٨)ی میری سپارتە توانی لە رووی ئەو ئابلووقەدانەدا خۆی رابگرێ کە سەراپای وڵاتی یۆنان بەشداری تێداکردو لەشکرێکی سەرکەوتووی رۆمانەکان یاریدەی ئابلووقەدارانیاندا ، تا لە ئەنجامدا وڵاتەکەی لە دەستیان پاراستو خۆیشی ئەو پایەوپلەیەی پێگەیشتبوو ، لە کیسی نەچوو . ئەو هەرچەندە لە کاتی بەرپابوونی مەترسییەکەدا پشتی بە تەنیا چەند کەسێك لە سەرداران بەست ، بەڵام ئەگەر گەلەکەی دوژمنی بووایە چەند کەسەکە نەیاندەتوانی بە فریای بکەون . بێگومان من لێم خۆش نایەت هیچ مرۆڤێك هەبێ ، بێت بە پێچەوانەی ئەم رایەی منەوە ، پەیرەوی ئەو قسە پووچە بکا کە دەڵێ : (ئەوەی لە سەر شانی گەل بینا دەکا ، لەوە دەچێ کە لە سەر بناغەیەکی قوڕینی فشەڵ بیکا) . رەنگە ئەم قسەیە بۆ هاووڵاتییەکی ئاسایی راست بێ کە دەیەوێ بە پشتبەستن بە گەل لە زوڵمو زۆری دوژمنانی یا حاکمەکانی (قضاة) رزگاری بکا ، چونکە ئەو هاووڵاتییە هەرزوو بە خۆی دەزانێ کە چۆن گشت خەونەکانی پووچ دەبنەوە ، کتومت وەك بە سەر فراشی لە رۆماو جیۆرجیۆ سکالی لە فلۆرنسادا هات . بەڵام ئەگەر ئەو هاووڵاتییەی نەخشەی خۆی لە سەر هەمان بنچینە دادەنێ ، میرێکی ئەوتۆ بوو کە فەرمانڕەوایی کردنی لە باردا هەبێو فەرماندەو ئازا بێو لە کاتی تەنگانەدا نەترسێو

پێویستی‌یەکانی‌تری خۆئامادەکردنیش نەخاتە پشت‌گوێ‌و بەو ئازایەتی‌و چست‌و چالاکی‌یەی،جەماوەری گەل بزوێنی‌و رایچەنێنی ، ئەوا ئەم میرە بە پشت‌بەستن بە گەلەکەی هەڵخەڵەتاو نابی‌و بۆیشی دەردەکەوێ کە نەخشەکانی خۆی لە سەر بناغەیەکی پتەو دارشتوە .

دەشی ئەم جۆرە میرایەتی‌یە ، ئەگەر میرەکەی لە فەرمانڕەوایی‌کردنێکی میللی یانەوە لابداتە سەر باری فەرمانڕەوایی‌کردنێکی زۆردارانە ، ئیتر سا راستەوخۆ بێ یا لە رێگەی چەند حاکمێکی‌ترەوە بێ ، بکەوێتە بەر مەترسی‌یەوە . بەتایبەتی لە حاڵەتی دووەمیاندا کە گومانی تێدا نی‌یە وەزعی میرەکە تەواو لاواز دەبی‌و لە تێداچوون نزیك دەبێتەوە ، چونکە دەکەوێتە بەر رەحمەتی ئەو هاووڵاتی‌یانەی کردوونی بە حاکم‌و لە کاتی تەنگانەدا زۆر بە ئاسانی دەتوانن ، یا بە دژایەتی‌کردن لە گەڵیداو یا لە رێگەی یاخی‌بوونەوە لە فەرمانەکانی ، لە میرایەتی‌ی بخەن . جا لەم حالەتەداو لە کاتی پەیدابوونی ئەم مەترسی‌یەدا ، لە وەزعێکی وەهادا نابێ بتوانێ جڵەوی حوکمڕانی‌یەکی دکتاتۆرانە بگرێتە دەست ، چونکە هاووڵاتی‌یان‌و رەعیەتەکەی کە راهاتووی وەرگرتنی فەرمانن لە حاکمەکانی‌یەوە ، ئامادەی تاعەتکردنی فەرمانەکانی ئەو نابن . هەردەمیش لە کاتی تەنگانەدا بێ‌بەش دەبێ لە کەسانێك کە بتوانێ پشتیان پێ‌ببەستێ . جگە لە وەی کە ئەم جۆرە میرە ، وەختێ هاووڵاتی‌یەکانی موحتاجی دەوڵەت دەبن ، ناتوانێ نەخشەکانی بەو پێیە دابنێ کە لە کاتی ئاشتیدا دەیبینێ ، چونکە هەر مرۆڤێك لەم حاڵەتانەدا بە سەخاوەت بەڵێن دەداو کە مردن لێ‌ی بەدوور دەبێ ئامادەیی خۆی بۆ مردن لە پێناوی میردا نیشاندەداو کەچی لە کاتی تەنگانەداو وەختێ دەوڵەت پێویستی بەهاووڵاتی‌یەکانی دەبێ ، میر لە ژمارەیەکی کەم بەولاوە کەسی‌تری دەس ناکەوێ .

بێگومان ئەم تاقیکردنەوەیە گەلێ پڕ لە مەترس‌یەو تەنیا یەك جاریش روودەدا . بۆیە ئەگەر میر ژیر بێ ، دەبێ هەوڵی دۆزینەوەی ئەو رێ‌وشوێنانە بدا کە بتوانێ لە رێگەیانەوە هاووڵاتی‌یانی وا لێ بکا ، هەردەم‌و لە هەموو بارودۆخێکدا هەست بکەن کە پێویستی‌یان بە حکوومەتەکەی هەیەو بەوە ئیتر هەمیشە دڵسۆزی میرەکەیان دەبن‌و پشتی دەگرن .

# ١٠

# ئایا هێزداری دەوڵەتان چۆن دەپێورێ؟

وەختێ لە چۆنێتی‌ی ئەم میرایەتی‌یانە دەکۆڵینەوە بە پێویستی دەزانم بایەخ بە مەسەلەیەکی تریش بدەین ، کە بریتی‌یە لەوەی ئایا میرەکە لە وەزعێکی وەهادایە بتوانێ لە حاڵەتی پێویستیدا پارێزگاری لە خۆی بکا ، یاخود بەردەوام پێویستی‌ی بە یاریدەی کەسانی‌تر هەیە؟ . بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە دەڵێم : من وایدادەنێم ئەوانەی لە باریاندایە پارێزگاری لە پایەوپلەی خۆیان بکەن ئەوانەن کە هەم خەڵكو هەم پارەیەکی زۆریان هەیەو دەتوانن لەشکرێکی باش گردبکەنەوەو لە رووی هەر پەلاماردەرێکدا خۆرابگرن . هەروەکو وایدادەنێم ئەوانەی پێویستی‌یان بە کەسانی‌تر دەبێ ئەوانەن کە ناتوانن لە شەردا بەرامبەر بە دوژمنەکانیان خۆیان رابگرنو ناچاری کشانەوە بۆ ناو شوورەی قەڵاکانیانو گرتنی هەڵوێستی بەرگری کردن دەبن . جا ئەوەبوو باسی حاڵەتی یەکەممان کردو لە داهاتوشدا ئەگەر پێویستی کرد باسی لێدەکەینەوە . بەڵام دەربارەی حاڵەتی دووەم ، شتێکی ئەوتۆ نی‌یە بوترێ تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەم جۆرە میرە دەبێ بۆ پڕکردنی شارەکەی لە ئازووقەو پتەوکردنی رێوشوێنی پارێزگاری‌لێکردنیو خۆخەریك‌نەکردن بە وەزعی دیهاتەکانی دەوروپشتی‌یەوە هان

بدریٚ . گومانی تیٚدا نیٚیه كه دوژمن له پەلاماردانی میریٚكدا كه بزانیٚ چۆن شارەكەی قایم و پتەو دەكاو حكوومەتی رەعیەتەكەی به باشی بەرِیٚوه دەبا ، وەك لەوەبەر شیمکردەوەو بۆ لەمەودواش باسی لیٚدەكەمەوه ، هەردەم دوودلٚ دەبیٚ ، چونكه خەلٚكی هەمیشه رقیان له جۆره سەركیٚشیكردنیٚك دەبیٚتەوه كه چاوەروانی گیٚچەلٚو گۆبەندی لیٚبكەن . بۆیه هیٚرش بردنه سەر كەسیٚك كه شارەزای بەرگریكردن بیٚ له شارەكەیو رەعیەتەكەشی به خۆشەویستییەوه به هانایەوه بچن ، قەت به ئاسانی نابریٚتە سەر . بۆ نموونه شارەكانی ئەلمانیا سەربەستییەكی تەواویان هەیەو ژمارەیەكی كەم دیٚهاتیان به دەوردایەو تاعەتی ئیرادەی ئیمپراتۆرەكەیان به شیٚوەیەك دەكەن كه خۆیان به پەسەندی بزانن و هیچ لیٚی ناترسن ، هەروەكوو له هیچ حوكمرانیٚكیتری نزیكیشیان ناترسن . لەبەر ئەوه ئەم شارانه تا رادەیەكی ئەوتۆ قایمو پتەون كه ئەوەی بیەویٚ به سەریاندا زالٚ بیٚو داگیریان بكا ، بۆی دەسەلمیٚ كه چ ئەركیٚكی زەحمەتو پرِ له دەردیسەری دەگریٚتە ئەستۆ . ئەوه نیٚیه هەموو دەوریان به خەندەقو قەلٚاو قولله تەنراوەو پرِ له تۆپو جباخانەو ئازووقەن ، له خواردنو خواردنەوەو سووتەمەنی كه بەشی سالٚیٚكی تەواوی دانیشتوانیان دەكەنو نراونەته ناو گەنجینه گشتییەكانەوه . جگه لەمانه ، حكوومەتەكانی ئەم شارانه بۆ راگرتنی دلٚی چینی كارگەرەكانی دانیشتوانیانو بیٚ ئەوەشی هیچ زیانیٚك له كۆلٚی خەزیٚنەی گشتی بار بكەن ، هەردەم ریٚوشویٚنیٚكی وەهایان به دەستەوه هیٚشتۆتەوه كه بتوانریٚ بۆ ماوەی سالٚیٚكی تەواو لەو جۆره كارانەدا بیانخەنه گەرِ كه ژیانی شارەكەو شادەمارەكانی پیٚكدەهیٚننو لەو پیشەسازیانەشدا كه كۆمەلٚانی خەلٚكی ئەو چینانه له سەری دەژین . هەروەها بەردەوام مەشقی سەبازییان به پیٚی سیستمیٚكی زنٚكویٚكی بالٚا تیٚدا دەكریٚو ئەو پەیروانەشی كه ئەو مەشقكردنەیان پیٚدەپاریٚزیٚ ، هەرله گەردانو رەچاو دەكریٚن .

بەم پیٚیه هیچ مرۆڤیٚك له توانایدا نابیٚ هیٚرش بەریٚتە سەر میریٚك كه هەم خاوەنی شاریٚكی قایمو پتەو بیٚو هەم خۆیشی نەخستبیٚته بەر رقو كینەی رەعیەتەوه . سائیتر ئەم مەرجانه بۆهەر میریٚك هەلٚبكەون ، ئەوا پەلاماردەرەكەی ناچار دەبیٚ به

سەرشۆڕی‌یەوە بکێشیتەوە دواوە . چونکە هیچ شتێك بەردەوام نابیٰ‌و ستەمە هیچ پەلاماردەرێك بتوانیٰ بۆ ماوەی ساڵێکی رەبەق شارێك ئابلووقە بدا ، بەبیٰ ئەوەی هێزە ئابلووقەدەرەکانی هیچیان پیٰ بکریٰ . من دەمەویٰ وەرامی ئەوانە بدەمەوە کە دەڵین : گەل کە ئابلووقە دەدریٰ‌و دەبینیٰ ئەو موڵك‌و ماڵەی لە دەرەوەی شاردا هەیەتی دەسووتێنریٰ‌و لە ناودەچیٰ ، ئارامی لەبەر دەبریٰ ، یا درێژ بوونەوەی ماوەی ئابلووقەدانەکەو سوودو بەرژەوەندی تایبەتی‌یان وایان لێدەکا میر فەرامۆش بکەن ، وەرامیان وا دەدەمەوە کە میری ئازاو بەهێز هەردەم بە بەرزکردنەوەی ورەی رەعیەتەکەی بە سەرێك‌و دڵنیاکردنیان بە سەرێکی‌تر لەوەی کە ئەو مەترسی‌و شەرخواهی‌یە، درێژە ناکێشێت‌و ترساندیان بە درندەیەتی‌و دڵرەقی‌ی دوژمن‌و لە گەڵیدا هەمیشە پشت‌بەستن بەو کەسانەی ئەوپەری ئازایی نیشاندەدەن ، بە سەر ئەو جۆرە گیروگرفتانەدا زاڵ دەبیٰ . جگە لەمە دوژمن بە شێوەیەکی ئاسایی هەر لە یەکەم ساتەوە کە دەگاتە گوندەکانی دەوروپشتی شارەکەو وەختیٰ کە هێشتا بیرو هۆشی دانیشتوانی لە ژێر تەوژمی سەرگەرمی‌و بەپەرۆشیدان بۆ پارێزگاری‌کردن لە خۆیان ، پەنا دەباتە بەر سووتاندن‌و تاڵانکردنی ئەو گوندانە . لەبەر ئەوە ئەم لایەنە میر ناتۆقێنیٰ ، چونکە دوای تێپەڕبوونی وەخت‌و خاوبوونەوەی سەرگەرمی‌یەکە ، وا دەکەوێتەوە کە زەرەرو زیانەکە کەوتوەو بڕاوەتەوەو شەڕەکە قەوماوەو هیچ چارەسەرێك بە دەستەوە نەماوە کە ئەمە زیاتر هانیاندەدا بۆ یەکگرتن لە گەڵ میرەکەیاندا ، بەتایبەتی کە ئەمیش لە ئەنجامی سووتاندنی خانووەکانیان‌و خاپوورکردنی موڵکەکانیاندا لە پێناوی پارێزگاری‌کردندا لەم ، زیاتر هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر بەوان دەکا .

ئادەمیزادان تەبیعەتیان وەهایە کە پەیوەندی لە نێوانیاندا بەندی ئەو سوودو بەرژەوەندەیە کە لە گەڵ یەکتردا ئاڵوگۆڕی دەکەن ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٰ کە میری زیرەك‌و وریا ، دوای کۆڵینەوەی لە مەسەلەکە بە هەموو بارێکداو دوای مسۆگەرکردنی گشت پێویستی‌یەکانی بەرگری‌کردن ، هیچ زەحمەتی‌یەك لە راگیرکردنی رادەی ئازایەتی‌ی رەعیەتەکەیدا ، چ لە کاتی دەس‌پێکردنی ئابلووقەدانەکەو چ لە رۆژانیدا ، نابینیٰ .

# ١١

# میراتی یەکانی سەربە کلێسە

ماوەتە سەر ئەوەی باسێکی میرایەتی یەکانی سەر بە کلێسە بکەین ، بەتایبەتی لەو رووەوەی کە پێش داگیرکردنیان گۆبەندو گێچەڵیان تێدا روودەدا . داگیرکردنی ئەم میرایەتی یانە یا لە رێگای لێهاتوویی یەوە دەبێ یاخود بەخت . بەڵام هێشتنەوەیان لە ژێر دەستدا بەم دوو هۆیە ساز نابێ ، چونکە بەندی گەلێ نەریتی ئایینی ی کۆنی هێندە بەهێزو کاریگەرن کە میرەکانیان هەر جۆرە رێبازێکیان گرتبێتە بەرو هەر چۆنێك لە ژیانیاندا پەیرەوی بکەن ، دەسەلاتیان لە چنگدا هەر بۆ دەهێڵنەوە . بۆیە تەنیا ئەم میرانەن خاوەنی جۆرە دەوڵەتێکی ئەوتۆن کە پێویستی یان بە بەرگری لێکردنی نییەو جۆرە رەعیەتێکیشیان هەن کە حوکمرانی یان ناکەن . واتە ئەگەرچی لە تواناو دەسەلاتی بەرگری کردن بێبەشن ، کەچی دەوڵەتەکانیان لێ زەوت ناکرێ . هەروەکوو رەعیەکانیشیان ، ئەگەرچی هەست بە حوکمرانی کردنیان ناکەن ، بەلام پێیان ناخۆش نییەو بیری لێ ناکەنەوەو یا ئەگەر بیریشی لێ بکەنەوە ، ناتوانن خۆیان لە میرەکانیان دابڕ بکەن . کەوابێ تەنیا ئەم جۆرە میرایەتی یانە لە ئەمن و ئاسایشدان و

بەختیارن جا لەبەر ئەوەی کۆڵەکەی بوونیان بەندی هۆیەکی پیرۆزی ئەوتۆیە کە ئەقڵی ئاوەمیزاد نایگاتێ ، من خۆم لە باسکردنی دەپارێزم ، چونکە مادامەکی خودا خۆی سەربڵندیان دەکاو دەیانپارێزێ ، باسکردنی دەبێتە کارێکی گەوجانەی بێبایەخ . لەگەڵێ ئەوەشدا رەنگە یەکێك لێم بپرسێ : ئایا کلێسە چۆن توانیوێتی بەم هێزە (زەمەنی)یە مەزنەی بگا ، لە کاتێکدا سەرکردە ئیتالیاییەکانی پێش سەردەمی پاپا ئەلیکساندەری شەشەم ، بە هێزدارو بێ هێزیانەوە کە بریتی بوون لە چەندین سەردارو سەروەر ، چەندە پایەنزمیش بووبن ، لە رووی دەسەلاتی زەمەنییەوە بە چاوی بایەخەوە سەیریان نەدەکرد ، کەچی ئێستا بۆتە خاوەنی ئەو توانایەی کە پادشای فەرەنسا بتۆقێنێ‌و ناچاری بکا لە ئیتالیا بچێتە دەرێ ، هەروەها ڤینیسیاییەکانیش تێکبشکێنێ‌و پەراگەندەیان بکا . جا هەرچەندە وەرامی ئەم پرسیارە لای هەمووان چاك ئاشکرایە ، بەلام بە باوەڕی من دووپاتکردنەوەوبە بیرهێنانە وەی کارێکی پێویستە .

ئیتالیا ، پێش هاتنی (شارل)ی پادشای فەرەنسا ، لە لایەن پاپاو ڤینیسیاییەکان‌و پادشای ناپۆلی‌و دۆقی میلان‌و فلۆرنساییەکانەوە حوکمڕانی دەکرا . ئەم سەرکردانەش دەبوو بایەخ بە دوو مەسەلە بدەن ، یەکەمیان : نەیەڵن بێگانە بە زەبری چەك بێتە ناو ئیتالیاوە . دووەمیشیان : ماوە بە هیچ کام لەو حکوومەتانەی هەن نەدەن سنووری خۆی فراوان بکاو دەبوو لەم رووەوە بە شێوەیەکی تایبەتی ، چاودێریی پاپاو ڤینیسیاییەکان بکرێ . بگرە بۆ جڵەوگیرکردنی ڤینیسیاییەکان وای پێویست کرد کە گشت سەرکردەکانی تر ببنە هاوپەیمان ، وەك لە پارێزگاری لێکردنی فیرارادا رووی دا . هەروەها بۆ جڵەوگیرکردنی پاپا ، دەبوو سەردارانی رۆما بخرێنە کار . ئەم سەردارانەش بە سەر دوو حیزبدا دابەش بووبوون : حیزبی ئۆرسینی‌و حیزبی کۆڵۆنا . جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو بەرەیە بەردەوام بە گژیەکدا دەچوون‌و هەمیشە بە بەر چاوو گوێی پاپاوە لە حاڵەتی ئامادەبووندا بوون بۆ شەڕکردن ، توانییان پاپایەتی بە دەستەوستانی‌و لاوازی بهێڵنەوە . خۆ هەرچەندە جارناجارێك پاپای بەهێزو دەسەلاتداری وەك پاپا

سیکستۆس[٥٩] پەیدا دەبوون . بەڵام ئەو بەهێزیو خۆشبەختیەیان ، قەت نەیدەگەیاندنە توانای رزگارکردنیان لەو وەزعەیان . رەنگیشە ئەمەنکورتی ماوەی پاپایەتی پاپاکان خۆیان بووبێتە هۆ . چونکە لە ماوەی دە ساڵدا کە ئەمە بە گشتی تەمەنی پاپایەتی پاپاکانە . لە سەرپێی شۆڕکردنی هەر یەکێ لەو دوو دەستە دوژمن بەیەکەدا . زەحمەتیەکی زۆری تووش دەبوو . یا یەکێك لە پاپاکان لەو ماوەیەی ژیانیدا بە راستی بیتوانیایە سەر بە حیزبی کۆڵۆنا شۆڕ بکا . لەوانەبوو پاپای نوێ کە جێگەی دەگرتەوە . دوژمنی حیزبی ئۆرسینی بێو ئەوە دەبووە هۆی سەرهەڵداوەی حیزبی کۆڵۆنا ، بێ ئەوەی هێندەی وەخت بە دەستەوە هەبێ کە بتوانێ حیزبە دوژمنەکەی تێدا ببەزێنێ .

سا ئەمە بوو وای لە ئیتالیا دەکرد رێز لەو دەسەڵاتە زەمەنیە نەنێ کە پاپا هەیبوو . بەڵام پاپا ئەلیکساندەری شەشەم ، بە پێچەوانەی هەموو پاپاکانی پێش خۆیەوە کە چووبوونە سەر تەختی پاپایەتی ، بە بەکارهێنانی هەم ماڵو موڵكو هەم هێز . توانی ئەو رێگایە بدۆزێتەوە کە بە هۆیەوە سوود لەو دەسەڵاتە ببینێ . بۆ ئەمەش دۆق ڤالینتینی کوری کردە داردەستی خۆی ، لە گەڵ قوستنەوەی فرسەتی هێرشەکەی فەرەنساداو ئیتر ئەوەی کرد کە کردی ، وەك لەوەبەر لە باسکردنی کردارەکانی دۆقدا لێیدوام . جا هەرچەندە ئەو ئامانجی مەزنکردنی دۆق بوو نەك کڵێسە ، بەڵام لە هەمان کاتدا کردارەکانی بوونە هۆی مەزنکردنی کڵێسەش کە پاش مردنی ، دۆق بووە میراتگری کۆششەکەی . دوای ئەوە ئیتر پاپا یۆلیۆس[٦٠] هاتە سەر حازریو کە روانی وا کڵێسە بەهێزەو گشت رۆمانای لە ژێر چنگدایەو هەموو سەردارانی رۆماش ملیان بۆ کەچ کردوە ، چونکە لە سایەی دڵرەقیو جەربەزەیی ئەلیکساندەرەوە هەردوو حیزبە دژ بە یەکەکە لەناوبرابوون ، سەرنجیدا رێگای لەبەر دەمدا بۆ کۆکردنەوەی سەروەتو سامان بە جۆرێك بۆ خۆش کراوە کە رێوشوێنەکانی لە پێش سەردەمی ئەلیکساندەردا قەت بەکارنەهێنرابوون . بگرە بە پەیرەوکردنی ئەو رێوشوێنانەشەوە نەوەستا ، بەڵکوو پەرەوی پێدانو لێی زیادکردنو بریاریدا دەست بە سەر کۆڵۆنادا بگرێو سەر بە ڤینیسیاییەکان شۆڕ بکاو فەرەنساییەکانیش لە ئیتالیا دەرپەرێنێتە دەرەوە کە لە

ئەنجامدا لە جێبەجێ کردنی هەموو ئەم نەخشانەیدا سەرکەتنی بەدی هێنا . بێگومان ئەو لەمەدا جێگەی ستایش کردنە ، چونکە بۆ پەرەپێدانی هێزی کڵێسە ، نەك هێزی تاکە مرۆڤێك ، چی لە تواناادا بوو کردی . هەروەکوو وەختێ بووە بە پاپا ، حیزبی ئۆرسینیو کۆڵۆنای چۆن دی ، هەر لە سەر ئەو بارە هێشتنییەوە . بەڵێ .. چەند سەرکردەیەکی تامەزرۆی گۆڕینی وەزعەکە لە دوو حیزبەکەوە سەریان هەڵدا ، بەڵام دوو هۆ لە بزووتنی دەخستن‌و وای لیدەکردن هێمن دانیشن : یەکەمیان مەزنی‌ی کڵێسە کە هەردوو لا لێیدەترسان : دووەمیان نەبوونی هیچ کاردینالێك لە ناویاندا کە هەردەم ئەوان دەبوونە هۆی بەرپاکردنی دژایەتی لە نێوان دوو حیزبەکەداو نەیاندەهێشت هێمنی‌و ئاشتی‌یان لە بەیندا هەبێ ، چونکە هەر لایەنە لە لای خۆیەوە حیزبەکەی خۆی لە ناو رۆماو لە دەرەوەیدا بە گژ ئەوەکەی‌تردا دەکردو بە دوایدا سەردارەکانی هەردوو حیزبەکەش ناچار دەبوون پارێزگاری‌یان لێبکەن . بەم جۆرە هەڵپەکاری‌ی کاردینالەکان ، دەبووە هۆی دژایەتی‌و شەڕو شۆڕ لە نێوان سەردارەکاندا . ئینجا کە پایەپیرۆز پاپا لیۆی دەیەم بوو بە پاپا ، کڵێسەی لەبارودۆخێکی هێجگار پتەودا دی‌و هیواش وایە لە سایەی دڵپاکی‌و چاکەپەروەری‌یە بێسنوورەکەیەوە ، ئەوەی پاپاکانی پێش خۆی بە زەبری چەك دەستیان دایە ، بیپاتەسەرو تەواوکەری بێ‌و پاپایەتی بکاتە هێزێکی مەزنی بە شان‌وشکۆ .

## ١٢

# شێوە جۆراوجۆرەکانی سەربازی ئیختیاری و سەربازی بەکرێگیراو

دوای ئەوەی بە دوورودرێژی لەو سیفەتانە دووام کە دەبێ لەو میرایەتی یانەدا هەبن کە کردوومن بە باسی لێکۆڵینەوەکەم و دوای روونکردنەوەی کەمێکیش لە هۆیەکانی پێشکەوتن یا ژێرکەوتنیان و ئەو رێوشوێنانەی زۆر کەس بۆ دەسگیرخستنی ئەم جۆرە دەوڵەتانە گرتیانەنەبەر ، خۆم بە ناچار دەبینم بە گشتی باسێکی ئەو رێوشوێنانەش بکەم کە دەشێ چ لە بەرگری کردن و چ لە هێرش بردندا بەکار بهێنرێن . ئێوە وەك دەزانن من لەوەبەر پێم لە سەر ئەوە داگرت کە میر پێویستە بنچینە بۆ خۆی چاکدابرێژی ، دەنا چارەنووسی بە بێگومان روو لە هەرەس هێنان و کاول بوون دەکا . خۆ رەنگە باشترین بنچینە بۆ گشت دەوڵەتان ، لە کۆن و لە نوێ و لە تێکەڵ لە هەردووکیان ، بوونی یاسای رێك و چەکی کاریگەر بێ ، یاساش لەو شوێنەدا هەیە کە چەکی بەهێزی تێدایە . لەبەر ئەوە من لێرەدا لە یاسا نادوێم ، بەڵکوو باسم تەنیا لە چەك دەبێ .

من دەمەوێ بڵێم: ئەو هێزە چەکدارەی میر بۆ پارێزگاری کردن لە میرایەتی یەکەی خۆی پشتی پێدەبەستێ ،

یا تایبەتی هی خۆی دەبێ یا بەکرێگیراو ، یاخود یاریدەدەرو یا تێکەڵ بەکرێگیراو و یاریدەدەر هێزێکی بێ کەڵکن ، بگرە بوونیان مەترسی‌ی تیدایەو ئەو میرەی بۆراگیرکردنی دەوڵەتەکەی پشتیان پێدەبەستێ قەت سەرسووکو دڵنیا نابێ . چونکە ئەم هێزانە بە زۆری بەشربەش‌وتەماعکار دەبن ، مانای رێکی نازانن چییە ، گفتبویەڵێن ناپارێزن ، لە رووی دۆستاندا خۆیان بە ئازا نیشاندەدەو بەرامبەر بە دوژمنان ترسنۆکن لە خواناترسن و لە گەڵ خەڵکیدا بێ ویژدانن . ئەو میرەی پشت بەم جۆرە هێزە دەبەستێ ، رەنگە تێکشکانە مسۆگەرەکەی بە دواخستنی ئەو هێرشە دوا بکەوێ کە بەرێوەیە بکرێتە سەری . بەم جۆرە ئەو میرە لە رۆژانی ئاشتیدا دەکەوێتە بەر گیچەڵی راووڕووت‌کردنی سەربازە بەکرێ‌گیراوەکانی‌یەوەو لە رۆژانی شەریشدا راووڕووتی دوژمن و هۆیەکەشی لەوەدایە کە سەربازی بەکرێ‌گیراو دڵسوزی‌یان بە لاوە نی‌یەو لەو مووچە کەمە زیاتر کە وەریدەگرن و کە زۆر لەوە کەمترە بۆ قوربانی‌دان بە گیانی خۆیان لە پێناوتدا هانیان بدا ، هیچ هاندەرێکی‌تری خۆشویستنی تۆیان لە دڵدا نی‌یە کە پاڵیان پێوە بنێ بۆ خۆراگرتن لە کۆری شەردا . ئەوان بە درێژایی ماوەی شەر هەڵنەگیرساندنت و هاوبەشی‌نەکردنت لە جەنگدا ، تەواو ئامادەن سەربازت بن . بەڵام هەر هێندەی جەنگ هاتە کایەوە ، ئیترهەڵدێن‌یا هەر لە بنەرەتەوە شەر ناکەن . بە پێویستیشی نازانم نموونە بهێنمەوە ، چونکە ئەو کاولکاری‌یەی بە سەر ئیتالیادا هات و تا ئێستاش دەیبینین ، ئەنجامی یەك شتە کە ئەویش پشت‌بەستنە بۆ ساڵانێکی دووروودرێژ بە لەشکری بەکرێ‌گیراو . گیومان لەوەدا نی‌یە ئەم لەشکرانە یاریدەی هەندە کەسێکیان بۆ گەیشتنە سەر دەزگای حوکمرانی‌کردن داوەو لە بەراوردکردنیاندا یەك لەگەڵ یەکتردا ، ئازایەتی‌ی چاکیشیان نواندوە . بەڵام هەر هێندەی بێگانەیەکی داگیرکەر شاڵاوی هێنابێ ، ئەمان خێرا بێ‌کەڵکی‌ی خۆیانیان سەلماندوە . هەر بەم شێوەیەش بوو کە پادشا شارلی فەرەنسایی هەلی داگیرکردنی ئیتالیای بەبێ بەرگری‌کردن بۆ هەڵکەوت . جا هەر کەسێك ئەمە دەداتە پاڵ خراپەکاری‌ی خۆمان ، هەق دەڵێ و راست دەکا . بەڵام خراپەکاری‌یەکە بەو بارەدا نییە کە ئەوان بۆی دەچن . بەڵکوو بەم بارەدایە کە من گێرامەوەو لەبەر ئەوەشی

لەسەر دەستی میرەکان خۆیاندا رووی‌دا ، ئەوەتا هەر خۆشیان سزای خراپەکاری‌یەکە دەنۆشن .

ئیستا من بە دوورودرێژی خەوشەکانی ئەم جۆرە لەشکرە روون دەکەمەوە . جاریٚ سەرکردەکانیان یا لەوپەری لێهاتوویدا دەبن یا ئەمپەری دەستەوستانی . جا ئەگەر بەراستی لە لێهاتووەکان بن ، ئەوا تۆ ناتوانیت پشتیان پی‌ببەستیت ، چونکە هەردەم یا لە رێگەی تەنگ‌هەڵچنین بە تۆی سەرووەریانەوە ، یا لە رێگەی چەوساندنەوەی کەسانی ترەوە ئەنجامی یاخی‌بوون لە فەرمانەکانت ، چاو دەبڕنە بەدیٚ هێنانی سەربەرزی‌ی خۆیان . یا ئەگەر سەرکردەکە دەستەوستان بوو ، ئەوا دەبێتە هۆی راستەوخۆی ماڵویرانیت . خۆ ئەگەر یەکێك بێت‌و لە بەربەرچدانەوەی قسەکەمدا بڵیٚ : ئەمە چارەنووسی بەبڵاوبڕاوی هەر کەسێکە خاوەنی هێزی چەکداری نا چ بەکری‌گیراوو چ بەکری‌نەگیراوبیٚ ، منیش دەڵێم : لە شکر بە شێوەیەکی ئاسایی ، و یامیرێك بەکاری‌دێنیٚ یا حکوومەتێکی جەمهوری . ئەگەر میر بیٚ ئەوا دەبیٚ خۆی ن سەرکردایەتی بکا . ئەگەر جەمهوری‌یەتیش بیٚ ئەوا دەبیٚ یەکیٚ لە هاوولاتی‌یان ، ن خۆی بۆسەرکردایەتی‌کردنی هەڵبژێریٚ . ئینجا ئەگەر دەرکەوت کە بیٚ‌دەسەلاتەو ن هیچی لەباردا نی‌یە ، دەبیٚ هەرخێرا بگۆڕدریٚ . بەڵام ئەگەر سەلماندی کە لێهاتووەوی بەکارە ، ئەوا دەبیٚ دەسەڵاتەکانی لە سنووری یاسادا دەسنیشان بکرێن . ئێمەو تاقیکردنەوە فێری کردووین کە تەنیا میرو کۆمارە چەکدارەکان پێشکەوتن بەدی دێنن . ان لە کاتێکدا لەشکری بەکری‌گیراو لە زەرەربەخشین بەولاوە هیچی‌تری لی‌بەرهەم لەو ناهێنریٚ . هەروەکوو فێری کردووین کە کۆماری چەکدار کەمتر مل بۆ حوکمرانی‌کردنی بوو تاکە کەسێك لە هاوولاتی‌یانی دەدا وەك لەو کۆمارەی پشت بە لەشکری بێگانەگەر کان دەبەستیٚ .

بۆ نموونە رۆماو سپارتە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بە سەربەستی ژیان‌و خاوەنی ری لەشکری بەهێزی خۆیان بوون هەروەها لە ئێستادا شارەکانی سویسرا کە بە باشی پرچەك کراون . سەربەستی‌یەکی زۆریان هەیە. بەڵام رەنگە چاکترین نموونە کە لە سەرشێو هێزی بەکری‌گیراوی بهێنینەوە . ئەوەبیٚ لە کرتاجەی روودا کە چۆن سەربازە

بەکری‌گیراوکان ، دوای کوتایی‌هاتنی شەری یەکەم [٦٢] لەگەڵ رۆمەکانداو هەرچەندە کرتاجەیی‌یەکیش سەرکردایەتی دەکردن ، کەوتنە ئازاردانو چەوساندنەوەی خەڵکەکەی . یا لە یۆنان ، خەڵکی تیبە دوای مردنی ئیبامینۆنداس [٦٢] ، فیلیپی مەکدۆنایی‌یان بۆ سەرکردایەتی‌کردنی هێزە سەربازی‌یەکانی خۆیان هەڵبژاردو بەڵام هەر دوای بەدی‌هێنانی یەکەم سەرکەوتنی ، لەو سەربەستی‌یەی هەیان بوو بێ‌بەشی کردن . هەروەها خەڵکی میلان ، دوای مردنی دۆق فیلیپ ، فرانسیسکۆ سفۆرزایان بۆ شەرکردن لەگەڵ ڤینیسیایی‌یەکاندا بەکری گرت . کەچی دوای سەرکەوتنی لە شەری سیراجیفۆدا ، بۆ بەگژداچوونی خەڵکی میلان کە بەکری‌یان گرتبوو ، دایە پاڵ ڤینیسیایی‌یەکان . یاخود باوکی هەر ئەم سفۆرزایە کە ئەویش سەربازێك بوو ، لە خزمەتی جیۆڤانای ژنەشای مەملەکەتی ناپۆلیدا بوو ، بەلام لە ناکاو پشتی لێکردو بەبێ ئەوەی هیچ هێزێکی سەربازی‌ی بۆ بهێڵێتەوە دەسبەرداری بوو کە لە ئەنجامیدا جیوڤانا ناچار بوو خۆی بهاوێتە باوەشی پادشای ئاراگۆنەوە [٦٣] . یاخود هەرچەندە ڤینیسیایی‌و فلۆرنسایی‌یەکان لەوەبەر لە رێگەی ئەم جۆرە هیزانەوە سنووری مەملەکەتەکانی خۆیانیان فراوان کردو هەرچەندە سەرکردەکانی ئەو هێزانە میرایەتی‌یەکانیان بۆ خۆیان زەوت نەکردو بگرە پارێزگاری‌یان لە میرە فەرمانرەواکانیان دەکرد ، بەڵام من دەڵێم : لەم رووەوە بەخت یاریدەی فلۆرنسایی‌یەکانی‌دا ، چونکە ئەو سەرکردانەی دەبوو لێ‌یان بترسن ، هیچ هەوڵێکی دەس‌بەسەرداگرتنی لەو بابەتەیان نەداو ئەو هەندەشی هەوڵیان‌دا ، بە توندوتیژی بەریان لێ‌گیرا ، لە کاتێکدا هەندێکی‌تریان رووی هەڵپەکاری‌ی خۆیان ئاراستەی لایەکی‌تر کرد . بۆ نموونە سێر جۆن هۆکود لەو سەرکردانە بوو کە هەوڵی بۆ نەدا ، ئەگەرچی ساغ نەبووەوە کە ئایا دڵسۆزی‌یەوە بوو یان نا ، چونکە سەرکەوتنی بەدی نەهێنا . بەڵام هەموو دان بەوەدا دەنێن کە ئەگەر هەوڵی بدایە دەسەڵاتی خۆی بە سەر فلۆرنسادا بسەپێنێ ، ئەوا فلۆرنسایی‌یەکان دەکەوتنە ژێر رەحمەتی‌یەوە . یاسفۆرزا کە هەردەم لە لایەن (براکیشی‌یەکان)ەوە بەری لێدەگیرا ، هەر ئەم بەرلێگرتنە بوو کە توانی جڵەوگیری بکا .

لە کاتێکدا فرانسیسکۆ هەڵپەکاری‌ی خۆی ئاراستەی لومباردیا کردو براشیۆ

ئاراستەی کڵێسەو مەملەکەتی ناپۆلی (٦٤) .

ئێستا با بەو کارەساتانەشدا بچینەوە کە پێش ماوەیەکی کەم روویان داوە . ئەوەبوو فلۆرنسایی یەکان پاولۆ ڤیتیللی یان بۆ سەرکردایەتی کردنی لەشکرەکەیان هەڵبژارد کە پیاوێکی دووربین‌و زیرەك بوو ، وە کە هەر لە رێگەی ئەم دووربینی‌و زیرەکی یەشی یەوە لە پایەوپلەیەکی ئاسایی یەوە گەیشتبووە بەرزترینیان . جا لەبەر ئەوەی کە پاولۆ شاری پیزای بۆ داگیرکردبوون ، کەسێك نەیدەتوانی نکوولی لە پێویستی ی فلۆرنسایی یەکان بە دۆستایەتی ی ئەو بکا ، چونکە ئەگەر لای بدایەتە پاڵ دوژمنەکانیان ، نەیاندەتوانی لە رووبدا بەربەرەکانی بکەن ، یا ئەگەر بەکری یان بگرتایە ناچار دەبوون تاعەتی بکەن . بەڵام بۆ ڤینیسیایی یەکان ، ئەگەر لەو پێشنکەوتنە بکۆڵینەوە کە بەدی یان هێنا ، بۆمان دەردەکەوی کە وەختێ لە شەرەکانیاندا پشتیان بە هێزی تایبەتی خۆیان دەبەست ، واتە پێش ئەوەی لە وشکانی ی خاکی ئیتالیادا دەس بکەن بەجێبەجێکردنی پرۆژەکانیان ، بە پتەوی‌و دڵنیایی‌و سەرکەوتنەوە هەنگاویان دەناو پشت بە سەردارەکان‌و گەلە چەکدارەکەی خۆیان ، ئازایانە دەجەنگان . کەچی کە لە وشکانیدا کەوتنە شەرکردن ، وازیان لەو لایەنە چاکە هێناو دەستیان دایەوە پەیرەوکردنی شێوەو رێبازە ئیتالیایی یە کۆنەکە . ئەوان لە سەرەتای داگیرکاری یەکانیاندا ، هیچ ترسێکیان لە سەرکردەکانی لەشکرەکانیان لە بەردەمدا نەبوو ، چونکە سنووری مەملەکەتەکەیان هێشتا فراوان نەبووبوو ، هەروەکوو ناوو ناوبانگیشیان لەوپەری برەویدا بوو . بەڵام دوای فراوانبوونی سنووری ، بەتایبەتی لە ژێر سەرکردایەتی ی کرماگنۆلادا ، ئەو هەڵەیەیان بۆ روون بووەوە کە تێیکەوتبوون‌و هەستیان کرد کە دوای سەرکەوتنی بە سەر دۆقی میلاندا ، بۆتە خاوەنی ئەوپەڕی ی هێزو دەسەڵات . ئینجا لەبەر ئەوەی دەیانزانی لە شەرکردن لە پێناوی ئەواندا کەمتەرخەم بووە ، هاتنە سەر ئەو باوەرەی کە ئیتر لە ژێر سەرکردایەتی ی ئەودا روو لە هیچ داگیرکاری تر نەکەن ، ئەگەرچی حەزیشیان نەدەکرد یا بۆیان نەدەکرا دەستی لە کار بکێشنەوە ، نەوەکوو دەسکەوتەکانیان لە کیس بچێ . تا لە ئەنجامدا سەیریان کرد باشترین رێگا بۆ رزگاربوون لە دەستی ئیعدامکردنێتی . دوای ئەو کەسانێکی وەك

بارتۆلۆمیۆ دابیرگامۆو رۆبیرتۆ داسان سیڤیرینۆو کۆنت دی بیتیگلیانۆ سەرکردایەتی ی لەشکرەکانیان کردن کە ئەم نموونانە چاوەروانی زیانیان زیاتر لە قازانج لێدەکراو ئەنجامیش هەروەها کەوتەوە ، چونکە لە ماوەی تەنیا رۆژێکدا هەموو ئەو دەسکەوتانەیان لە دەستدا کە ڤینیسیایی یەکان بە کۆشش و ماندووبوونی درێژایی ماوەی هەشت سەدە ، بەدی یان هێنابوون : کەوابێ ئەم جۆرەهێزانە زۆر جار لە دەسگیرخستنی دەسکەوتدا سستن و بەڵام لە بەدی هێنانی زەرەروزیاندا تا رادەی سەرسورمان خێراو چابوکن . جا لە بەر ئەوەی ئەم نموونانەم لەسەر ئیتالیایەك هێنانەوە کە لە ساڵانێکی دوورودرێژەوە لە لایەن سەربازانی بەکرێگیراوەوە کاری رایی دەکرێ ، ئێستا وا بە فراوانی لێیاندەدوێم ، چونکە ئەگەر بنەچەو رەگەزو شێوەی پێشکەوتنیانمان پێزانی ، ئەوسا دەتوانین چارەسەری پێویست بۆ گیروگرفتەکانیان بدۆزینەوە .

تۆ دەبێ ئەوە بزانیت کەلەم سەردەمانەی دواییدا ، وەختێ دەسەڵاتی ئیمپراتۆری یەت لە ئیتالیادا رووی لە پووکاندنەوە کردو پاپایەتی دەستی دایە فراوانکرنی دەسەڵاتی (زەمەنی)ی خۆی ، ئیتالیا بە سەر چەندین دەولەتدا دابەش بووبوو ، هەروەکوو گەلێ لە شارەکانیشی بە رووی ئەو سەردارانەیاندا راپەڕیبوون کە دەسەڵاتی خۆیان لە ئیمپرتۆرەوە وەردەگرت و کاروباریانیان گرتبووە چنگ و سەرشۆری کۆیلەیەتی یان کردبوون . بۆیە کلێسە ، بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی (زەمەنی)ی خۆی ، کەوتە هاندانی ئەو شارە راپەڕیوانە کە لە هەندێکیاندا وەها کەوتەوە هاوولاتی یەك تیایاندا ببێتە میر .

بەم جۆرە وەختێ تەواوی ئیتالیا کەوتە ژێر چنگی کلێسەو چەند جەمهوری یەتێکەوە ، چ ئایینخواهان و چ هاوولاتی یانی تر ، بە چەك هەڵگرتن رانەهاتبوون . بۆیە کەوتنە بەکری گرتنی بێگانەو وەك سەرباز خستیاننە کار . یەکەم کەسیش کە ئەم مۆدەی بەکرێگرتنەی داهێنا ، ئەلبریجۆ داکامۆی رۆمانایی بوو کە براشیۆو سفۆرزای حوکمرانانی دوایی لە ئیتالیادا ، دوو لەو سەربازانە بوون کە لە ژێر دەستی ئەودا مەشقیان پێکراو ئینجا بە دوایاندا ، هەموو ئەوانەی تائێستاش سەرکردایەتی ی لەشکرەکانی ئیتالیا دەکەن و لە ئەنجامی رەشیدی و چابووکی ی ئەواندا

(١) ، شارلی فەرەسایی پەلاماری‌داو پێ‌شێلی کردو دواییش بووە نێچیرێك بۆ لویس‌و کەوتە بەر زۆروجەوری فرناندۆی ئیسپانیایی‌و سەرشۆری بۆ سویسرایی‌یەکانەوە . ئەو سیستمەی سەرکردەکانی سەربازە بەکرێگیراوەکان بەرادەی یەکەم گرتیانە بەر ، بریتی بوو لە بەرزکردنەوەی بایەخی خۆیان لە رێگەی نزم‌کردنەوەی بایەخی سەربازە پیادەکانەوە ، ئەمەشیان بۆیە کرد چونکە خۆیان بێ‌ولات بوون‌و سەرچاوەی ژیانیان تەنیا مووچەو دەسکەوتەکانیان بوو ، هەروەکوو نەشدەکرا هێزی سەربازی‌ی خۆیان بە زیادکردنی ژمارەی سەربازی پیادە پەرە پێ‌بدەن ، چونکە نەیاندەتوانی مووچەی ژمارەیەکی وەها زۆری سەرباز بدەن . بۆیە تەنیا سەربازی سوارەیان بەکاردەهێنا کە بە سەرێك بە ژمارە کەم دەبوون‌و بە سەرێکیش رێزێکی زۆریان لێدەنراو مووچەیەکی زۆریشیان وەردەگرت . بەم پێیە هێزەکانی خۆیانیان بە جۆرێك رێکدەخست کە لە بایەخی پیادە کەم بکەنەوە ، تەنانەت ئەو لەشکرەی ژمارەی دەگەیشتە نزیکەی بیست هەزار سەرباز ، لە دوو هەزار پیادەی بەولاوە تێدا نەدەبوو . هەروەها بۆ پاراستنی خۆیان‌و سەربازەکانیان لە گێچەڵ‌و زەحمەتی‌و مەترسی‌و لە خۆلادان لە یەکتری‌کوشتن لە شەرداو لە تەقەلادانی یەکتری‌گرتن بە دیل بە تەماعی وەرگرتنی نرخی بەرەڵلاکردنی ، چ رێ‌و شوێنێکان بۆ بلوایە بەکاریان دەهێنا . وەك ئەوەی بە شەو هێرشیان نەدەبردە سەر قەڵاکان‌و یا قەڵانشینەکان لە تاریکەشەودا پەلاماری چادرنشینەکانیان نەدەداو ئەمانیش لەشکرگای خۆیان تەلبەند نەدەکرد ، یا سەنگەریان بە دەوردا لێ‌نەدەداو هەمووش لە زستاناندا نەدەچوونە کۆری شەرەوە . بەم پێیە سیستمە سەربازی‌یەکانیان هەموو ئەم شتانەیان گرتبووە خۆیان‌و وەك وتمان لە سەریان دەرۆیشتن ، بۆ ئەوەی خۆیان لە گێچەڵ‌و مەترسی بپارێزن‌و بەم جۆرە لە شان‌وشکۆی ئیتالیایان کەم کردەوەو دووچاری کۆیلەیەتی‌و سەرنزمی‌یان کرد .

١٣

# جۆرەکانی هێزی سەربازی
# (سەربار ، تێکەڵاو ، بنچینەیی)

کاتێ مرۆڤێك داوا لە دراوسێیەکی بەهێزی دەکا کە بێت بە دەنگییەوەو بە هێزە سەربازییەکانی پارێزگاری لێبکا ، ئەو هێزە پێیدەوترێ (سەربار – أضافي) کە لە یێکەڵکیدا لە هێزی سەربازی بەکرێگیراو دەچێ . جاپاپا یۆلیۆس لەم دواییدا ، وەختێ سەیری کرد هێزە بەکرێگیراوەکەی لە پرۆژەی داگیرکردنی فیرارادا خراپ شکستیی هێناوە ، پەنای بردە بەر هێزی سەربارو لەگەڵ فرناندۆی پادشای ئیسپانیادا خۆی رێکخستو داوای لێکرد لەشکرەکەی بۆ یاریدەدانی بنێرێ . رەنگە ئەم جۆرە لەشکرە بۆ خودی خۆی کۆك بێ ، بەڵام بۆ ئەوکەسەی دەیخوازێ هەمیشە مەترسیبەخش دەبێ ، چونکە ئەگەر شەڕی دۆڕاند ، ئەوا ژێرکەوتوو تۆ دەبیتو ئەگەر سەرکەوت ئەوا دەبیتە دیلو ژێردەستەی . هەر بۆ ئەم مەبەستەش نموونەکەی پاپا یۆلیۆسی دووەم دەگرم کە هێنامەوەو کە هێشتا تازە بە تازەیە ، بێگومان ئەو

ڕێگایەی ئەو گرتی‌یەبەر گەلیٚ لە وردبینییەوە دوور بوو ، لە بەر ئەوەی ئارەزووی داگیرکردنی فێرارایالی‌پیێوەناکە تەواو مل بۆ دەسەلاتی بێگانەی داگیرکەر کەچ بکا . بەلام تەنیا خۆشبەختی هۆیەکی سیٚیەمی بۆ خولقاندکە نەیهێشت تالاوی ئەو سیاسەتە

چەوتەی بنۆشیٚ . چونکە وەختیٚ هێزە سەربارەکەی لە راڤینادا شڪێزا ، سویسرایی‌یەکان راپەڕینو بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی خۆیو ئەوانی تریشەوە ، سەرکەوتووەکانیان دەرپەڕاندو بەوە ئەم ، هەم لە بە دیل‌گرتنی لە لایەن دوژمنانی‌یەوە کەهەلاتن‌و هەم لە ژێردەستەیی هێزە سەربارەکەی کە لە سایەی چەکی خەلکی‌ترەوە نەك چەکی خۆی سەرکەوتنی بەدی‌هێنابوو ، رزگاریٚ بوو . یا فلۆرنسایی‌یەکان ، لەبەر ئەوەی هێزی سەربازی‌یان کەم بوو ، ناچار بوون بۆ پەلاماردانی پیزا ، دە هەزار سەربازی فەرەنسایی بەکریٚ بگرن‌و بەوە خۆیان خستە بەر مەترسی‌یەکی هێندە سەخت‌و ستەمەوە کەلەهێچ رۆژگارێکی لەوەبەری خەبات‌کرنیاندا تووشی نەبووبوون . یا ئیمپراتۆری کوستانتینە . بەمەبەستی بەرهە لستی‌کردنی دراوسێکانی ، ناچار بوو دە هەزار سەربازی تورك بۆ یۆنان بنێریٚ . بەلام کە شەڕ کۆتایی هات ، ملیان بۆ گەڕانەوە نەداو بەوە یۆنان لە ژێر سایەی کافرەکاندا ، بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ دووچاری کۆیلەتی بوو .

یا دەشیٚ بەکارهێنانی ئەم جۆرە هێزە لە لایەن ئەو کەسەوەی ئارەزووی لە داگیرکاری نی‌یە . شێوە نابینایی‌یەك بیٚ چونکە ئەم گەلیٚ لە هێزی بەکرێگیراو بە مەترسی‌ترەو زۆر جار کاولکاری‌یەکی سەراپایی لەگەلٚ خۆیدا دەهێنیٚ ، لەبەر ئەوەی هێزێکی یەکگرتووەو دلسۆزی‌و تاعەتکردنی بۆ کەسانێکی‌ترە . لە کاتێکدا هێزی بەکرێگیراو . ئەگەر هات‌و سەرکەوتنی بەدی هێناو ئەگەر خۆشبەختی‌یشی لە تەکدا بیٚ . هێشتا ماوەیەکی زۆری پێدەویٚ تا بتوانیٚ ئەزیەتت پیٚ‌بگەیەنیٚ ، چونکە لە لایەکەوە یەکگرتوو نی‌یەو لەولای تریشەوە پەیوەندی‌ی لەگەلٚ تۆدا ، لە شێوەی بەکرێگرتندایەو تۆ مووچەی دەدەیتیٚ . هەروکوو ئەو کەسی سیٚیەمەشی کە بۆ سەرکردایەتی‌کردنی هەلتبژاردوە . لە وزەیدا نایٚ وا خێرا دەسەلاتێکی ئەوتۆ دەسگیر

بجا کە بتوانێ جەزرەبەت لێبدا . یا بە واتایەکی تر مەترسی ی گەورە لە هێزی بەکرێگیراو لە ترسنۆکی‌و ڕاڕایی یەکەیدایە لە شەڕکردندا ، لە کاتێکدا مەترسی لە هێزی سەرباز لە ئازایەتی‌و بەجەرگی‌یەکەیدایە .

بۆیە میری ئاقڵ خۆی لەم جۆرە هێزە بەدوور دەگرێ‌و تەنیا پشت بە هێزی تایبەتی‌ی خۆی دەبەستێ‌و وەهایشی بە لاوە پەسند دەبێ کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی هێزەکەی خۆیدا شەڕ بدۆڕێنێ ، نەك بە هێزی کەسانی تر بیباتەوە ، چونکە لەسەر ئەو باوەڕە دەبێ کە سەرکەوتنێك لە سایەی هێزی **بێگانەوە بەدی** هێنرابێ قەت ناشێ بە سەرکەوتن دابنرێ . جا من کۆ لەوە ناکەمەوە کە بۆ نموونە حیکایەتی قەیسەر بۆرجیاو کردارەکانیتان بۆ بگێڕمەوە . ئەم دۆقە بە هێزێکی سەرباری بێگانە کە سەرجەمی لە فەرەنسایی‌یەکان پێك‌هاتبوو ، پەلاماری ناوچەی رۆمانای‌داو بە هۆی ئەم هێزەوە توانی **ئیمۆلاو** فۆرلی داگیر بکا . بەڵام کە هەستی کرد بوونی ئەم هێزە چ مەترسی‌یەکی بۆ دروست دەکا ، پەنای بردە بەر هێزی بەکرێگیراو بەو حسابەی کە پشت‌پێ‌بەستنیان ، کارێکی ئەوتۆ نی‌یە مەترسی‌ی زۆری هەبێ‌و چوو هێزەکانی ئۆرسینی‌و ڤیتیللی‌ی بەکرێ گرت . هەروەها سەرلەنوێ کە سەیری کرد ئەم هێزانەش سەرکێشن‌و ناتوانێ لێیان دڵنیابێ‌و ترسیان لێدەکرێ ، پەرت‌و بڵاوی کردنەوەو پشتی بە هێزێك بەست کە خۆی پێکی‌یەوە نا . گومانی تێدا نی‌یە ئەگەر سەرنجێك بدەینە جیاوازی‌ی نێوان پایەوپلەی دۆق لە وەختێکدا کە پشتی بە هێزە فەرەنسایی‌یەکەو دوایش بە هێزەکانی ئۆرسینی‌و ڤیتیللی بەستبوو ، لە گەڵ ئەو وەختەدا کە پشتی بە خۆی‌و بە سەربازەکانی خۆی بەست،بەئاسانی جیاوازی نێوان ئەو سێ جۆرە هێزەمان بۆ دەردکەوێ ، چونکە ناوو ناوبانگی بە دوایدا بەردەوام رووی لە پەرەسەندن کردو کە هەموو لایەك روانی‌یان چۆن بۆتە تاکە سەردارو سەروەری هێزە سەربازی‌یەکانی خۆی ، ئیتر کەس نەیدەتوانی لە بەرێزی‌و پایەبڵندیدا شان بدا لە شانی .

هەرچەندە من نامەوێ لە نموونەهێنانەوەدا لە مێژووی نوێی ئیتالیا دوور بکەمەوە ، بەڵام ناتوانم هێیرۆی سیراکۆزەیی فەرامۆش بکەم کە لەوەبەریش لە یەکێك لە

پەشەکانی ئەم کتێبەدا دەربارەی دوام . ئەم پیاوە وەك وتم ، کرا بە سەرکردەی لەشکری سیرا کۆزەو هەر لەگەلْ هەلْبژاردنیشیدا خێرا دەرکی بە بێکەلْکیی هێزە ئیختیاری یەکەی خۆی کرد کە لەسەر شێوەی هێزە بەکرێگیراوە ئیتالیایی یەکان رێکخرابوو . ئینجا لەبەر ئەوەشی هەستی بە مەترسی ی هەردوو حالەتی هێشتنەوەی یا دەس پێوەنانی کردبوو ، هەلْسا ونجری کردو ئەوسا بە پشتبەستن بە لەشکرێکی خۆی نەك بە لەشکری کەسانی تر ، چووە کۆری شەرەوە. هەروەها حیکایەتێکی تری سەردەمی کۆن (تەورات) دێنمەوە کە نموونەیەکی زۆر گەشەو ئەم مەسەلەیە چاك روون دەکاتەوە . وەختێ داود[٦٥] داوای لە شاوول[٦٦] کرد ماوەی بدا بچێ لەگەلْ پالەوانی فەلەستین جۆلیاتدا بجەنگێ ، شاوول بە مەبەستی هاندانی ، چەكو قەلْغانەکەی خۆی پێشکەش کرد . بەلام داود کە تاقی یکردنەوە ، رەتی کردنەوەو مەعزەرەتی ئەوەی خواست کە ناتوانێ لە شەردا بەکاریان بهێنێ و وەهای لا پەسندتربوو کە بە قۆچەقانیو خەنجەرەکەی خۆی رووبەرووی دوژمنەکەی بوەستێتەوە . بە کورتی چەکی کەسانی تر یا هیواو ئاواتت پووچ دەکاتەوە ، یا شکستی دێنێ ، یا سەروو توانای خۆت بارت لە سەرشان کەلەکە دەکاو یاخود لە کاتی شەردا لە جموجوولْت دەخا . بۆ نموونە پادشا شارلی حەوتەمی[٦٧] باوکی پادشا لویسی یازدەهەم ، دوای ئەوەی لە سایەی خۆشبەختی و ئازایەتی ی خۆیەوە فەرەنسای لە دەست ئینگلیزەکان رزگارکرد ، دەرکی بەوە کرد کە پێویستە شانْ دابداتە سەر هێزی سەربازانی تایبەتی ی خۆی و لە مەملەکەتەکەیدا ، سیستمێکی بۆ سەربازگرتن و بۆ هێزی پیادە دانا . بەلام زۆری پێ نەچوو پادشا لویسی کوری ی ، ئەو هێزی پیادەیەی بلاوە پێ کردو کەوتە بەکرێگرتنی جەنگاوەرە سویسرایی یەکان کە ئەمە گوناهێك بوو کردی و ئەوانەشی بە دوایدا هاتن لە سەری رۆیشتن و وەك ئێستا نیشانی دەدەین ، بووە هۆی مەترسی یەکی گەورە بۆ بۆ مەملەکەتەکە . چونکە ئەم بایەخدانە بە سویسرایی یەکان ورەی سەربازە فەرنسایی یەکانی نزم کردەوە ، بەتایبەتی دوای

بلاوەپێکردنی هێزە پیادەکەیان، ناچارکردنی جەنگاوەرەکانی تریشیان بۆ چاوەڕوانکردنی یارمەتی‌ی بێگانە کە چووبوونە سەر فالکوفیکی ئەو باوەڕەی گوایە ئەگەر هێزی سویسرایی‌یەکانیان لە تەکدا نەبێ ، ناتوانن بچنە کوڕی هیچ شەڕێکەوە . بەم پێ‌یە فەرنسایی‌یەکان وایان لێهات نەتوانن بەر لە سویسرایی‌یەکان بگرنو بەبێ ئەوانیش هەنگاونانیان بۆ هەر بزووتنەوەیەکی سەربازی دژی لایەنەکانی‌تر لێ‌بیێتە کاری نەکردە . ئاوەها لەشکری فەرەنسا بووە لەشکرێکی تێکەڵ لە بەکرێگیراوانو لە کوروکالاڵی خۆی کە ئەمە باشترە لەو جۆرە هێزەی کە سەراپای لە بەکرێگیراوان یا لە بێگانە پێکدێ ، بەلام لە هەمان کاتدا لاوازترە لە هێزە نیشتمانی‌یە ڕەسەنەکە .

واتێدەگەم ئەو نموونەیەی هێنامەوە بەسەو دەریدەخا کە ئەگەر پەرە بەو سیستمە سەربازی‌یە بدرایە کە شارل دایناوبوو ، یا هەر هیچ نەبێ وەك خۆی بهێڵرایەتەوەو کاری پێ‌بکرایە ، فەرەنسا دەبووە هێزێکی سەربازی‌ی ئەوتۆ کە ژێرکەوتنی بۆ نەبێ . بەلام کەسانی بێبەش لە حیکمەتو وردبینی ، زۆر جار دەس دەکەنە داهێنانی هەندێ شتی نوێو لە سەرەتادا چێژی لێدەبینن ، کەچی لەوە بێ‌ئاگا دەبن کە بە چ ژەهرێکی کوشندە کوتایی دێ ، وەك لەوەبەر لە باسی دەردە کاولکارەکاندا ئیشارەتمدا .

گومانی تێدا نی‌یە ئەو میرەی ناتوانێ لە وەختی خۆیدا دەرك بە گیروگرفتەکانی ناو دەوڵەتەکەی بکا ، مرۆڤێکی بێ‌بەشە لە میهرەبانی کە ڕەنگە کەم کەس هەبن لەم بابەتە بن . ئینجا ئەگەر لەهۆی یەکەمی نەمانی ئیمپراتۆریتی‌ڕۆمانکان بکۆڵینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ کە لەئەنجامی بەکرێگرتنی سەربازە ئیختیاری‌یە (جووتی — قوطی)یەکانەوە [٦٨] بوو لە لایەن ڕۆماوەو ئیتر لەو مێژووەوە ، هێزو مەزنی‌ی ڕۆما رووی لە لاوازی کرد . چونکە جووتی‌یەکان کەوتنە دەست‌بەسەرداگرتنی هەموو ئەو خێروبەرەکەتەی کە ئیمپراتۆری‌یەتەکە بە سەر پایتەختیدا دەرژاندن .

من دەمەوێ بگەمە ئەو ئەنجامەی کە ئەو میرەی پشت بە هێزی تایبەتی خۆی نابەستێ ، قەت هەست بە دڵنیایی‌و سەرسەلامەتی ناکا ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ،

هەموو هیوایەکی دێتە سەر تەنیا پشتبەستن بە خۆشبەختی ، لەبەر ئەوەی کە لە کاتی تەنگ‌وچەڵەمەدا ، لە ری‌وشوێنی راست‌و دروستی بەرگری‌لەخۆکردن بێبەش دەبێ . پیاوانی بە حیکمەتیش هەردەم دانیان بەوەدا ناوە کە هیچ کەسێك لەو مرۆڤ لاوازتر نابێ کە بۆ بەهێزکردنی خۆی ، پشت بە هێزی کەسانی‌تر دەبەستێ . هێزی تایبەتی مرۆڤ بریتی‌یە لەو هێزەی لە هاوولاتی‌یەکانی خۆی پێکدێ ، یا لەوانەی پشتی لە زەوی نادەن . ئیتر لەمە دابڕبکا ، گشت هێزەکانی تر یا بەکرێگیراو دەبن یا بێگانەی سەربار . خۆ ئەگەر بە وردی لە کردارو رەفتارەکانی ئەو چوار میرە بکۆڵرێتەوە کەلەم بەشەدا ناویان هێنرا ، یا ئەگەر لەو رێبازانە بکۆڵرێتەوە کە فیلیپی باوکی ئەسکەندەری گەورەو سوڵتانەکان‌و جمهوری‌یەتەکان لە رێکخستنی هێزەکانیاندا پەیڕەویان کردوون ، ئەوا فێربوونی چۆنێتی رێکخستنی ئەم جۆرە هێزە تایبەتی‌یە ئاسان دەبێ . واتێدەگەم لەم باسەدا پێویست بە لەوەزیاتر پەل‌هاویشتن ناکا ، چونکە نموونەم زۆر لەسەر هێنایەوە .

**١٤**

# ئەرکی سەرشانی میر بەرامبەر بە سەربازی ئیختیاری

میر دەبێ لە جەنگ‌و لە شێوەکانی‌و لە چۆنێتی‌ی هەڵسووڕاندنی بەولاوە ، هیچ ئامانجێکی تری نەبێ‌و بیر لە هیچ شتێکی تر نەکاتەوەو لێ‌نەکۆڵێتەوە ، چونکە شەڕکردن بۆ ئەو کەسەی جڵەوی سەرکردایەتی‌کردنی دەگرێتە دەست ، تاقە هونەرێکەو پێویستی پێ‌ی دەبێ . خۆ وەنەبێ ئەم سیفەتە بە کەڵکی تەنیا ئەو کەسانە بێت کە بە میری لە دایك دەبن ، بەڵکوو یاریدەی کەسانی تریش لە کوڕوکاڵانی گەل بۆ گەیشتن بە پایەی میرایەتی دەدا . زۆر جار رووی داوە کە ئەو میرەی پتر بیری لە خۆشحاڵی‌و رابواردن کردۆتەوە وەك لە چەك ، میرایەتی‌یەکەی لە دەست داوە . بۆیە گومانی تێدا نی‌یە کە پشت‌گوێ‌خستنی هونەری جەنگ ، دەبێتە هۆی سەرەکی‌ی فەوتاندن‌و لەدەسدانی دەوڵەتان . لە کاتێکدا وەستایی‌و قاڵ‌بوون تیایدا دەبێتە مایەی دەسگیرخستنی دەوڵەت‌و میرایەتی

بۆ نموونە فرانسیسکۆ سفۆرزا لە سایەی چەکەکەیەوە ، لە مرۆڤێکی ئاسایی‌یەوە بە پایەی دۆقایەتی‌ی میلان گەیشت. بەڵام کورەکانی لەبەر ئەوەی ویستیان خۆیان لە گێچەڵ‌و ئەرك‌و ئازاری شەر بەدوور بگرن ، لە پلەی میرایەتی‌یەوە داخزانە سەر پلەی هاووڵاتی‌یەکی ئاسایی . رەنگە یەکێك لەو ئەنجامە نەگریسانەی کە نەدارایی لە چەکدا دەیهێنێتە کایەوە ئەوەبێ کە تووشی زەلیلی‌و ریسوابیت دەکاو ئەمەش لە نرخی مرۆڤ کەم دەکاتەوەو هەموو میرێك دەبێ خۆی لێ‌بپارێزێ، وەك لە دواییدا روونی دەکەینەوە . ئینجا لەبەر ئەوەی ناتوانرێ هیچ بەراوردێك لە نێوان مرۆڤێکی چەکدارو یەکێکی بێچەکدا بکرێ ، قەت رەوا نی‌یە وای بۆ بچین کە دەشێ چەکدارێك بە حوسن‌و رەزای خۆی سەر بۆ بێ‌چەکێك شۆڕ بکا ، یاخود بێ‌چەکێك لە ناو دەستەو تاقمە چەکدارەکەی خۆیدا سەرسەلامەت دەربچێ . چونکە سەیر دەکەیت ئەم ئاغا ئەو خزمەتکاری خۆی دەبوغزێنێ ، یا ئەویان گومان لە دڵسۆزی‌ی خزمەتکارەکەی خۆی دەکاو بەم جۆرە پەیوەندی لە نێوانیاندا دەپسێ . بۆیە نەفام لە کاروباری سەربازیدا ، جگە لەو گێچەڵانەی ئیشارەتم پێدا ،لەلایەن سەربازەکانیشی‌یەوە بە چاوی سووك سەیر دەکرێ ، هەروکوو ئەویش لە لای خۆیەوە دەکەوێتە گومانکردنەوە لە دڵسۆزی‌ی ئەوان .

بەم پێ‌یە میر دەبێ نەیەڵێ بیروهۆشی لە هونەری جەنگ دابڕ بێ‌و لێ‌ی دوور بکەوێتەوەو پێویستە لە رۆژانی ئاشتیدا زیاتر بایەخی پێ‌بدا وەك لە رۆژانی شەر کە ئەمەشی بە دوو شێوە بۆ دەکرێ ، ئەو دووەش ئیشکردن‌و لێکۆڵینەوەن . بۆ نموونە لە رووی ئیشکردنەوە ، لە سەری پێویستە کە جگە لە بەردەوامبوون لەسەر مەشق‌پێکردنی سەربازەکانی‌و جڵەوگیرکردنیان ، خۆیشی بەردەوام وەخت بە راووشکارەوە بەسەربەری‌و لەشی خۆی بە ماندووبوون‌و زەحمەتی‌چێشتن راهێنێ‌و بە دەمیشی‌یەوە لە سروشتی وڵاتەکەی بکۆڵێتەوە ، وەك بەرزایی چیاکان‌و قووڵی‌ی دۆڵەکان‌و پانایی دەشتەکان‌و چۆنێتی‌ی روبارو زەلکاوەکان . بەڵێ . . دەبێ زۆر بە وردی لا لەم کاروبارانە بکاتەوە ، چونکە بە دوو باردا سوود لەم زانیاری‌یە دەبینێ : یەکەمیان بە زانینی هەموو شت دەربارەی وڵاتەکەی خۆی بۆ ئەوەی بڕیاری باشترین

ڕێو شوێنی بۆ پارێزگاری لێکردن بۆ بدا . دووەمیشیان زانیاریو تاقیکردنەوەی سەبارەت بە ناوچەیەك هانی دەدەن بە ئاسانی شارەزای ئەو ناوچانەی تریش بێ کە ناچاری چاودێری کردنیان دەبێ . بۆ نموونە شاخو دۆڵو دەشتو ڕووبارەکانی تۆسکانیا ، تا ڕادەیەك لە هاوتاکانیان لە میرایەتی یەکانی تردا دەچن . بەم جۆرە پیاو لە ڕێگەی شارەزابوونی ناوچەیەکەوە دەتوانێ وەزعی ناوچەکانی تریش پێی بزانێ . بۆیە ئەو میرەی لەم بەهرەیە بێبەش دەبێ ، مەرجێکی هەرە سەرەکی ی سەرکردە لە خۆیدا ون دەکا . چونکە هەر ئەمەیە کە فێری دەکا چۆن دوژمنەکەی دەدۆزێتەوەو لە کوێدا لەشکرگای دادەمەزرێنێو چۆن سەرکردایەتی لەشکرکەی دەکاو نەخشە بۆ شەڕەکانی دادەنێو چۆن شارێك ئابلۆوقە دەدا ،بەمەرجێکیش بزانێ چۆن سوودی لێدەبینێ .

نووسەرانو مێژونووسان ، ستایشێکی زۆری فیلۆبۆمینی میری ئاخی یەکانیان کردوە ، لەبەر ئەوەی کە لە ڕۆژانی ئاشتیدا بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە تەنیا شەڕو شێوازو ڕێوشوێنەکانی نەبێ . تەنانەت کەلەگەڵ هاوڕێکانیدا چووە بۆ لادێ ، زۆر جار ڕاوەستاوەو لێ پرسیون : ئەگەر دوژمن لەسەر ئەو یاڵەو ئێمەش لەگەڵ لەشکرەکەماندا ئالێرەدا بین ، سوودی شوێن بۆ کام لا دەبێ؟! . یا چۆن دەتوانین بیگەینێ بێ ئەوەی بیە ڵین پیشێوی بکەوێتە ناو هێزەکانمانەوە؟! یا ئەگەر ویستمان بکشێینەوە ،دەبێ چی بکەین،ئەگەر دوژمنیش کشایە دواوە ، دەبێ چۆن دوای بکەوین؟! . ئینجا بەدەم ڕێگاوە گشت ئەو ڕێکەوتانەی بۆ باس کردون کە دەشیا لە هەر لەشکرێك ڕووبدەنو گوێی لە بیروڕای ئەوان گرتوەو ڕای خۆیشی بە پاڵپشتی چەندین بەڵگەو بورهان دەربڕیوە . بۆیە لە سایەی ئەم بیروباوەڕەوە کە هەمیشە لە کەللەیدا دەگەڕا ، لە سەرکردایەتی کردنی لەشکرەکەیدا هەردەم بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەر ڕووداوێك لە سەرپێ بووە .

بەڵام سەربارەت بە بەکارهێنانی ئەقڵ ، لەسەر میر پێویستە مێژوو بخوێنێتەوەو لە کردارەکانی پیاوانی هەڵکەوتوو بکۆڵێتەوە ، تا سەرنج بداتە ڕێوشوێنیان لە شەڕکردنداو لە هۆی سەرکەوتنو ژێرکەوتنیان وردبێتەوە ، بۆ ئەوەی لە

سەرکەوتنەکانیاندا شوێن پێیان هەڵبگرێ و لە ژێرکەوتنەکانیاندا خۆی لە هەڵەو چەوتی یەکانیان بپارێزێ . هەروەها وەك ئەو پیاوانە کردار بکا کە ئەوانیش لە رابوردوودا لاسایی یەکێکیان کردۆتەوە کە ستایش کرابێ و سەری بەرزکرابێتەوەو پایەبڵندەو کردەوەی کاریگەری بۆ هەموو کەس ئاشکراو دیار بووبێو هەر ئەمەشە کە دەوترێ ئەسکەندەری گەورە لە لاسایی کردنەوەی ئاخیلداو[69] قەیسەر[70] لە لاسایی کردنەوەی کۆرشدا کردوویانە . گومانی تێدا نی یە هەر کەس ژیانی کۆرش بەو شێوەیەی ئێکزونۆفۆن[71] نووسیویەتی بخوێنێتەوە ، بە بەراورد لەگەڵ سەرگوزەشتەی ژیانی شیپیۆدا[72] ، بۆی دەردەکەوێ کەچۆن هۆی سەرکەوتنی ئەم لە لاسایی کردنەوەی ئەودا بووەو چۆن کت و مت شوێنپێی ئەو سیفەتانەی کۆرشی هەڵگرتوە کە ئێکزنۆن دەسنیشانی کردوون و بریتی بوون لە دڵنەرمی و بەزەیی و سۆزو هەستی مرۆڤایەتی و بیرئازادی .

میری ژیر دەبێ ئەم جۆرە رێوشوێنە بگرێتە بەرو لە رۆژانی ئاشتیدا بەبێ ئیش دانە نیشێ ، بەڵکوو بەردەوام بێ لەسەر چالاکی و کۆشش کردن ، تا ئەگەر چەرخی بەخت سوورا ، بۆ رووبەرووبوونەوەی هەر جەزرەبەیەکی لە سەرپێ بێ و بتوانێ بەسەر هەر گێچەڵێکیدا زاڵ بێ .

●

## ١٥

# ئەو کاروبارانەی بۆ مرۆڤ و بە تایبەتی بۆ میر دەبنە مایەی ستایش کردن یا تانووت لێدان

ئێستا پێویستە ئەو ڕێوشوێن و بنچینانە نیشان بدەین کە میر دەبێ سەبارەت بە رەعیەتەکەی خۆی و دۆستانی لە سەریان بڕوا . بەڵام لەبەر ئەوەی کە زۆر کەس، بەدوورودرێژی لەسەر ئەو یاسەیان نووسیوە ، دەترسم ئەم نووسینەی من لە بارەیەوە ؟ شێوە لەخۆبایی بوونێك بنوێنێ ، بەتایبەتی کە بیروڕام تیایدا لە کەسانی تر جیاوازە . لە گەڵ ئەوەشدا ، من کە مەبەستمە شتێکی ئەوتۆ بنووسم ئەوانەی تێدەگەن سوودی لێ ببینن ، وای بە چاکتر دەزانم یەکسەر بچمە سەر بارە دروستەکانی باسەکە نەك شتە خەیاڵاوی یەکانی ، چونکە گەلێ کەس هاتوونو چەندین کۆمارو میرایەتی یان بە خەیاڵ بنیات ناوە بێ ئەوەی لە جیهانی راستەقینەوا هەبن . ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو رەوتی

ژیانەی لە سەری دەڕۆین ، زۆر جیاوازە لەو ڕەوتەی کە گوایە دەبێ لە سەری بڕۆین . ئینجا ئەو کەسەشی بە هیوای ڕوودانی شتێك کە بە تەمایەتی پشت دەکاتە حازری ، لە بری فێربوونی چۆنێتی‌ی خۆپاراستن ، ڕێگای خۆ بەفیرۆدان دەگرێتەبەر .

گومانی تیدا نی‌یە ئەو مرۆڤەی دڵسافی‌و خێرخوایی لە هەموو شتێکدا دەکاتە پیشەی خۆی‌و بەو هەموو ژمارە زۆرەش لە خەڵکی پەراگەندە دەورە دراوە ، تووشی خەفەتباری‌و سەراسیمەیی دەبێ . لەبەر ئەوە پێویستە هەر میرێك کە دەیەوێ پارێزگاری لە خۆی بکا ، فێر ببێ چۆن لە دڵسافی‌و خێرخوایی بەدوور دەگرێ‌و دەبێ ئەم فێربوونەیشی بە پێ‌ی پێویستی‌ی هەر حاڵەتێك کە تووشی دێ بەکار بهێنێ یا نەهێنێ .

جا بەم پێ‌یە ئەگەر من لە لای خۆمەوە واز لە باسکردنی ئەو کاروبارانە بێنم کە پەیوەندی‌یان بە میرە خەیاڵاوی‌یەکانەوە هەیەو لەو بابەتانەیان بدوێم کە پەیوەندی‌یان بە میرە واقعی‌یەکانەوە هەیە ، ئەوا دەڵێم : هەر مرۆڤێك وبەتایبەتی میرەکان وەختێ پایەکی بڵندیان دەدرێتێ بە جۆرە سیفەتێکی‌وەها ناوبانگ دەردەکەن کە یا دەبێتە مایەی ستایش‌کردن وەیا تانووتلێدانیان . بەم جۆرە دەشێ ئەم میرە بە سەخی‌و دەس‌بڵاو بدرێتە قەڵەم‌و ئەوی‌تر بە ڕەزیل‌و پیسکە (وام بە پەسند زانی ئەم زاراوە تۆسکانیایی‌یە بەکار بێنم) ، یا ئەم میر بەرچاوتێرەو ئەوی‌تر تێرنەخۆرو تەماعکار ، یا یەکێکیان دڵڕەق‌و نەگریسەو دووەمیان بەرەحم‌و بەزەیی ، یا ڕەنگە یەکەم بەڵێن‌شکێن بێ‌و دووەم بەوەفا بۆ بەڵێن . یا ئەمیان بوودەڵەو ترسنۆك‌بێو ئەویان بەهێزو ورەبەکی پتەو ، یا یەکەم خۆش‌مەعشەرو مرۆڤ‌پەروەر بێ‌و دووەم لووت‌بەرزو توورە ، یا ئەمیان داوێن‌پیس‌و بێ‌ڕەوشت بێ‌و ئەویان پاك‌و بێگەرد . یا یەکەم قسەروو بێ‌و دووەم فێڵباز ، یا ئەم سەرکێش‌بێ‌و ئەو هێمن ، یا ئەم بەویقارو ئەو گاڵتەچی ، یا ئەم بەدین‌و ئەو بێ‌دین . . . هتد . بێگومان من دەزانم گشت خەڵکەکە ئەوەیان لا پەسندە کە میر هەڵگری هەموو ئەو سیفەتە چاکانە بێ کە ئیشارەتم پێدان . بەڵام لەبەر ئەوەی قەت بۆ هیچ مرۆڤێك ناسازێ ببێتە خاوەنی هەموویان‌و پەیڕەویشیان بکا کە بارودۆخی

مرۆڤایەتی خۆی ماوەی ئەوە نادەن ، بۆیە پێویستە ,میر هەتێنده ژیرو سەنگین و بیرورد بێ بتوانێ خۆی لەو فەزیحەتانە بەدوور بگرێ کە رەنگە لە ئەنجامی ئەو جۆرە کردەوە چەوتانەدا ببنە هۆی لەدەسدانی دەوڵەتەکەی ، هەروەکوو دەبێ خۆی لەو بابەتەشیان بپارێزێ کە رەنگە نەبنە هۆی ئەو لەدەسدانەو رەنگیشە ببن .

بەڵام خۆ ئەگەر هەر نەیتوانی خۆی بەدوور بگرێ ، ئەوا پێویستە بە جۆرێك کاریان پێ بکا کە نەیەڵێ ئاشکرا ببن . ئینجا وەکی تر ئەگەر سەیری کرد هیچ رێگایەکی تری بۆ پارێزگاریکردن لە دەوڵەتەکەی لەبەردەمدا نی یە بەبێ ئاشکرابوونی هەندێ لەو کردەوە چەوتانە ، ئەوا دەبێ هیچ گوێ نەداتە تانووت لێدانی ، چونکە قووڵ بوونەوە لە وردکردنەوەی کاروباردا دەبێتە هۆی ناچاربوونی کردنی هەندێ شت کە هەرچەندە وەك چاکەکاری دێنە پێشچاو ، بەڵام ئەگەر پەیرەوکران بۆ مرۆڤ دەبنە هۆی ماڵوێرانی ، لە کاتێکدا زۆر شتی تر هەن لە خراپەکاری دەچن ، کەچی دەبنە مایەی زیاتر هەستکردنی مرۆڤ بە دڵنیایی و بەختیاری .

# ١٦

# سەخاوەت و بێسکەیی

ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر یەکەمینی ئەو سیفەتانەی لەوەبەر ئیشارەتم پێدان ، بۆمان دەردەکەوێ کە دەبێ بڵێم : چاکتر وایە مرۆڤ سەخی و بەخشندە بێ ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا سەخاوەت بەو جۆرەی خەڵکی تێ یدەگەن ، دەشتێ ببێتە هۆی جەزرەبەلێدانت ، چونکە کارپێکردنی لە شێوەی چاکەکاریداو بە ڕێگای راستی خۆیدا ، وا ناکەوێتەوە کە خەڵکی پێ ی بزانن و دواجار دەتخاتە بەر حاڵەتی گوناهبارکردنەوە بە سیفەتێکی پێچەوانە . بۆ نموونە ئەو مرۆڤەی حەز دەکا ناوبانگی لە ناو خەڵکیدا بە سەخاوەت بڵاوببێتەوە ، دەبێ هیچ کامێك لەو بەخشینانە نەخاتە پشت گوێ کە ماناێ ئەوپەڕی پایەبڵندی دەگەیەنن . ئینجا ئەو میرەی لەم بابەتە بێ ، دیارە زۆری پێ ناچێ گشت خایەومایەی خۆی بەم ڕێگایەدا تێدەنێ و ئەوسا ئیتر ئەگەر هەر نەیویست دەسبەرداری ئەو ناوبانگەی خۆی لە سەخاوەتدا بێ ، ناچار دەبێ گەلێ باجی قورس و گران بخاتە ئەستۆی گەلەکەی و ببێتە دەسبڕ و ڕاووڕووتکەرو بۆ دەسگیرخستنی پارەوپوول کۆ لە هیچ کردەوەو کارێك نەکاتەوە . خۆکە داشخزایە ئەم جۆرە حاڵەوە ، ئیتر گەلەکەی دەکەوێتە بوغزاندنی و لە تاو هەژاری ی خۆی دەسلە

زیزلێگرتنی ئەو هەڵدەگری‌و بەم شێوەیە وەها دەکەوێتەوە کە ئەو لە پێناوی سوودی ژمارەیەکی کەمدا ، بەو سەخاوەتەی زیانی بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی گەیاندبێ ، هەروەکوو زۆری پێ‌ناچێ هەست بە یەکەمین پشێوی دەکا چەندە کەم‌بایەخیش بێ‌و بە دوای هەر سەرکێشی‌یەکدا پتر دەکەوێتە بەر مەترسی‌یەوە . وەکی‌تر ئەگەر ئەو میرە لە خۆی بەئاگا هاتەوەو ویستی سیستمی ئەو جۆرە مامەڵەکردنەی خۆی بگۆڕێ ، ئەوا یەکسەر بە تۆمەتی رەزیلی‌و پیسکەیی گوناهبار دەکرێ .

کەوابێ میر ئەگەر نەیتوانی سەخاوەت وەك چاکەکاری‌یەك بەبێ تووش‌بوونی ئەو ناوبانگ‌دەرکردنە بگرێتە خۆی‌و ئەگەر ژیرو وریاش بێ ، لە سەری پێویستە نەیەڵێ وای لێ‌بێ بە پیسکە ناو ببرێ ، چونکە رۆژگار بۆ خەڵکەکەی روون دەکاتەوە کە ئەم بە پێچەوانەی تێگەیشتنی ئەوانەوە ، پیاوێکی زۆر سەخییە ، لەبەر ئەوەی کە سەیر دەکەن وا لە رێگەی دەست‌نووقاندنەکەی لەوەبەری‌یەوە وای لێ‌هاتوە بە داهاتی خۆی کاری خۆی مەیسەر دەکاو چی پێویست بێ بۆ خۆپاراستن لە رووی هەر کەسێکدا کە بیێ لە شەڕپێ‌فرۆشتنی بکاتەوە ، بۆی مسۆگەرەو چەندین پرۆژە بەبێ گرانکردنی باری شانی گەلەکەی دەباتە سەرو لە ئەنجامدا لای گشت ئەو کەسانەی ماڵ‌و موڵکیان لێ‌زەوت ناکا کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکەکەن ، بە راستی دەبێتە میرێکی سەخی‌و بۆ ئەوانەشی هیچیان پێ‌نابەخشێ کە ژمارەیەکی زۆر کەمن دەبێتە پیاوێکی پیسکە . لە سەردەمی ئێستاماندا زۆر کاری مەزنمان دیوەو کەسانێك بەجێ‌یان هێناوە کە بە پیسکە دراونەتە قەڵەم ، لە کاتێکدا ئەوانی‌تر چارەنووسیان ماڵوێرانی بووە . بۆ نموونە پاپا یۆلیۆسی دووەم هەرچەندە ناوبانگی بە سەخاوەت دەکردوەو ئەم ناوبانگەی بۆ چوونەسەرتەختی پاپایەتی بەکارهێنا ، بەڵام لە دواییدا بۆ ئەوەی بتوانێ پێویستی‌یەکانی جەنگەکانی مسۆگەر بکا ، ناچاربوو واز لەو سەخاوەتەی بهێنێ . یا پادشای ئێستای فەرەنسا ، چەند جەنگێکی بەرپا کردوە بێ‌ئەوەی هیچ باجێکی زیادەبار بخاتە ئەستۆی گەلەکەی ، چونکە بە هۆی دەس‌پێوەگرتنەوە لە رابوردوودا ، توانی جێی هەموو ئەو مەسرەفە نائاسایی‌یانە پڕ بکاتەوە کە تووشیان بوو . یا ئەگەر پادشای ئێستای ئیسپانیا سەخی بووایە ،

نەیدەتوانی خۆی بدا لەو ژمارە زۆرە پرۆژەیەی کە هەموویان ئەنجامیان سەرکەوتن بووە .

لەبەر گشت ئەم هۆیانە ، میر ئەگەر بیەوێ خۆی لە رووتاندنەوەی گەلەگەی بەدوور بگرێو بۆ خۆپاراستن ببێتە خاوەنی تواناو دەسەڵاتی خۆیو ماوەش نەدا تووشی هەژاریو رەزالەتی هەژاری بێ ، دەبێ زۆر بایەخ بە ناوبانگ‌دەرچوونی بە پیسکە نەداو خۆی ناچاری زەوت‌کردنی ماڵ‌وموڵکی نەکا ، چونکە پیسکەیی یەکێکە لەو سیفەتە خراپانەی کە توانای حوکمرانی‌کردنی پێدەبەخشێ . خۆ ئەگەر وترا : قەیسەر لە رێگەی سەخاوەتەکەیەوە ئیمپراتۆریتی‌یەکەی دەمگیربوو ، یا زۆر کەسانی‌تر بە سەخاوەت یا هەر هیچ نەبێ بە خۆپەسەخی‌نیشاندان گەیشتوونەتە بەرزترین پایەوپلە ، ئەوا من لە وەرامدا دەڵێم : تۆ لە ئێستادا میریت یاخود بەرێوەیت ببیتە میر . جا سەخاوەت لە حالەتی یەکەمدا زەرەربەخشە ، بەڵام لە دووەمدا دیارە کە پێویستەو دەبێ خەڵکی بەسەخیو بەخشندەت بدەنە قەڵەم . قەیسەر یەکێك بوو لەوانەی بە ئاواتەوەبوو ببێتە سەرداری رۆما ، بەڵام وەختێ ئەو ئاواتی سەرداری‌یەی بۆ خۆی بەدی‌هێنا ، ئەگەر بژیایەو دەستی بە مەسرەفەوە نەگرتایە ، بێ‌شك ئیمپراتوریتی‌یەکەی کاول دەکرد . هەروەها ئەگەر کەسانێك هەبن لە وەرامدا بڵێن : ژمارەیەکی زۆر میر هەن لە رێگەی لەشکرەکانیانەوە زۆر کاری مەزنیان بەجێ هێناوەو لەگەڵ ئەوەشدا بە گەلێ سەخیو بەخشندە ناسراون ، منیش لە وەرامیاندا دەڵێم : میر یا لە سەروەت‌و سامانی خۆی مەسرەف دەکا یا لە هی رەعیەتەکەی وەیاخود لە هی کەسانی‌تر .

جا بە رای من دەبێ ئەوەکەی خۆی دەمێ پێوە بگرێ ، بەڵام سەبارەت بەوانی‌تر دەبێ بەخشندە بێ . چونکە گومانی تێدا نی‌یە بەخشندەیی بۆ میرێك کە بە خۆیو لەشکرێکەوە هێرش دەباو لەسەر ئەو دەسکەوتانە دەژی کە لە رێگەی زەوتکردن‌و سەرقەبلاندن‌و دەس‌بەسەرداگرتنی ماڵ‌وموڵکی کەسانی‌ترەوە بەدی‌یان دێنێ ، کارێکی پێویستە ، لەبەر ئەوەی ئەگەر بەخشندە نەبێ سەربازەکانی دوای ناکەون . بەم پێ‌یە تۆ بۆت هەیە ئەگەر مەسەلە پەیوەندی‌ی بە سەروەت‌و سامانی خۆت‌و رەعیەتەکەوە نەبێ ، گەلێ بەخشندەو سەخی بیت ، چونکە مەسرەف‌کردنت لە سەروەت‌و سامانی

کەسانی تر،وەك چۆن سیرۆس و قەیسەرو ئەسکەندەر کردیان ، نەك لە ناوبانگت کەم ناکاتەوە بەڵکوو زیاتری دەکا ، لە کاتێکدا مەسرەف‌کردنت لە سامانی خۆت زیانت پێدەبەخشێ ، بگرە هیچ شتێك هێندەی سەخاوەت‌و بەخشندەیی بۆت زەرەربەخش نابێ‌و هەر کە کەوتیتە داوی‌یەوە ئیتر توانای کارپێکردنیت نامێنێ‌و لە ئەنجامدا دەبیتە یا هەژارێکی لات ، وەیاخود کابرایەکی ریسواو رەزاگران ، ئینجا ئەگەر ویستیشت لە هەژاری‌یەکە رزگارت بێ ، ناچار دەبێ ببیتە راوورووتکەرێك‌و ئەوساش رەعیەتەکە دەتبوغزێنن . جا میر بەر لە هەموو شتێك دەبێ خۆی لە ریسوابوون یا بوغزاندن بەدووز بگرێ کە گومانی تێدا نی‌یە بەخشندەیی بەرەو یەکێك لەو دوو ئەنجامەی رادەماڵێ ، بۆیە چاکتر وایە پیسکە بێت . ئەمیان ئەوپەرەکەی دەتخاتە بەر حاڵەتی ریسوابوونەوە نەك بوغزاندن کە باشترە لەوەی هەژاری‌یەکە هانت بدا ببیتە دزو جەردەو ئەوسا بکەویتە بەر حاڵەتی هەم ریسوابوون‌و هەم بوغزاندنیشەوە .

# ١٧

# دڵنەرمی و دڵڕەقی
# ئایا خۆشەویست بیت باشترە یا ترسێنەر؟

ئەگەر درێژەی پێبدەین و لەو سیفەتانەی تریش بدوێین کە لەوەبەر ناومان بردن ، ئەوا من وای بۆ دەچم کە **چاکترە** میر وەهای حەز لێ بێ رەعیەتەکەی بە دڵنەرم و بەرەحمی بدەنە قەڵەم نەك بە دڵڕەق و جەربەزە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بزانێ ئەم دڵنەرمی و بەرەحمی یە چۆن بەکار دێنێ . بۆ نموونە قەیسەر بۆرجیا بەدڵڕەق و بێبەزەیی دەدرایە قەڵەم ، کەچی دڵڕەقی یەکەی رێك وپێکی و یەکێتی ی بۆ رۆمانا سازاند ودڵسۆزی ی تێدا چەسپاند . جا ئەگەر لەم باسە وردببینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ ئەو زۆر لەگەلی فلۆرنسا بەرەحم تر بوو کە گوایە بۆ خۆبەدوور گرتن لە سیفەتی دڵڕەقی و بێبەزەیی ، بووە هۆی ماوەدان بە کاول کردنی پیستۆیا . (٧٣) بۆیە میر ئەگەر دڵنیابوو کە دڵڕەقی یەکەی دەبێتە هۆی یەکگرتنی گەلەکەی و دڵسۆزی یان بۆی ، دەبێ گوێ نەداتە گوناهبارکردنی بەو سیفەتە . ئێمە ئەگەر چەند نموونەیەکی لەسەر بهێنینەوە ، چاك بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئەم جۆرە میرە زۆر لەوانە بە بەزەیی ترە کە بە زیادەوە دڵناسکی دەنوێنن و لە ئەنجامیدا دەبنە هۆی روودانی چەندین ئاشووبی ئەوتۆ

که گەلێ خوێنڕشتن‌و ڕاوور نکردنیان لێدەوەشێتەوە . دیارە ئەم کارەساتانەش زەرەروزیان پتر بە سەرجەمی  ییەتەکە دەگەیەنن ، لە کاتێکدا ئەو حوکمانەی میر بەسەر ئەم‌و ئەویاندا دەدا ، تەنـ  چەند کەسانێك دەگرنەوە . لەبەر ئەوە تازەمیرەکان بە پێچەوانەی میرانی ترەوە ،  ەمە لە چنگی ناوبانگ دەرچوون بە دڵرەقی‌و جەربەزەیی دەرباز بین ، چونکە  ـ دەوڵەتێکی نوێ کە دروست دەبێ ، ئاسایی‌یە بکەوێتە بەر چەندین مەترسی‌یەوە . لەم ڕووەوە ڤەرجیل[٧٤] لە زمانی دیدۆوە[٧٥] وتویێتی :

«لەسەر هەر میرێك پێویستە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر حاڵەتێکی تەنگەتاوی‌و بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی پێداویستی‌یە نوێیەکانی مەملەکەتەکەی ، ڕێ‌وشوێنی گونجاوی خۆی بۆ سازبداو بۆ پارێزگاری‌لێکردنیشی ، لە ماوەیەکی دوورەوە بە دەوریدا پاسەوان دابنێ» .

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لە باوەڕکردن بەو قسەو باسانەی دەدرێن بە گوێ‌یداو لە کارهەڵسووڕاندنیشدا وریا بێ . ئەو نابێ لە سێبەری تایبەتی‌ی خۆی بترسێ ، بەڵکوو پێویستە بە شێوەیەکی مام‌ناوەندی‌ی ئەوتۆ دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ کە خۆش‌بین‌و مرۆڤ‌پەروەرانە بێ‌و نەیەلێ باوەڕبەخۆهێنانی زیاد لە پێویست پاڵی بۆ کەمتەرخەمی‌و گوێ‌پێ‌نەدان پێوە بنێ‌و شەرمەزاربوونیش نەی‌هاوێتە باوەشی سەرسەختی‌و دڵرەقی‌یەوە .

جا لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە کایەوە کە ئایاچاکتر وایە خۆشەویست بیت زیاتر لەوەی بەهەیبەت‌و ترسێنەر بیت ، یا خەڵکی لێت‌بترسن زیاتر لەوەی خۆشیان بوێیت؟! .

پوختەی وەرامی پرسیارەکە ئەوەیە کە پێویستە خەڵکی هەم لێت‌بترسن‌و هەم خۆشیان‌بوێیت ، بەڵام لەبەر ئەوەی زەحمەتە بتوانیت هەردووکیان پێکەوە لە خۆتدا کۆبکەیتەوە ، چاکتر وایە لێت‌بترسن وەك لەوەی لە لایان خۆشەویست بیت ، ئەمە ئەگەر ناچار بوویت کە یەکێکیان هەڵبژێریت ، چونکە دەوترێ کە خەڵکەکە بە شێوەیەکی گشتی سپڵەو بێ‌بارو ڕیاکارن‌و خۆیان لە مەترسی بەدوور دەگرن‌و زۆر

تەماعکاریشن . ئەوان هەتا تۆ بۆیان سوودبەخش بیت لە گەڵتدا دەبن و خوێن و ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان و هەرچی یان هەیە لە پیناوتدا دەیبەخشن وەك لەوەبەر وتم ، ئەمە لە وەختێکدا کە تۆ هێشتا هۆت تی یان نەکەوتوە، بەڵام هەر کە هاتە سەر ئەوەی هۆت تی یان بکەوێ ، بە رووتدا دەتەقنەوە . بۆیە چارەنووسی هەر میرێك کە پشت بە بەڵێنیان دەبەستێ بێ ئەوەی رێ و شوێنی تری بۆ خۆی دانابێ ماڵوێرانی و تێکشکان دەبێ ، چونکە ئەو دوستایەتی یەی لەسەر بناغەی کڕین و فرۆشتن بنیاد نرابێ نەك لەسەر بناغەی پاکی و مەزنی ی گیان ، دۆستایەتی یەکی ساختەیەو ئەگەرچی بە پارەوپوول دەکڕدرێ ، بەڵام جێگەی باوەڕو موتمانە نابێ و لەو بابەتەیە کە هەر هێندەی پێویستیت پی ی هەبوو، وەك نەبووبێ وەهایە . هەروەها خەڵکی چەندە سڵ لە خراپەکردن لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکەنەوە کە لێ یدەترسن ، هێندەش بۆ خراپەکردن لەگەڵ ئەو کەسەدا خێران کە خۆی لە لایان خۆشەویست دەکا ، چونکە خۆشەویستی بەندی زنجیرەیەك پەیوەندی ی ئەوتۆیە کە دەشێ لە ئەنجامی خۆپەرستی ی خەڵکەکەداو لەهەر وەختێکدا کە پساندنی سوودو بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بێ هەرەس بێنێ ، لە کاتێکدا ترس بەندی سڵ کردنەوەیە لە سزادان و ئەم سڵ کردنەوەیەش کەم جار لە کار دەکەوێ .

لەگەڵ ئەوەشدا میر ئەگەر خۆشەویستی ی بۆ مسۆگەر نەکرا ، لە سەری پێویستە ترسەکە بە شێوەیەك بسەپێنێ کە خۆی پێ لە رق وکینەی خەڵکی بەدوور بگرێ ، چونکە دەگونجێ کە ترس و نەبوونی رق وکینە شان بە شانی یەکتر برۆن . ئەو میرەی دەسدرێژی ناکاتە سەر ژن و ماڵ و موڵکی هاوولاتی یەکانی ، دەتوانێ ئەو شتانەش دەسگیر بخا . بەڵام وەختێ ناچاری زەوتکردنی ژیانی مرۆڤێك دەبێ ، پێویستە بەهانەیەکی پەسەندو هۆیەکی ئاشکرای بە دەستەوە بێ . بۆیە بەر لە هەموو شت پێویستە خۆی نەدا لە زەوتکردنی ماڵ و موڵکی خەڵکی لەبەرئەوەی مرۆڤ لەنێ بیرچوونەوەی مردنی باوکی لا ئاسانترە وەك لە فەرامۆش کردنی لەدەس چوونی میرات و بۆ ماڵ و موڵکی ، جگە لەوەی کە بەهانە بۆ زەوتکردنی ماڵ و موڵك هەردەم لە کایەداس هەیەو ئەو کەسەی ژیان بە راووڕووتکردن دەس پێ بکا ، بەهانە بۆ رووتاندنەوەی بە

کەسانی‌تر دەدۆزێتەوە ، لە کاتێکدا بەهانە بۆ لەناوبردنی ژیانیان دەگمەنەو زووشر دەپووکێتەوە .

بەلاّم میر وەختیّ لەگەلّ لەشکرەکەیدا دەبیّو ژمارەیەکی زۆر سەرباز هەلّدەسوورێنیّ ، پێویستەو ناچاری‌یە کە زۆر گویّ نەداتە دابڕینی لەقەبی دلّڕەق لە لایەن خەلّکەکەوە بە سەریدا ، ئەو بەبیّ ئەم ناوبانگە ستەمە بتوانیّ لەشکرەکەی بە یەکگرتوویی‌و ملدان بۆ ڕێك‌وپێکی‌و ئەرکی سەرشان بهێلێتەوە . ئەمە یەکێك بوو لە سیفەتە گرنگەکانی هانیبالّ[٧٦] کە ئەگەرچی سەرکردایەتی‌ی لەشکرێکی گەلیّ گەورەی پێك‌هاتوو لە چەندین نەژادی لەیەك‌جیای دەکردو لە ولاّتێکی بێگانەشدا دەجەنگان ؛ کەچی هیچ ناکۆکی‌یەکیان نەدەکەوتە نێوانەوە ، یا هیچ یاخی‌بوونێکیان لە رووی میردا چ لە رۆژانی خۆش‌بەختی‌و چ لە ماوەی بەدبەختیدا لیّ نەدەوەشایەوە . ئەمەش تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەربەزەیی‌یە لە توانای مرۆڤ بەدەرەی کە دەینواند . ئینجا ئەو سیفەتەی لە پالّ چەندین سیفەتی چاکی‌تریدا ، لەبەر چاوی سەربازەکانی کردیانە مرۆڤێکی هەردەم بەهەیبەت‌و ترسێنەر ، بگرە ئەگەر ئەم سیفەتەی تێدا نەبووایە ، سیفەتەکانی‌تری لە وزەیاندا نەدەبوو ئەو ئەنجامە بیەخشن .

ئەو نووسەرانەی لە بیرکردنەوە بیّ‌بەشن ، وای بۆ دەچن کە لە لایەکەوە بەتان‌وپۆی کارەکانیدا هەلّبدەن‌و لە لایەکی تریشەوە تانووت لە هۆیە سەرەکی‌یەکەی ڕێگا خۆش‌کردن بۆ ئەو کارانەی بدەن .

گومانی تێدا نی‌یە ئەو راستی‌یەی دەرم‌بڕی‌و وتم کە رەنگە سیفەتە چاکەکانی‌تر بەس نەبن ، لە مەسەلەی شیپیۆدا (کە نەك تەنیا بۆ سەردەمی خۆی ، بەلّکوو بۆ هەر سەردەمێك کە بیرەوەری‌ی ئەوی تێدا زیندوو بیّ بەبانگە) بە ئاشکرا دەردەکەویّ . ئەوەبوو لەشکرەکەی لە ئیسپانیادا لیّ‌ی یاخی بوو ، ئەم یاخی‌بوونەش ئەنجامی نواندنی لوتف‌و دلّنەرمی‌یەکی زیاد لە پێویست بوو کە بووە هۆی ماوەدان بە سەربازەکانی بۆ شتی وەها کە لەگەلّ سیستمی سەربازیدا نەگونجیّ ، تا تەنانەت فابیۆس مەکسیمۆس[٧٧] لە کۆبوونەوەیەکی کۆنگرێسی پیراندا لەسەر ئەوە لۆمەی کردو بە

تۆمەتی گەندەڵکردنی سەربازانی لەشکری رۆمانەکان گوناهباری کرد . هەروەهاوەختێ یەکێك لە ئەفسەرەکانی (لوکری)ی تێکشکاند ، ئەفسەرەکە نەیکرد بە دوایدا تۆڵەوەسێن بێ ، هەروەکوو شیپیۆ خۆیشی ئەو ئەفسەرەی لەسەر ئەو کردەوەی دڵنەرمی یە سزاَ نەدا . لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەس لە کۆنگرێسی پیراندا حەزیان دەکرد بیانوو بۆ کردەوەکانی بهێننەوەو دەیانوت کە زۆر کەس هەن چاکتر دەزانن خۆیان لە هەڵکردن بپارێزن وەك لەوەی هەڵەی کەسانی تر راست بکەنەوە . ئەم هەڵوێستە بۆ شێواندنی ناوبانگی شیپیۆ بەس دەبوو ئەگەر لە ژێر سایەی کۆنگرێسی پیراندا نەژیایە . ئەو سیفەتە زیانبەخشەی نەك هەر بوو بە ژێرەوەو کەلاکەوت ، بەڵکوو بۆیشی بووە مایەی سەربەرزی .

من قسەکانم سەبارەت بە باسی ترس و خۆشەویستی بەوە کۆتایی پێدێنم کە دەڵێم : خەڵکی بەپێی حەزو ئیرادەی تایبەتی ی خۆیان خۆشەویستی یان لا پەیدا دەبێ ، بەڵام بەپێی حەزو ئیرادەی میر ترسیان لێدەنیشێ . میری ژیریش ئەو میرەیە کە پشت بە دەسەڵاتی ناو چنگی خۆی دەبەستێ نەك بە دەسەڵاتی ناو چنگی کەسانی ترو ئیتر تەنیا هێندەی لەسەر پێویست دەبێ کە شەخسی خۆی لە رق وکینەی خەڵکی بەدوور بگری ، وەك لەوەبەر روونم کردەوە .

●



# ئایا میر دەبێ چۆن بەڵێن بەرێتە سەر؟

گومانی تێدا نی‌یە هەر مرۆڤێك دەزانێ کە دەبێ سیفەتە چاکەکانی میر بریتی بن لەوەی لە بەڵێنەکانیدا راستگۆ بێ‌و بە شەرافەتمەندی‌و سەربەرزی‌یەوە بژی نەك بە فرت‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازی : بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، تاقیکردنەوەکانی ئەم سەردەمەمان سەلماندویانە کە ئەو میرانەی کاری گەورەو مەزنیان لێوەشاوەتەوە، زۆر بایەخیان بە بەڵێنەکانیان‌و بە وەفاداری بۆیان نەداوە ، بەڵکوو بە فرت‌وفێڵ‌و قوماربازی‌و بە گاڵتەکردن بە ئەقڵی خەڵکی‌و سەر لێشێواندنیان ، توانیویانە لە ئەنجامدا بەسەر ئەو هاوشانانەیاندا کە دڵسۆزی‌و وەفاداری‌یان بۆ خۆیان کردۆتە قوبلەنما ، سەر بکەون .

تۆ پێویستە بزانیت کە دوو رێگەت بۆ شەرکردن لەبەر دەمدایە ، یەکەمیان بە هۆی قانوونەوەو دووەمیان لە رێگەی هێزەوە کە دیارە ئادەمیزاد پەنا دەباتە بەر یەکەمیان‌و ئاژەل پەنا دەباتە بەر دووەمیان . بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسایی‌یە کە رێگەی یەکەمیان بەس نەبێ بۆ بەدی‌هێنانی ئامانج ، ئەوا مرۆڤ لە ئاکامیدا ناچار دەبێ پەنا بەرێتە بەر رێگەی دووەمیشیان . بۆیە بۆ میر پێویستە بزانێ چۆن هەردوو شێوەکە پێکەوە بەکار دەهێنێ ، واتە ئەوەی مرۆڤ‌و ئەوەی ئاژەڵیش . ئەمە ئامۆژگاری‌یەکی نووسەرە دێرینەکانیشە بۆ حوکمرانان لە رابوردوودا‌و نموونەیان لەسەر ئاخیل‌و چەندانێکی‌تر لە میرە کۆنەکان هێناوەتەوە کە چۆن بۆ پەروەردەکردنیان بە

کانتووری[٧٨] ئەفسانەیی (شیرۆن) سپێردراون تا ڕێوشوێنی ئەو بگرنە بەر . دیارە مەبەست لەم ڕەمزە ئەفسانەیی‌یە نیوە مرۆڤ‌و نیوە ئاژەڵە ،. ئەوە بووە کە میر دەبێ لە هەردوو سروشتی مرۆڤانەو ئاژەڵانەوە شت فێر ببێ ، چونکە هیچ کامیان ناتوانێ بەبێ ئەوی تریان بژی .

هەروەها ئەو میرەی خۆی بۆ فێربوونی چۆنێتی کردارو کردەوەی ئاژەڵ بەناچار دەبینێ ، پێویستە لەیەك کاتدا لاسایی ڕێوی‌و شێریش بکاتەوە ، چونکە نە شێر دەتوانێ خۆی لە تەڵە بپارێزێ‌و نە ڕێوی‌یش دەتوانێ لە رووی گورگاندا پارێزگاری لە خۆی بکا . لەبەر ئەوە ناچار دەبێ ببێتە ڕێوی تا تەڵە بناسێتەوەو ببێتە شێر تا گورگ بتۆقێنێ . بەڵام ئەوەی وەهای حەز لێ‌یە کە هەر بە تەنیا شێر بێ‌و هیچی‌تر ، باشی بۆ ناچێ . حوکمرانی زیرەك‌و وردبین کاتێ دەبینێ وەفاداری بۆ بەڵێنەکەی بۆی دەبێتە مایەی زیان‌گەیاندن بە سوودو بەرژەوەندی خۆی‌و ئەو هۆیانەشی ناچاری ئەو بەڵێندانەی کردبوون لە گایەدا نەماون ، دەبێ بەڵێنەکە لە ئەستۆی خۆی دابماڵێ . دیارە ئەگەر خەڵکی هەموو دڵپاك بوونایە ، ئەم ڕایە نیازپاك دەرنەدەچوو . بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکەکە چەوت‌و دڵپیسن‌و ئەوانیش لە لای خۆیانەوە بەڵێنی خۆیان ناپارێزن ، ئەوا تۆش لە ڕووی ئەواندا بەندی بەڵێن‌پاراستن نابیت . ئەو میرەشی دەیەوێ هۆی ڕەوا بۆ بەدی‌هێنانی ئەم ئامانجە بدۆزێتەوە ، قەت پەکی ناکەوێ‌و دەتوانێ چەندین هۆی جۆراوجۆری لە هەمە ڕەنگە بۆ خۆدزینەوە لە بەڵێنەکەی بخاتە پێش چاو . پیاو دەتوانێ گەلێ نموونەی لە ژمارەنەهاتووی هاوچاخ بۆ ئەم ڕاستی‌یە بێنێتەوەو دەری بخا کە چەند جار میران پشتیان لە باوەڕنامەی ئاشتی کردەوەو پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوەو چەند جار ئەنجامی خۆدزینەوەیان ، بەڵێنەکانیان لە بایەخ کەوتوون . هەروەها بیسەلمێنێ کە چۆن ئەوانەی بە باشی توانیویانە لاسایی ڕێوی بکەنەوە ، لە کەسانێکی تر سەرکەوتوتر بوون . بەڵام ئەو میرەی ئەم سیفەتەی تێدابێ ، پێویستە زۆر وەستایانە لە خەڵکەکەی حەشار بداو بلۆفچی‌یەکی گەورەو دووڕوویەکی لێ‌هاتوو بێ . خەڵکی بە تەبیعەت هێندە سادەو ساکارن کە ئاسایی مل‌کەچی پێداویستی‌یەکانی ڕۆژانە دەبن ، بۆیە ئەو کەسەی لە فرت‌وفێڵدا دەستی باڵا بێ ،

هەردەم کەسانێك دەبینێتەوە ئەو فرتوفێڵەیان بە سەردا تێبپەڕێنێ .

من لێرەدا تەنیا یەك نموونەی هاوچاخ دەگێڕمەوە . پاپا ئەلیکساندەری شەشەم ، لە خەڵەتاندنی خەڵکی **بەولاوە** نەدەکردو لەوە زیاتر بیری لە هیچشتێکی تر نەدەکردەوە . هەمیشە هەلی سەرکەوتنیشی بۆ فرتو فێڵەکانی خۆی دەبینییەوە ، چونکە هیچ کەسێك لە بەڵێندانو دووپاتکردنەوەی سووربوون لەسەریانو بە سوێند خواردنیش بە حەوت مەزەب ، لەو چالاکتر نەبوو . لەکاتێکدا لە خۆلێدزینەوەشیدا هیچ کەسێك هێندەی ئەو چابووك نەبوو . کەچی هەمیشە لە فرتوفێڵکردندا سەرکەوتوو دەبوو ، چونکە لە هەڵسووڕاندنی کاروباردا بەم شیوەیە قاڵ بووبوو .

بە هەرحاڵ ، وەنەبێ بوونی گشت ئەو سیفەتانە پێکەوە لە میرێکدا پێویست بێ ، بەڵام بەلایەنی کەمەوە پێویستە خۆی وەها نیشان بدا کە هەموویانی تێدا هەن . بگرە لەوانەیە بوێرم بڵێم کە بوونی ئەم سیفەتانە بەراستیو لە سەرڕۆیشتنیان بە بەردەوامی رەنگە بیخەنە بەر مەترسییەوە ، لەکاتێکدا خۆنیشاندان بە بوونیان زۆر جار دەبێتە کارێکی سوودبەخش . بەم پێیە راستە چاکتر وایە خۆت وەها نیشان بدەیت کە بەرەحمیتو بەڵێن دەپارێزیتو خاوەنی هەستێکی مرۆڤانەی بێگەردیتو دڵسۆزیتو بە دینیتو بگرە بەراستییش ئەم سیفەتانەت تێدا هەن ، بەڵام دەبێ خۆت بۆ ئەوەش ئامادە بکەیت کە لە کاتی پێویستیدا خاوەنی سیفەتە پێچەوانەکانیشیان بیت . دەبێ بزانرێ کە میر ، بەتایبەتی تازەمیر ، ناتوانێ گشت ئەم شتانەی کە لە لای خەڵکی پەسندن بگرێتەخۆ ، چونکە وەختێ سەیر دەکا ئەو دەبێ پارێزگاری لە دەوڵەتەکەی خۆی بکا ، ناچار دەبێ بە پێچەوانەی وەفادارییەوە بۆ بەڵێنو بۆ بەرەحمیو مرۆڤپەروەریو بۆ دیانەت کردار بکا . لەبەر ئەوە لە سەری پێویستە ئەقڵی خۆی ئامادەی هەڵسووڕان بە پێی حەزی شەپۆل بکاو بەو شێوەیەشی کە جیاوازیی هەم کۆششو هەم خۆشبەختی دەیهێنێتە کایەوە . واتە وەك وتم ، ئەگەر بۆی لوا با پشت نەکاتە خێرخوایی ، بەڵام بە مەرجێك کە ئەگەر تەنگەتاوو ناچار کرا **کۆ لە خراپەکاریو** شەڕخوایی نەکاتەوە .

هەروەها میر دەبێ لەوەدا وریا بێ کە لە قسەکردندا ، خۆی لەگەڵ ئەو پێنج سیفەتەدا کە ئیشارەتم پێدان نەخاتە ناکۆکی‌یەوە . دەبێ خەڵکەکە وەهاملێ بکا کە بەرەحمی‌و وەفاداری بۆ بەڵێن‌و مەردایەتی‌و مرۆڤپەروەری‌و دینداری‌ی لەلا بە بینین‌و بە بیستن وەك یەك هەست پێ‌بکەن . خۆ رەنگە ئەم سیفەتەی دواییمیان لە هەموویان پێویست تر بێ ، چونکە خەڵك بە گشتی بە چاو زیاتر نوقورچ دەگرن وەك لە دەست . هەروەکوو هەموو بە بینین دەبینن ، بەڵام کەمیان بە هەست‌کردن هەست دەکەن . واتە خەڵکەکە هەموو بە چاو دەبینن تۆچی دەکەیت‌و چۆن دەنوێنیت ، بەڵام کەمیان هەست بە باری راستەقینەت دەکەن‌و ئەم کەمەش کە بۆ پارێزگاری‌کردن لە خۆیان پشت بە هەیبەتی دەوڵەت دەبەستن ، لە بەربەرەکانی‌کردن لەگەڵ رای گشتیدا دوودڵ‌و رارا دەبن . بێگومان لە کردارو رەفتاری گشت خەڵکیداو بەتایبەتی میرەکان ، ئامانج شێوەی بەجێ‌هێنان بێ‌گوناه دەکا (الغاية تبرر الواسطة)و ئەمەش راستی‌یەکەو دەرهاویشتنی تێدا نی‌یە . بۆ نموونە میر ئەگەر نیازی داگیرکاری‌ی هەبوو ، دیارە دەبێ ئەو دەوڵەتەی داگیری دەکا لە ژێر چنگی خۆیدا بهێڵێتەوە کە ئەوسا خەڵکەکە هەموو بەم کردارەیدا هەڵدەدەن‌و بە نموونەی شەرافەتمەندی‌ی دادەنێن ، چونکە خەڵکە رەشۆکی‌یەکە پیشەیانە کە بە تەنتەنەو عەنعەنەو ئەنجامەکانی هەر کاساتێك هەڵبخەڵەتێن . ئاشکرایە جیهانیش بە گشتی لە خەڵکی رەشۆکی پێکدی‌و ئینجا لە گەڵیاندا کەمەکە کەسانێکی نارەشۆکی کە وەختێ را گشتی‌یەکە شتێك لە میرەکەیاندا دەبینن‌و بۆی مۆر دەکەن ، ئەمان لێ‌یان دابڕ دەبن . بۆ نموونە ئێستا میرێك هەیە کە لەم سەردەمەماندا دەژی‌و چاکتر وایە ناوی نەبەم ، سەری زمانی‌و بنی زمانی بانگ‌راهێشتنە بۆ ئاشتی‌و وەفاداری بۆ پەیمان‌و بەڵێن ، کەچی لە راستیدا دوژمنی باوەکوشتەی ئەو دوو شتەیە . جا ئەگەر لە چارەی بنووسرایە کە هەر کام لەو دووانەی بگرتایەتە خۆی ، ئەوا زۆر جار تووشی ئەوە دەبوو کە دەوڵەتەکەو ناوو ناوبانگی خۆی لەدەس بدا .

●

**١٩**

# لەسەرمان پێویستە کە خۆمان لە ڕیسوابوون و ڕق لێبوونەوە بەدوور بگرین

لەبەر ئەوەی لەوەپێش لە گرنگترینی ئەو سیفەتانە دوام کە بەندی ئەم باسەن ، ئێستا بە کورتیو بە شێوەیەکی گشتی باسی پاشماوەکەیان دەکەم . ئەوەبوو وتم کە میر دەبێ تەقەلا بدا خۆی لە ڕیسوابوونو رقلێبوونەوە بەدوور بگرێو وەختێکیش لەم رووەوە سەرکەوتن بەدی دێنێ ، وادەکەوێتەوە کە کاری خۆی مەیسەر کردوەو ئیتر خراپەکارییەکانی تر مەترسیی بۆ دروست ناکەن.هەروەها وتم : بە شێوەیەکی گشتی ئەو لە وەختێکدا تووشی رقلێبوونەوە دەبێ کە ببێتە راووڕووتکەرێكو ماڵومولّكو ژنانی رەعیەتەکەی زەوت بکاو کە پێویستە خۆی لە. **قەرەیان نەدا** .
**ئینجا کاتێ میر خۆی لە** دەسدرێژیکردن بۆ سەر ماڵومولّكو شەرەفی جەماوەری خەڵکەکە دەپارێزێ ، دەبینێ ئەوانیش بە رەزامەندیو قایلبوونەوە دەژینو ئیتر تەنیا رووبەرووی تەماعی هەندە کەسێك دەوەستێتەوە کە دەتوانێ بە زۆر ڕێوشوێنی جۆراوجۆر جلەویان بگرێو بیانخاتە ژێر ڕکێفەوە . هەروەها ئەگەر خەڵکەکە بێباریو چڵێتیو موخەنەتیو ترسنۆکیو لاڵانەوەیان لە میر بینی ، دەشێ بە نەگریسو چەپەڵی بدەنە قەڵەم . جا لەبەر ئەوەی ئەم کاروکردارانە بۆی دەبنە بەردی بناغەی مەترسی ، دەبێ خۆیانی لێبەدوور بگرێو

کاروباری خۆی وەها ساز بدا کە کردەوەکانی ئەوپەڕی مەزنی‌و چست‌وچالاکی‌و ورەپتەوی‌و خۆراگری بنوێنن . هەروەکوو سەبارەت بە حوکمکردنی رەعیەتەکەشی ، دەبێ ئەو بڕیارەی دەیدا ببڕای‌ببڕ بی‌و هەڵوەشاندنەوەی بۆ نەبێ ، دەبێ سوور بێ لە سەر بڕیارەکانی خۆی‌و ماوە بە هیچ مرۆڤێك نەدا بیخەڵەتێنێ‌و فێڵی لێ‌بکا .

ئەو میرەی ئەم ناوو نابانگە بۆ خۆی پەیدا دەکا ، لای رەعیەتەکەی دەبێتە خاوەنی شۆرەتێکی گەورەوگران ، ستەمیشە خەڵکی بتوانن پیلان دژی خاوەن شۆرەت‌و ناوبانگێکی وا گەورەوگران بگێڕن ، هەروەکوو زەحمەتە بتوانرێ پەلاماری بدرێ ، بەتایبەتی کە بە خاوەن دەسەڵات‌و رێزلێگیراو لە لایەن رەعیەتەکەیەوە ناسرابێ . بەڵام میر دەبێ لە دوو لایەنەوە ترسی هەبێ . یەکەمیان ناوخۆیی‌یەو بەندی رەعیەتەکەیەتی‌و دووەمیان دەرەوەیی‌یەو بەندی دەوڵەتە بێگانەکانە . جا ئەو بە بوونی چەکی بەهێزو دۆستی دڵسۆز کە ئەم جۆرە دۆستانە ئەگەر چەك‌و هێز هەبن زۆرن ، هەردەم دەتوانێ خۆی لە دەسدرێژی‌کردنی بێگانە بۆ سەری بپارێزێ . بەم پێیە بەرەی ناوخۆ ئەگەر پیلانگێڕان ئاشووبی تێدا نەنێنەوەو ئەگەر لە دەرەوەشەوە دەسدرێژی نەکرێتە سەر ، هەمیشە هێمن دەبێ ، بگرە ئەگەر دەوڵەتە بێگانەکانیش تەقەلای پەلاماردانی بدەن ، ئەو دەتوانێ — ئەگەر حوکمرانی‌یەکەی‌و ژیانی بەو رێبازەدا رۆیشتبن کە باسم‌کردن‌و ئەگەر توانی‌یشی لە سەر ئەو هەڵوێستە خۆی رابگرێ — بەرگەی هەر جۆرە شڵەقاندنێك بگرێ ، وەك چۆن نابیسی سپارتایی کە لەوەبەر ئیشارەتم پێدا کردی . بەڵام سەبارەت بە رەعیەت ، تەنانەت ئەگەر نەشکەونە ژێر تەئسیری بێگانەوە ، مەترسی‌ی ئەوەیان هەر لێدەکرێ کە بە شێوەیەکی نهێنی پیلانی لە دژبگێڕن . بۆیە میر دەبێ بە باشی خۆی لەمەیان بپارێزێ ، ئەویش بە خۆبەدوورگرتن لە رق‌وکینەیان‌و لە سووك‌و ریسوابوون لەبەر چاویان‌و بە فەرامۆش‌نەکردنی رەزامەندی‌یان بەرامبەر مامەڵەکردنی لە گەڵیاندا کە ئەمە ئەرکێکی ناچاری‌یەو دەبێ بەجی‌ی بێنێ ، وەك لەوەبەر بە دووردرێژی لە بەشێکی‌تردا روونم کردەوە . رەنگیشە چاکڕین چارەسەر بۆ خۆپاراستن لە پیلان ئەوەبێ کە میر لەلایەن جەماوەری گەلەکەیەوە نەبوغزێنرێ ، چونکە ئەو کەسەی پیلان دەگێڕێ وایدادەنێ کە بە کوشتنی

میرگەل رازی دەکا . بەڵام ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەو بەم کارەی خراپە لەگەڵ گەلدا دەکا ، ئەوا لە خۆتێوەگلاندنی پرۆژەیەکی وەهادا دوودڵ دەبێ ، لەبەر ئەوەی کە ئەو گرفتانەی **پیلانگێڕەکان** تووشیان دێن لە ژمارە نایەن . تاقیکردنەوەکانی لەوەبەریش بۆمان دەردەخەن کە لە رابوردوودا گەلێ پیلان کراون ، بەڵام کەمیان سەریان گرتوە ، چونکە پیلانگێڕ لە ناو کەسانی بێزارو کینەلەدڵدا نەبێ ناتوانێ هاوڕێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە . تۆ کە نیازی دڵی خۆت لای مرۆڤێکی بێزار دەردەخەیت ، حەوانەوەیەك بە دڵ و دەروونی دەبەخشیت و هیوای دەسگیربوونی خواست و مەبەستەکەی خۆی لەلا دەژێنیتەوە . ئیتر ئەو دەشێ تەنیا بە پێزانینی هەواڵەکە دڵی ئاو بخواتەوەو وای ببینێ کە هەندێ سوودی لێ چاوەڕوان بکا . لە کاتێکدا بە دیوەکەی تریدا وایدادەنێ کە بەشداربوونی بە کردەوە ، رێگایەکی پڕ لە مەترسی و گومانە . ئینجا ئەو بۆ ئەوەی لە گەڵتدا بەشداربێ و لە بەشداربوونەکەیدا راستگۆبێ ، دەبێ یەکێك بێ لەم دووانە : یا دۆستێکی هێجگار دڵسۆز بۆ تۆ ، وەیا دوژمنێکی باوەکوشتەی میر . من بۆ روونکردنەوەی باسەکە بە چەند وتەیەك دەڵێم : پیلانگێڕ لە ترس و حەسوودیبردن و گومانکردن و تۆقین لە سزا بەولاوە کە دڵی دێننە لەرزە ، چی تر لە تەك خۆیدا نابینێ ، لە کاتێکدا میر هەیبەتی حوکمڕانیکردن و یاساو پاراستنی لەلایەن هاوڕێیان و دەوڵەتەوە کە بۆی دەبێتە پاسەوان ، لە پاڵ خۆیدا دەبینێ و خۆ ئەگەر نیازپاکیی گەلیشیان خستنە پاڵ ، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ستەمە هیچ مرۆڤێك توانای سەرکێشیکردن بۆ پیلانگێڕان لە خۆیدابینێ ، چونکە بە شێوەیەکی گشتی پیلانگێڕ لەم حاڵەتەدا دەبێ پێش جێبەجێکردنی پیلانەکەی لە دوژمنایەتی گەل بترسێ ، تەنانەت ئەگەر تاوانەکەشی سەربگرێ هێشتا هەر مەڵبەندێکی ئەوتۆ نابینێتەوە لە توورەیی گەل بیپارێزێ .

رەنگە نموونە لەسەر ئەمە زۆر بن ، بەڵام من تەنیا یەك کارەسات دەگێڕمەوە کە لە رۆژانی باوکانماندا رووی داوە ، ئەویش ئەوەیە کە وەختێ پیلانگێڕەکانی بنەماڵەی کانیشی ، بەڕێز هانیبال بێنتیڤۆگلیی میری بۆلۆناو باپیری میری ئێستا بەڕێز هانیباڵیان کوشت و میری کوژراو لە بەڕێز جیۆڤانی [٧٩] بەولاوە کە منداڵ بوو ، هیچ

کەس‌وکارێکی تری نەبوو ، سەرجەمی گەلی بۆلونا راپەڕین‌و یەك‌بەیەکی بنەماڵەی کانیشی‌یان کوشتەوە . دیارە ئەم هەڵوێستە ئەنجامی خۆشەویستی‌و لایەنگیری‌کردنی گەل بوو بۆ بنەماڵەی بێنتیڤۆگلی‌و ئەو خۆشەویستی‌یە،گەلەکەی هان‌دا کە دوای کوشتنی هانیبال‌و دوای ئەوەی کەسێکیان لە بنەماڵەکەی بۆ نەبینرایەوە فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست ، بکەونە گەڕان‌و پشکنین هەتا یەکێکیان دۆزی‌یەوە کە لە فلۆرنسادا دەژیاو باوکی ئاسنگەرێك بوو ، پەیوەندی‌یەکی خزمایەتی‌ی لەگەڵ بنەماڵەکەدا هەبوو ، ئەوسا هێنایان‌و دەزگای فەرمانڕەوایی شارەکەیان دایە دەست تا ئەو وەختەی جیۆڤانی بالق دەبێ‌و دەتوانێ حوکمڕانی‌ی شارەکە بکا .

لەمەوە من ئەو ئەنجامە دەسگیر دەخەم کە میر ئەگەر گەل لی‌ی رازی بوو ترسی پیلان لەدژگێڕانی نابێ ، بەڵام ئەگەر هەستی کرد دەیبوغزێنێ‌و دوژمنایەتی لە گەڵدا دەکا ، لە سەری پێویستە ترسی لە هەموو مرۆڤێك‌و هەموو شتێك هەبێ . بۆیە ئاسایی وا رۆیشتوە کە دەوڵەتە رێك‌وپێکەکان‌و میرە ژیرەکان ، بە سەرێك نەیان هێشتوە سەردارەکان بگەنە رادەی دەسەڵاتداری‌و بە سەرێکیش گەلیان رازی کردوە‌و ئا ئەمەش گرنگترین باسێکە کە میر دەبێ بایەخی پی‌بدا .

گومانی تێدا نی‌یە کە فەرەنسا لە رێك‌وپێکی‌و لە حوکمڕانی‌کردندا لە سەردەمی ئێستاماندا ، چاکترینی دەوڵەتانە‌و ژمارەیەکی زۆر دەزگای ئەوتۆی تێدا بەدی دەکەین کە سەلامەتی‌و سەربەستی‌ی پادشایانی لەسەر راوەستاوە‌و لە پێشی ئەو دەزگایانەشەوە ، پەرلەمان‌و دەسەڵاتەکەیەتی کە دیارە ئەو کەسەی مەملەتەکەی دامەزراندوە ، ئاگاداری تەماع‌و سەرکێشی‌ی سەردارە گەورەکان بووە‌و بە پێویستی زانیوە بۆ جڵەوگیرکردنیان لغاوێك بخاتە دەمیانەوە . هەروەکوو لەولای ترەوە ، دەرکی بەوە کردوە کە جەماوەری گەل چ رق‌وکینەیەکی دارێژراویان لەسەر بناغەی ترس ، بەرامبەر بەو سەردارە گەورانە لە دڵدایە . ئینجا بۆ ئەوەی دڵنیایی‌یان پی‌ببەخشێ ، ویستوێتی پادشا لەم باسە رزگار بکاو نەیەڵێ ببێ بە کوڵکی ئەوەوە ، تا لە حاڵەتی رازی‌کردنی گەلدا لە نارەزایی سەردارەکان بیپارێزی‌و لە حاڵەتی رازی‌کردنی سەردارەکانیشدا لە نارەزایی گەلی بەدوور بگرێ . بۆ ئەم مەبەستەش هات قازی‌یەکی

سی‌یەمی دانا کە لە لایەکەوە مل‌کەچی فەرمانی راستەوخۆی پادشا نابیّ‌و لە لایەکی ترەوە گەورەپیاوان جڵەوگیر دەکاو لەولای تریشەوە دڵسوزی جەماوەری گەل دەبیّ.
جا بە راستی هیچ ریّگایەك بۆ زامنکردنی سەلامەتی‌ی پادشاو مەملەکەت، لەم ریّگایە بە حیکمەت‌ترو هیچ پیّشکاری‌یەك لەم پیّشکاری‌یە سوودبەخش‌تر نابیّ کە دەتوانین ئەو بنەما گەورەیەشی لیّ پوختە بکەین کە دەڵیّ: لەسەر میر پیّویستە ئەو ئەرکانەی لای گەل خۆشەویستن بە کەسانیّکی‌تری بسپیّری‌و خۆیشی تەنیا خەلاّت‌و سۆز ببەشیّتەوە. هەروەها لیّرەدا دەمەویّ ئەو قسەیەشم دووپات بکەمەوە کە وتوومە میر دەبیّ ‌ریّزی سەردارانی مەملەکەتەکەشی بگریّ، بەلاّم بە مەرجیّك ئەم ریّزلیّگرتنەی نەبیّتە هۆی بزواندنی رق‌وکینەی رەعیەتەکەی بەرامبەری.
لەگەلّ ئەوەشدا رەنگە هەندیّك وای بۆ بچن کە زۆر نموونە لە میّژووی ئیمپراتۆرەکانی‌رۆمانەکان‌وسەرگوزشتەی ژیان‌و مردنیاندا هەن سەرانسەر بەرپەرچی ئەم رایەی من دەدەنەوە، بەتایبەتی کە ژمارەیەك لەو ئیمپراتۆرانە سەرەرای ژیانی سەردارانەیان‌و بەهیّزی لە شەخسی‌یەتیاندا، دەسەلاّتیان لەدەس چووە، یا رەعیەتەکەیان پیلانیان لە دژ گیّراون‌و کوشتویانن. بەلاّم من بۆ وەرامدانەوەی ئەم بەربەستی‌یانە، باسی سیفەتەکانی هەندیّ لە ئیمپراتۆرەکان دەکەم‌و دەیسەلمیّنم کە هۆی هەرەس‌هیّنانیان جیاواز نەبووە لەو بنەمایانەی من دەسنیشانم کردن. هەروەکوو بە دمی‌یەوە لەو کاروبارانەش دەکۆڵمەوە کە ئەو کەسەی دەفتەری ئەو رۆژگارە دەخویّنیّتەوە، دەبیّ سەرنجیان بداتیّ. من تەنیا لەو ئیمپراتۆرانە دەدویّم کە لە سەردەمی مارکۆسی فەیلەسووفەوە تا سەردەمی مەکیمینیۆس حوکمرانی‌یان کردووە بریتین لە مارکۆس‌و[80] کۆمۆدۆسی[81] کوری‌و بیرتیناکس‌و[82] جۆلیانۆس‌و سیڤیرۆس‌و ئەنتۆنیۆس‌و کاراکالای[83] کوری‌و ماکرینۆس‌و[84] هیلیۆگابالۆس‌و ئەلیکساندەرو[85] مەکسیمینیۆس.[86] یەکەم شتیش کە دەبیّ لەم لیّدوانەدا سەرنجی بدەینیّ ئەوەیە کە لە کاتیّکدا میرەکانی‌تر لە سەریان بووە بایەخ بە زیادەخوازی‌ی گەورەپیاوان‌و چەتوونی‌ی گەل بدەن. ئیمپراتۆرەکانی‌رۆمانەکان رووبەرووی گرفتی سی‌یەم دەبوونەوە کە بریتی بوو لە پشتگیری‌کردنی ئەو دڵرەقی‌و تەماعکاری‌یەی لە

سەربازەکانیان دەوەشانەوەو بەو شێوە توندوتیژەشی کە دەیانکردن‌و ئەمە دەبووە هۆی لەسەرتەخت‌لادانی گەلێ لە ئیمپراتۆرەکان ، چونکە بۆیان نەدەکرا سەربازەکانیان‌و گەلەکەشیان لە یەك وەختدا پێکەوە رازی بکەن . گەل ئاسایی حەزی لە ئاسوودەگی‌یەو بەم پێیە مەیلی بەلای میرە بێ‌وەیەکاندا دەچێ ، لە کاتێکدا سەربازەکان ئەو میرەیان لەلا پەسندترە کە گیانێکی سەربازانەی تێدابێ‌و چەتوون . جەربەزەبێ‌و مەیلی راووڕووت بکا . ئەمان وەهای لێداوا دەکەن کە بۆ دەسگیربوونی مووچەی زیاترو بۆ ئەوەشی بەری تەماعکاری‌و دڵرەقی‌یەکەیان لێ بەرەلابێ ، ئەو سیفەتانە بەسەر گەلەکەیدا بسەپێنێ . بەم جۆرە ئەو ئیمپراتۆرانەی تەبیعەت‌و تواناو بەهرەیان ، ناوو ناوبانگێکی ئەوتۆیان پێ‌نەبەخشیون کە بتوانن هەردوو لای پێ جڵەوگیر بکەن ، چارەنووسیان خاپووربوون بووە . جا زۆربەی ئەوانەی گەیشتوونەتە پلەی ئیمپراتۆر ، لەبەر ئەوەی هێشتا تازەکوورە بوون‌و سڵیان لەو گرفت‌و زەحمەتی‌یانە کردۆتەوە کە لەم دوو مەیلە دژبەیەکە دەوەشێنەوە ، ئەگەرچی هەوڵیان‌داوە سەربازەکانیان رازی بکەن ، بەلام کەم بیریان بە لای ئازاردانی گەلدا چووە . لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبوو لە ئەنجامداو بە ناچاری لایەکیان هەڵبژێرن‌و خۆیان لە رق‌وکینەو توورەبوونی بپارێزن . دیارە یەکەمجار دەبوو پەنا بەرنەبەر هەر رێ‌وشوێنێك کە بتوانێ لە رق‌وکینەی جەماوەری گەل بەدووریان بگرێ . بەلام وەختێ ئەمیان بۆ بەدی‌نەدەهێنرا ، ناچار دەبوون خۆیان لە رق‌وکینەی لایەنە بەهێزو کاریگەرەکە بەدوور بگرن . بۆیە ئەو ئیمپراتۆرانە ، بە هۆی تازەکوورەیی‌یەکەیانەوە لە پایەوپلەکەیاندا ، وایان هەست دەکرد کە پێویستیان بە سۆزێکی تایبەتی‌ی هێجگار زۆر هەیەو لە ئاکامیدا ، لە بری گەلەکەیان خۆیانیان بەندی حەزوئارەزووی سەربازەکانیان دەکرد . بێگومان چاکی‌و خراپی‌ی ئەم سیاسەتە لەسەر ئەوە دەوەستێ کە ئایا میر تا چ رادەیەك شارەزای چونێتی پاراستنی ناوو ناوبانگی خۆیەتی لەبەردەم سەربازەکانیدا؟ سا هەر لەبەر ئەم هۆیانە بوو کە مارکۆس‌و بیرتیناکس‌و ئەلیکساندەر ، سەرەرای ژیانی بێ‌فیزی‌و خۆشویستنی دادپەری‌و دژایەتی‌یان بەرامبەر بە دڵرەقی‌و بێ‌رەحمی‌و گیانی مرۆڤپەروەری‌یان‌و حەزکردنیان لە خێرخوایی ،

کۆتایی‌یەکی پڕ لە جەخار کۆتایی‌یان هات . تەنیا مارکۆس نەبێت کە لە ژیان‌و مردنیدا سەربڵندی‌ی خۆی پاراست . چونکە لە ڕێگەی مافی میراتگری‌ی خۆیەوە چووە سەر تەختی ئیمپراتۆرێتی‌و بە هیچ شتێك قەرزاری چ سەربازەکانی‌و چ گەلەکەی نەبوو . ئەمە جگە لەوەی گەلێ سیفەتی چاکەی ئەوتۆی تێدابوون کە کردیانە ئیمپراتورێکی ڕێزلێنراوو توانی بە درێژایی ژیانی ، هەردوولا لە ڕادەی خۆیاندا گیربداو تووشی هیچ رق‌لی‌بوونەوەو ڕیسوایی‌یەك نەبێ . بەڵام بیرتیناکس بە پیچەوانەی ئیرادەی سەربازەکانی‌یەوە کە لە سەردەمی کۆمۆدۆسی پێش ئەودا بە ژیانی پڕ لە داوێن‌پیسی ڕاهاتبوون ، بە ئیمپراتۆر هەڵبژێردرا . بۆیە بە لایانەوە ستەم بوو بەو شێوە پڕ لە شەرافەتمەندییە بژین کە ئەو بەسەریانیدا سەپاندو بەم جۆرە خۆی خستە بەر ڕق‌وکینەیانەوە . ئینجا ئەگەر ئەو هەستی گاڵتەپی‌هاتنەشیان بەرامبەری بە هۆی بەساڵداچوونی‌یەوە خستە پاڵ ڕق‌وکینەکە ، ئەوا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە بۆچی ئەو هەر لە سەرەتای سەردەمەکەیەوە داڕووخانی لە چارە نووسرابوو .

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دەشێ ڕق‌وکینە چەندە لە ئەنجامی کاری شەڕخواهانەدا پەیدا بێ ، هێندەش لە ئەنجامی کاری خێرخواهانەوە سەرهەڵبدا . بۆیە وەك لەوەپێش وتم پێویستە ئەو میرەی دەیەوێ دەوڵەتەکەی بە دەستەوە بمێنێ ، جاربەجارێك شەڕخواییش بکا ، چونکە وەختێك ئەو بەرەیەی تۆ لە پێناوی پاراستنی پایەوپلەی خۆتدا بوونی بە پێویست دەزانیت چەتوون دەبێ ، ئیتر سا بەرەی گەل بێ یا سەربازان یاخود سەرداران ، ئەوا تۆ بە ناچاری دەبێ خۆت بدەیت بەدەم شەپۆلەکەوەو هەوڵی ڕازی‌کردنی بدەیت کە لەم حاڵەتەدا کاری خێرخواهانەت بۆ دەبێتە کارێکی ئازاردەرو زەرەربەخش . با لێرەدا بێینە سەر باسی ئەلیکساندەر . ئەم زاتە پیاوێکی هێجگار خێرخوا بوو . تەنانەت یەکێك لەو چاکەکاری‌یە زۆرانەی لێ‌دەگێڕنەوە ئەوەیە کە دەوترێ بە درێژایی هەر چواردە ساڵی حوکمرانی‌یەکەی ، بە بێ موحاکەمەکردنێکی عادیلانە ، بڕیاری مراندنی بە سەر هیچ مرۆڤێکدا نەداوە . کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ، لەبەر ئەوەی گوایە ماوەی بە دایکی داوە جڵەوگیری بێ ، بە پیاوێکی ژنانی دراوەتە قەڵەم . بەم جۆرە داخزایە ڕادەی بێ‌هەیبەتی‌و

ریسوابوونەوەو سوپا پیلانی لەدژ گێراو کوشتی .

لە لایەکی ترەوە ئەگەر بێت و تۆ لە سیفەتەکانی کۆمۆدۆس و سیڤیرۆس و ئەنتۆنیۆس و کاراکالاو مەکسیمینۆس بکۆڵیتەوە ، بۆت دەردەکەوێ کە ئەوانە هێجگار دڵرەق و چاوچنۆك بوون و لە پێناوی رازیکردنی سەربازەکانیاندا ، کۆیان لە هیچ جۆرە ئازاردانێکی جەماوەری گەلەکەیان نەکردۆتەوە . کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان ، تەنیا سیڤیرۆسیان لێدەرچێ ، کۆتاییەکی خراپ کۆتاییان هاتوە . مەسەلەش بریتییە لەوەی ئەمیان خاوەنی گەلێ بەهرەو تواناى ئەوتۆ بووە کە یاریدەیان داوە دۆستایەتی خۆی لە سەربازەکانیدا ئیدامە پێبداو بەوپەری بەختیارییەوە حوکمرانی بکا ، ئەگەرچی میللەتەکەشی دەچەوساندەوە ، چونکە سیفەتە چاکەکانی وایان لێکرد چ لە لای سەربازەکانی و چ لە لای گەلەکەی جێگەی رێزلێنان بێ ، بۆیە لایەنی یەکەم لێی رازیبوون و دەستیان بەسنگەوە بۆ دەگرت و لایەنی دووەمیش لە بەرامبەریدا گێل و سەراسیمە بووبوون .

جا لەبەر ئەوەی کردارەکانی ئەم فەرمانڕەوایە بۆ تازەمیرێك دیارو مەزنن ، تەقەلا دەدەم بە کورتی نیشانی بدەم چۆن توانیویێتی ئەو سیفەتانەی رێوی و شێر لە خۆیدا کۆبکاتەوە کە لەوەبەر دەربارەیان وتم هەموو میران دەبێ لاسایییان بکەنەوە . سیڤیرۆس لە وەختێکدا کە لە سلافۆنیا سەرکردایەتیی لەشکری رۆمانەکانی دەکرد ، هەستی کرد کە ئیمپراتۆر جۆلیانۆس لە چ حاڵەتێکی تەوەزەلی و شل وشێواویدایە ، سەربازەکانی خۆی قایل کرد کە چاکتر وایە بۆ تۆڵەسەندنەوەی کوشتنی ئیمپراتۆر بیرتیناکس لە سەردەستی پاسەوانانی پریتۆرەکاندا [87] ، بەرەو رۆما بچن . ئیتر بەم بیانووەوەو بەبێ ئاشکراکردنی ئەو تەماعەی کردبوویە تەختی پادشایی ، لەشکرەکەی بەرەو رۆما کشاندو پێش بڵاوبوونەوەی هەواڵی دەرچوونی لە سلافۆنیا ، ئەو گەیشتە ئیتالیا . ئینجا هەر کە گەیشتە رۆما ، ئەنجومەنی پیران لە ترساندا بە ئیمپراتۆر هەڵیبژاردو جۆلیانۆسیش کوژرا . دوای ئەم دەسپێکردنە سەرکەوتووانەیە ، سیڤیرۆس پێش دەستگرتنی بە تەواوی بە سەر ئیمپراتۆرێتەکەدا ، روو بەرووی دوو گرفتی قورس بووەوە . یەکەمیان لە ئاسیادا بوو کە نیڤیرینۆس سەرکردەی لەشکرە ئاسیاییەکان

خۆی کردە ئیمپراتۆرو دوومیشیان لە رۆژئاوادا بوو کە لەوێش ئەلبینۆس تەماعی کردبووە تەختی ئیمپراتۆری . جا کە سەیری کرد زۆر جێگای مەترسی‌یە لە یەك کاتدا بە گژ هەردوولادا بچێ ، بڕیاری‌دا لەم‌لاوە پەلاماری نیڤیرینۆس بداو لەولاشەوە ئەلبینۆس بخەڵەتێنێ‌و نامەیەکی بۆ ناردو تیایدا پێیڕاگەیاند کە حەز دەکا لەو شەرەڵەدا لە گەڵیدا هاوبەش بێ کە ئەنجومەنی پیران بە هەڵبژاردنی بە ئیمپراتۆر پێی بەخشیوەو لەقەبی قەیسەری داوەتێ . بە دوایدا ئەنجومەنی پیرانیشی بە برپاردان لە سەر ئەو هاوبەشی‌یە قایل‌کردو ئەلبینۆسیش لەلای خۆیەوە باوەڕی کردو پێ‌ی هەڵخەڵەتا . ئەوسا کە سیڤیرۆس نیڤیرینۆسی شکاندو کوشتی‌و بارودۆخی لە رۆژهەڵاتدا داسەکناندەوە ، گەڕایەوە بۆ رۆماو لە ئەنجومەنی پیراندا ئەلبینۆسی بە نمەك‌حەرامی لە ئاستی ئەو نازونیعمەتەدا پێ‌ی بەخشی‌بوون‌و بە تۆمەتی پیلانگێڕان بۆ کوشتنی ئەم‌و خیانەت‌لێکردنی ، تاوانباری کردو وای نیشان‌دا کە ناچارە بچێ لە سەر ئەم سپڵەیی‌یەی سزای بدا . ئیتر ئیمپراتۆرە سەرکەوتورەکەمان بەرەو فەرەنسا کشاو لە شەرێکدا پێکدا هەڵگژان‌و لە ئەنجامیدا لە پایەوپلەو لە ژیانیش بێ‌بەشی کرد .

ئەو کەسەی بە دوورودرێژی لە کارەکانی سیڤیرۆس بکۆڵێتەوە ، بۆی دەردەکەوێ کە هەم نەڕەشێرێك بووەو هەم رێوی‌یەکی فێڵبازو هەموو لایەکیش لێ‌یترساون‌و رێزیان لێناوە . هەروەکوو سوپاکەشی لە روویدا هەستی بە رق‌وکینە نەکردوە . بەم جۆرە لێکۆڵەرەوە هیچ سەرسام نابێ ببینێ ئەم فەرمانڕەوا تازەکوورەیە توانیبێتی جڵەوی ئەو جۆرە هێزە بێ‌پەروایە بگرێتە دەست ، چونکە بۆتە خاوەنی ناوو ناوبانگێکی کاریگەری ئەوتۆ کە هەردەم لەو رق‌وکینەیەی بە دوور گرتوە کە دەبوو چاوچنۆکی‌یەکەی لە ناو گەلەکەیدا بی‌بزوێنێ . هەروەها ئەنتۆنیۆسی کوڕیشی خاوەنی گەلێ بەهرەو توانای باڵابووەو زۆر سیفەتی وەهای تێدابوون کە لەلای گەلەکەی جێگەی سەرسامی بووبن‌و لەلای سەربازانیش مایەی خۆشەویستی . ئەو بە گشت مانای وشە پیاوێکی سەربازکاری ئەوتو بووە کە قێزی لە خۆراك‌و پۆشاکی خۆش‌و نەرم‌ونۆڵ‌و نازونیعمەت‌و هەر شێوەیەکی‌تری خۆش‌گوزەرانی هاتۆتەوەو ئەوە سەربازەکانی وا لێدەکرد زۆر هۆگری ببن . کەچی لە گەڵ ئەوەشدا کابرایەکی هێندە

دڕو دڵڕەق بووە کە لەوەبەر وێنەی نەبینرابێ . چونکە دوای کوشتنی گەلێ کەسی ئاسایی ، فەرمانی بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆماو هەموو خەڵکی ئەسکەندەری‌یەشدا(٨٨) ؛ تا وای لێهات سەراپای جیهان بی‌بوغزێنن‌و دەست‌و پێوەندەکەشی ترسی لێ پەیدا بکەن . دواجار بە کوشتن بە دەستی یەکێك لە سەرکردەکانی خۆی‌و لەبەردەم لەشکرەکەیدا کۆتایی هات . لێرەدا دەبێ سەرنجمان بۆ ئەوە بچێ کە هیچ میرێك ناتوانێ خۆی لەم جۆرە مراندنە  به دەستی پیاوێکی بەعەزم‌و سەرسەخت‌و لە ئەنجامی بڕیارو نەخشەبۆدانانێکی لەوەبەردا بەدوور بگرێ ، چونکە ئەو کەسەی خۆی لە مردن ناترسێ دەتوانێ کەسانی‌تر بکوژێ . بەڵا م بەهەرحاڵ پێویستە میر لەم جۆرە کوشتنە نەترسێ ، لەبەر ئەوەی کە ئەو بابەتە پیاوانە هێجگار دەگمەنن‌و ئیتر دەمێنێتەوە سەر ئەوەی خراپەی کاریگەر لە گەڵ هیچ یەکێك لەو مرۆڤانەدا نەکا کە خزمەتی دەکەن یا لێوەی نزیکن ، وەك لە ئەنتۆنیۆسی ڕوودا کە پێشتر فەرمانی کوشتنی برایەکی ئەو ئەفسەرەی لە شێوەیەکی ناشیرینیشدا دابوو ، هەروەکوو هەموو ڕۆژێك هەڕەشەی لەویش دەکرد ، ئەگەرچی لە ڕیزی پاسەوانەکانی خۆیدا هێشتبوویەوە ، کە ئەمە وەك ڕۆژان‌و ڕووداو سەلماندیان ، گەوجی‌و سەرکێشی‌یەك بوو لەوەوە .

ئێستا با بچینە سەر باسی کۆمۆدۆس کە دەیتوانی پایەوپلەکەی خۆی لەدەست نەدا ، لەبەر ئەوەی بە میراتی بۆی مابووەوە . ئەوێکی کوڕی مارکۆس لە توانایدا هەبوو لە ڕازی‌کردنی گەل‌و سەربازاندا ، شوێن‌پێی باوکی هەڵبگرێ . بەڵام ئەم کۆمۆدۆسە تەبیعەتێکی دڕندانەی سەختی هەبوو . لە سەرێکەوە لە پێناوی ڕازی‌کردنی سەربازەکانیداو بۆ سۆزنیشاندان‌و پاڵپێوەنانیان بەرەو ژیانی داوێن‌پیسی‌و بەدڕەوشتی ، ئارەزووی چاوچنۆکی خۆی بەردایە گیانی جەماوەری گەلەکەی . لەولای تریشەوە،ئەوسەنگینی‌یەی نەپاراست کە پایەوپلەکەی بە سەریدا دەیسەپاند ، بەڵکوو بەردەوام لە هۆڵەکانی شانۆکاندا دەچووە ناو کۆڕی زۆرانبازی‌یەوەو زۆر کردەوەی ناشیرینی تریشی دەنواند کە لایەقی ئیمپراتۆرێك نەبوون‌و لە ئەنجامیدا سەربازەکانی وایان لێهات بە چاوی سووکەوە سەیری بکەن . بەم جۆرە هەردوو

هۆیەکە یەکیان گرت ، واتە لە لایەکەوە بوغزاندنو لە لایەکی تریشەوە بەسووكسەیرکردنو ئەنجام بەوە شکایەوە کە چەند کەسێك پیلانێکیان لە دژ گێڕاو کوشتیان .

دواجار شیکردنەوەی شەخسی‌یەتی مەکسیمینۆسمان لەبەردەمدا دەمێنێ . ئەمیان پیاوێکی جەنگاوەر بوو . دوای مردنی ئەلیکساندەر کە ئەوەبوو لەوەبەر باسمان کرد چۆن سوپا ئەنجامی لاوازی‌و دەستەوستانی‌یەکەی لیّ‌ی بێزار بووبوو، ئەم بە ئیمپراتۆر هەڵبژێردرا . بەڵام زۆر لە سەر تەختی پادشایی نەمایەوە ، چونکە دوو شت بوونە هۆی بوغزاندنو ریسواکردنی . یەکەمیان نەژادنزمی‌یەکەی کە لە منداڵیدا لە (تراکیا)(٨٩) شوان بووەو ئەمە راستی‌یەك بووە بڵاوبۆتەوەو کردوێتی‌یە گاڵتەچی‌ی هەموو لایەك . دووەمیشیان دواکەوتنی لە رۆیشتنیدا بۆ رۆما بۆ چوونەسەرتەختی پادشایی ، هەروەها ناوبانگ‌دەرکردنی بە دڵرەقی‌و جەربەزەیی ، چونکە لە رۆماو لە زۆر ناوچەی تری ئیمپراتۆرێتدا ، چەندین کرداری درندانەی لە رێگەی وەکیلەکانی‌یەوە لێوەشابوونەوە . بەم شێوەیە گشت جیهان ، بە هۆی نەژادنزمی‌یەکەی‌و بوغزاندنی‌یەوە لە ئەنجامی ترس‌و سامدا لە جەربەزەیی‌یەکەی ، لیّ‌ی‌کەوتنە نارەزایی‌و رقەبەرایەتی‌و یەکەمجار ئیتالیا کەوتە پیلان‌لێکردنی‌و ئینجا هەرخێرا ئەنجومەنی پیران‌و هەموو خەڵکی رۆماو ئیتالیا دەستیاندایەو دواجار سوپایش لە پیلانگێڕاندا بەشداری‌ی کرد ، بەتایبەتی **وەختێك** کە ئاکویلیای ئابڵووقەداو نەیتوانی زەفەری پێبەرێ ، سەربازەکان بە هۆی ئەو سەرسەختی‌یەوەی دەینواند ، لە روویدا راپەڕین‌و کە زانی‌یان هەموولا بوونەتە دوژمنی ، ترسیان لیّی‌نەماو کوشتیان .

ئیتر لە هیلیۆگابۆلۆس یا ماکرینۆس یا جۆلیانۆس نادوێم ، چونکە ئەوانە لە ریسوابووەکان بوون‌و هەرزوو لەناوبران . بەڵام من لێرەدا خۆم بە ئەنجامی ئەم گفت‌وگۆیەم دەگەیەنم‌و دەڵێم : میران لە سەردەمی ئێستاماندا زەحمەتی‌یان کەمتر لەوانی تووش دێ ، چونکە ئەوان ناچار دەبوون لە دەوڵەتەکانیاندا لەرادەبەدەر سەربازەکانیان رازی بکەن ، لە کاتێکدا ئەمان ئەگەرچی پێویستی‌یان بە هەندێ حساب‌بۆکردن دەبێ ، بەڵام گیروگرفتەکان هەرخێرا چارەسەر دەکرێن ، لەبەر ئەوەی

که هیچ کام لەم میرانە نەبۆتە خاوەنی سوپایەکی ئەوتۆ کە بە توندی بە دەزگای حوکمرانی یا بە دەزگای بەڕێوەبردنی ناوچەکانەوە بەسترابێتەوە ، بە پێچەوانەی حاڵەتی لەشکرەکانی ئیمپراتۆریتیڕۆمانکانەوە کە لەو رۆژگارەدا وا پێویست بووە لە بری گەل سەربازەکان رازی بکرێن ،لەکاتێکدا ئێستا رازیکردنی گەل بۆ گشت میرەکان ، خاقانەکانی تورکو سوڵتانی لێدەرچێ ، کارێکی پێویستترە لە رازیکردنی سەربازەکان ، چونکە گەل توانای کارکردنی لە سەربازان زیاترە . بێگومان سوڵتانی تورکەکانم نەخستە پاڵیان ، لەبەر ئەوەی کە ئەو هەمیشە چواردەوری خۆی بە نزیکەی دوانزە هەزار سەربازی پیادەو پانزە هەزاری سوارە تەنیوە کە کۆڵەکەی دەوڵەتەکەینو ئەمنوئاسایشو بەهێزییەکەی بەوانەوە بەندە . بۆیە ئەرکی سەر شانێتی کە لە پێناوی دڵراگرتنیاندا ، هەموو حسابێکیتر بخاتە لاوە . واتە حاڵەتەکە پڕبەپڕ بە سەر مەملەکەتەکەی سوڵتانیشدا دەگونجێ ، چونکە بوونی ئەو مەملەکەتە سەرانسەر لە چنگی سەربازاندا ، سوڵتان ناچار دەکا دۆستایەتیی خۆی لە گەڵ ئەواندا بپارێزێو گوێ نەداتە گەل . دەبێ ئەوەیش جێگەی سەرنجلێدانمان بێ کە دەوڵەتی سوڵتان تەواو لە دەوڵەتانی میرەکانیتر جیاوازە . ئەو لە بەر ئەوەی ناتوانرێ ناوی بە مەملەکەتی میراتگری یا مەملەکەتی تازەدروستکراو ببرێ ، پتر لە پاپایەتیی مەسیحییەت دەچێ ، چونکە کوڕانی میرە مردووەکە نابنە میراتگری تەختی پادشاییەکەی ، بەڵکوو یەکێك لەو بابەتە کەسانە جێگەی دەگرێتەوە کە خاوەن شانوشکۆیەو دەسەڵاتداران بۆ ئەو پایەیە هەڵیدەبژێرن . هەروەها لەبەر ئەوەی کە رژێمەکە کۆنە ، ناتوانین سیفەتی مەملەکەتی نوێی بدەینێ ، ئەگەرچی میرەکەی نوێیە . بەڵام ئەو جۆرە گرفتانەی تێدانین کە لە دەوڵەتی نوێدا هەن ، ئەویش بە هۆی کۆنیی یاساو سیستمەکانی ناو وڵاتەکەیەوە کە لەوە دەچن بۆ ئەم ، وەك سوڵتانێکی میراتگر ، ئامادەکرابن .

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان . هەر کەسێ لێدوانەکەی پێشووم بخوێنێتەوە ، دەبینی کە رقوکینەو ریسوایی هەردەم هۆی رووخاندنی ئەو ئیمپراتۆرانە بوون کە ناوم بردن ، هەروەکوو دەبینێ کە لە کردارەکانیاندا هەندێکیان ئەم رێگاو

هەندێکیان ئەو ڕێگای جیایان گرتۆتەبەر ، بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا ، هەندێکیان کوتایی یەکی بەختیارانە کۆتایی یان هاتوەو هەندێکی تریان کۆتایی یەکی با کڵوڵ و کەساسانە . یا لەبەر ئەوەی

بیرتیناکس و ئەلیکساندەر دوو حوکمڕانی نوێ بوون ، هەوڵدانی لاسایی کردنەوەی مارکۆس کە میرێکی میراتگر بوو ، بۆیان بێ سوودو بگرە زەرەربەخش بوو . هەروەکوو ئەمە بە سەر کراکلاو کۆمۆدۆس و مەکسیمینۆسیشدا دەگونجێ ، چونکە لاسایی کردنەوەی سیڤیرۆس و لە گەڵ بێ بەشیشاندا لەو بەهرەو توانایەی کە بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو پێویست بوون ، دەبوو بۆیان ببێتە مایەی ماڵوێرانی . بەم جۆرە ، لاسایی کردنەوەی کردارەکانی مارکۆس ، بۆ میرێکی نوێ لە میرایەتی کەیدا کارێکی زەحمەتەو

نابێ لاسایی کردارەکانی سیڤیرۆسیش بکاتەوە ، بەڵکوو گشت ئەرکی سەرشانی تەنیا ئەوەیە کە ئەو کاروفرمانانەی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەی پێویستن لە سیڤیرۆسیانەوە وەربگرێ و ئەوەشی سوودیان لێدەبینێ و لە پاراستنی دەوڵەتەکەی و مانەوەی و پتەوکردنیدا سەری بەرزدەکاتەوە ، لە مارکوسیانەوە وەربگرێ .

## ٢٠

# ئایا قەڵاو قوللەو ئەوشتانەی تر کەمیر دایاندەهێنێ سوود بەخشن یاخود زەرەربەخشن؟

هەندێ لە میران، بۆ پارێزگاریکردن بە ئاسوودەگیو دڵنیایییەوە لە مەملەکەتەکانیان، پەنا دەبەنە بەر چەك داماڵین لە رەعیەتەکەیان، لە کاتێکدا هەندێکیتریان پەنا دەبەنە بەر هێشتنەوەی ئەو ناوچانەی داگیریان دەکەن بە بەشبەشکراوی. هەروەکوو هەن هەوڵی هێمنکردنەوەی ئەو ناحەزییە دەدەن کە دژیان لە کایەدایەو هەشن تەقەلا دەدەن ئەو کەسانە بەلای خۆیاندا رابکێشن کە لە سەرەتای حوکمڕانیکردنیاندا گومانیان لە راستگۆییو دڵسۆزییان کردوە. هەروەها هەندێ لە میران قەڵاو قوللەیان دروست کردوە، لە کاتێکدا هەندێکیتریان رووخاندویانن‌و نەیانهێشتوونەتەوە. جا هەرچەنندە حوکمدانێکی بیڕایبڕ بەسەر ئەم کاروبارانەدا بەبێ چوونەناو درێژەی باسی ئەو دەوڵەتەوەی ئەم جۆرە ئامۆژگارییانەی تێدا بەجێ دەهێنرێ ئەرکێکی زەحمەتە، بەڵام من هێندەی باسەکە بە شێوەیەکی گشتی ماوەمبدا لێیدەدوێم.

قەت نەبیستراوە میرێکی نوێ پەنای بردبێتە بەر چەكداماڵین لە رەعیەتەکەی ، بەڵکوو پێچەوانەکەی راستە . واتە ئەگەر سەیری کرد بێ‌چەکن چەکداریان دەکاو بە چەکدارکردنیان چەکەکانیان بە مسۆگەری دەخاتە پاڵ خۆی ، چونکە کامیان جێگەی گومانو ترس‌لێکردن بووبێ،دەبێتە پیاوێکی دڵسۆزو کامیشیان لەوەبەر دڵسۆز بووبێ وەك خۆی دەمێنێتەوەو ئیتر خەڵکەکە لەم رێگەیەوە دەبنە کۆمەڵێك هاوولاتی . بەلام لەبەر ئەوەی زەحمەتە بتوانرێ گشت هاوولاتی‌یان چەكدار بکرێن ، بەخشینی ئەم تایبەتکاری‌یە بە هەندێکیان ، یاریدەت دەدا کە بتوانیت بە شێوەیەکی زیاتر ئاسوودەگی‌و دڵنیایی بەخشەوە مامەلە لەگەڵ ئەوانی‌تردا بکەیت . ئەم جیاوازکاری‌یەش لە مامەلەکردندا کە ئەو کەسانە خۆیان دەرکی پێدەکەن ، وایان لێدەکا باشتر پابەندو هۆگرت بن . هەروەکوو خەڵکەکەی‌تریش لەلای خۆیانەوە بەهانەت بۆ دەبیننەوەودێنە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوانەی چەکیان وەرگرتوە ، بە حوکمی پێویستی ، خاوەنی بەهرەو توانایەکی گەورەترن‌و مەترسی‌یەکی زۆرتریان دەکەوێتە سەرو ئەرکێکی گرانتریان لەسەر شان دەبێ . بەلام ئەگەر چەکت لێداماڵین ، ئەوا تۆ دەست دەکەیت بە خراپەکاری لەگەڵیانداو وای نیشاندەدەیت کە یا لە ترسنۆکیتە یا لە بێ‌باوەڕیتە بە خۆت کە پشتیان پێ‌نابەستیت‌و هەردوو رایەکەش رق‌وکینەت لە دژ دەخولقێنن . ئینجا لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانیت بەبێ هێزی چەکدار بمێنیتەوە ، ئەوا ناچار دەبیت پەنا بەریتە بەر سەربازی بەکرێگیراو کە لە بەشێکی پێشوودا باسی نرخ‌و بایەخیانمان کردو دەرمان‌خست جۆرە هێزێکە کە تەنانەت ئەگەر رێك‌وپێکیش بێ ، کەڵکی ئەوەی نابێ لە رووی دوژمنانێکی بەهێزو رەعیەتێکی ئەوتۆدا کە گومانت لە راستگۆیی دڵسۆزی‌یەکەی هەبێ ، پارێزگاریت لێ‌بکا . بویە من وتم کە تازە میر لە میرایەتی‌یەکی نوێدا ، دەبێ پەنا بەرێتە بەر چەکدارکردنی رەعیەتەکەی‌و بیانکاتە سەربازو مێژووش پڕە لە نموونە بۆ ئەم حاڵەتە .

بەلام وەختێك میر دەوڵەتێکی نوێ داگیردەکاو دەیخاتە پاڵ دەوڵەتەکەی پێشووی خۆی ، چەكداماڵین لە خەڵکی ئەو دەوڵەتە دەبێتە ئەرکێکی سەر شانی ، تەنیا ئەوانەی نەبێ کە لە کاتی داگیرکردنەکەدا لایەنگیری بوون . هەروەها لەسەری پێویستە

که هەر هێندەی هەلی بۆ هەڵکەوت و وەختێکی لەباری بۆ ڕەخسا ، ئەو لایەنگرانە لاوازو سەرشۆڕ بکاو کاروباری خۆی وەها ساز بدا کە گشت چەکی دەوڵەتە تازەکە بداتە دەستی سەربازەکانی خۆی ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لە دەوڵەتە کۆنەکەیدا لە بن دەستی‌یەوەن . ئێمە لە باووباپیران‌و حەکیمانی خۆمانمان بیستوە کە وتوویانە پێویستە (پیستۆیا) بە پەرت‌پەرتی‌و کاولی‌و (پیزا) بەبێ قەڵاو قوللە بمێننەوە . سا هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە کە لەوەبەر ناکۆکی‌یان لە نێوان هەندێ لەو شارانەدا بەرپا دەکرد کە دەکەوتنە ژێر چنگیانەوە ، بەو هیوایەی بە شێوەیەکی ئاسانترو ڕەوانتر بتوانن دەستیان بەسەردا بگرن . ئەم ڕێبازە لە ڕۆژگارێکدا کە لەنگەری نێوان هێزەکان لە ئیتالیادا ڕاگیر بووبوو ، سوودبەخش بەکەڵك بوو . بەڵام بۆ ئێستامان من بە شتێکی باشی نازانم ، لەبەر ئەوەی باوەڕێکی بیرای‌بیرم بەوە هەیە کە ئەم جۆرە پەرت‌پەرت‌کردنە هیچ سوودێکی نابێ ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە زەرەربەخش دەبێ ، چونکە وەختێ دوژمن شاڵاو دێنێ یەکسەر دەتوانێ شارە پەرت‌پەرت کراوەکە داگیر بکا ، لەبەر ئەوەی کە حیزبە لاوازەکان دەدەنە پاڵی‌و حیزبەکانی‌تریش ناتوانن خۆیان ڕابگرن .

گومانی تێدا نی‌یە ڤینیسیایی‌یەکان ، کاتێ ئاگری ناکۆکی‌ی نێوان (جیویلف) و (جیبیلین)یان[٩٠] لەو شارانەدا خۆش کرد کە لە ژێر چنگیاندا بوون ، هەر ئەو هۆیانەی پێشوو هانی دابوون . ئەمان هەرچەندە ماوەیان نەدا ناکۆکی‌یەکە هێندە پەرە بسێنێ بگاتە ڕادەی خوێن ڕشتن ، بەڵام بەو مەبەستەی خەڵکەکە بە ناکۆکی‌یەکانی خۆیانەوە خەریك بن‌و نەتوانن هیچ شتێك دژی داگیرکاری‌یەکەی ڤینیسیا بکەن ، هانیان دەداو ئاگریان بۆ خۆش دەکرد . لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕێبازە سوودی پێ نەگەیاندن ، چونکە دیمان کە چۆن هەندێك لەوانە دوای بەزینەکەی (ڤاییلا) هێندەیان ئازایەتی تێدابوو کە دەست بەسەر گشت دەوڵەتەکەدا بگرن . هەروەها ئەم جۆرە ڕێ‌وشوێنانە مانای لاوازی‌ی میر دەبەخشن ، چونکە حکوومەتێکی بەهێز ماوەی سەرهەڵدانی ئەم بابەتە ناکۆکی‌یانە نادا کە ڕەنگە لە ڕۆژانی ئاشتیدا ، بەو مانایەی گوایە بەڕێوەبردنی کاروباری ڕەعیەتەکە بۆ میر ئاسان دەکەن کەڵکێکی هەبێ ، بەڵام هەر کە جەنگ دێتە کایەوە ، چەوتی‌ی ئەم سیاسەتە خێرا

دەردەکەوێ .

بێگومان میران لە وەختێکدا مەزن دەبن کە بەسەر کەندو کۆسپو بەسەر بەربەرەکانی کەرانیاندا زاڵ ببن . لەبەر ئەوە کاتێ دەیەوێ شانوشکۆی تازەمیرێك بەرز بکاتەوە کە زیاتر لە میرە میراتگرەکەی هاوەڵی پێویستی ی بە دەسگیرخستنی ناوبانگی فراوانە ، دێت دوژمنێ بۆ دەخوڵقێنێو ناچاری بەرپاکردنی جەنگی دەکا دژیانو لە ئەنجامیشدا بە سەریاندا زاڵی دەکا ، هەتا بە دوایدا بە سەر پەیژەی ئەو کۆسپەدا کە دوژمنەکەی خستبوویە سەریگای سەربکەوێتو بەرزتر ببێتەوە . زۆریش هەن هەر بەم پێیە باوەریان وایە کە میری ئاقل دەبێ ئەگەر هەلێ بۆ هەڵکەوت فێڵبازانە دوژمنایەتی بۆ خۆی بخوڵقێنێ ، تا بە بەزاندنی دوژمنەکە ، زیاتر مەزنی بۆ خۆی پەیدا بکا .

زۆر جار میران ، بەتایبەتی نوێیەکانیان ، دڵسۆزیو سوودی زیاتریان لەو کەسانە دیوە کە لە سەرەتای هاتنەسەرحوکمیاندا لێیان بەگومان بوون ، وەك لەوانەی جێگەی باوەریان بوون . بۆ نموونە باندۆلفۆ پیترۆچیی[٩١] میری سی‌یەنا ، فەرمانرەوایی ناوچەیەکی بە هۆی ئەو کەسانەوە کردوە کە لێیان بەگومان بووە نەك بە هۆی کەسانی ترەوە . بەڵام ئێمە بەدرێژی لەوانە نادوێین ، چونکە لێدوانیان لە باسەکە دوورمان دەخاتەوەو تەنیا هێندە بەسە کە بڵێین : راکێشانی ئەو کەسانەی لە سەرەتای سەردەمی حکومەتێکی نوێدا بە دوژمن دەدرێنە قەڵەم بۆ ریزی میر کارێکی ئاسانە ، بەتایبەتی ئەگەر لەو بابەتە بوون کە بۆ پاراستنی پایەوپلەی خۆیان پێویستی‌یان بە یاریدەدان دەبێ . ئەوسا خۆیان بەناچار دەبینن کە بە دڵسۆزی‌یەوە خزمەتی بکەن ، چونکە دەزانن کە تەنیا لە رێگەی کرداریانەوە دەتوانن ئەو باری سەنجە خراپە بسرنەوە کە لە رابووردوودا دەربارەیان چەسپی بووە زەینەوە . میریش لەلای خۆیەوە هەردەم یاریدەیەکی گەورەتری لەوان دەسگیر دەبێ وەك لەو کەسانەی بە ئاسوودەگی‌یەوە خزمەتی دەکەنو لە ئەنجامدا سوودو بەرژەوەندی ئەم دەخەنە پشت‌گوێ .

جا لەبەر ئەوەی هەست دەکەم باسەکە زیاتر درێژەپێدانی پێدەوێ ، لێرەدا بە چاکی دەزانم ئەو میرەی لە سەرەتای داگیرکردنی دەوڵەتێکدایە لە رێگەی یاریدەی خەڵکەکەیەوە ، ئاگادار بکەم کە بە وردی لەو هۆیانەی هانی داوەن بۆ یاریدەدانی بکۆڵێتەوە . چونکە ئەگەر هۆیەکان بەندی هەستی خۆشەویستی‌یەکی ئاسایی نەبن ، بەڵکوو ئەنجامی نارەزایی‌یان بن لە شێوەی حوکمڕانی‌یەکەی لەوەبەری دەوڵەتەکەیان ، ئەوا زەحمەتی‌یەکی قەبەترو گێچەڵێکی سەختتری لە راگرتنی دۆستایەتی‌یاندا تووش دێ‌و رازی‌کردنیان کارێکی مەحاڵ دەبێ . خۆ ئەگەر لەبەر رۆشنایی ئەو نموونانەی لە سەردەمی دێرین‌و تازەیان دەردێنین لە هۆیەکانی ئەو حاڵەتە بکۆڵێتەوە ، بۆمان دەردەکەوێ کە میر دەتوانێ دۆستایەتی‌ی ئەو کەسانەی ئاسانتر دەسگیربێ کە لە وەزعی پێشوو رازی‌بوون‌و لە سەرەتادا لە رێزی دوژمنانی ئەمدا بوون ، وەك لە دۆستایەتی‌ی ئەو نارازی‌یانەی دەبنە دۆستی‌و لە داگیرکردنی دەوڵەتەکەیاندا یاریدەی دەدەن .

هەروەها میران بۆ پارێزگاری‌کردن لە دەوڵەتەکانیان‌و ئەمن‌و ئاسایشیان ، پیشەیان وابووە کە وەك دەسپێشکەری‌یەك بۆ بەرگرتن لە تەمای داگیرکردنی خاکەکەیان لەلایەن تەماعکارانەوە ، قەڵا دروست بکەن‌و بۆیان ببێتە پەنایەك‌و لە حاڵەتی هێرشی لەناکاودا ، رووی تێ‌بکەن . من لەگەڵ ئەم شێوەیەدام ، چونکە لە کۆنترین سەردەمەوە بەکارهێنراوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەردەمی ئێستاماندا ، دیمان کە چۆن نیکۆلۆ ڤیتێللی [٩٢] بۆپارێزگاری‌کردن لە دەوڵەتەکەی ، دوو قەڵای لە سیتا دی کاستیللۆدا رووخاند . هەروەکوو گیدۆ باڵدۆ ، [٩٣] دۆقی ئۆربینۆ ، وەختێ گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی کە قەیسەر بۆرجیا لێ‌ی دەرپەڕاندبوو ، هەرچی قەڵایەکی تێدا بوون رووخاندنی ، چونکە وای دانا کە بە نەمانی قەڵاکان ستەمە جارێکی‌تر ناوچەکەی لەدەس بچێتەوە . هەروەها بنەماڵەی بێنتیڤۆگلی کە گەڕانەوە بۆ بۆلۆنا ، هەندێ شتی لەم بابەتەیان کرد . جا لەبەر ئەم هۆیانە ، قەڵا بە پێ‌ی وەزع‌و رۆژگار رەنگە سوودبەخش بێ یا بێ‌سوود بێ ، رەنگە لە سەرێکەوە بەکەڵك بێ‌و لە سەرێکی‌ترەوە بێ‌کەڵك بێ . ئێمە دەبێ مەسەلەکە بەم

شێوەیەی خوارەوە وەربگرین : ئەو میرەی ترسی لە گەلەکەی زیاتر هەبێ وەك لە بێگانە ، دەبێ قەلا دروست بکا ، بەلام ئەو میرەی ترسی لە بێگانە زیاتر هەبێ وەك لە گەلەکەی ، بۆی هەیە قەلا فەرامۆش بکا . بۆ نموونە قەلای میلان کە فرانسیسکۆ سفۆرزا بنیاتی نا ، زیاتر لەهەر پشێوی یەکی تر لە دەولەتەکەدا بووە مایەی سەریەشەو بێئارامی بۆ بنەمالەی سفۆرزا . بۆیە باشترین قەلا کە میرێك بنیاتی بنێ ئەوەیە کە لە ناو دلو دەروونی گەلەکەیدا بێ ، چونکە تۆ ئەگەرچی قەلا دروست دەکەیت ، بەلام کە گەلەکەت رقی لێت بوو ناتوانیت بیپارێزیت . هەروەکوو کاتێ گەل دژت رادەپەرێ ، یەکی لەو جۆرە پشتگیری‌کەرە بێگانانە ناکەوێ کە هەرخێرا یارمەتی ی پێشکەش بکەن . لەم سەردەمەدا نەمان دیوە قەلا بۆ هیچ یەکێ لە میران سوودی هەبووبێ ، تەنیا خانمی فۆرلی نەبێ کە لە کاتی مردنی کۆنت جیرۆلامۆی (٩٤) مێردیدا ، توانی لە شۆرشی جەماوەر خۆی دەرباز بکاو پەنا بەرێتە بەر قەلاکەی ، تا لە میلانەوە یاریدەی گەیەندرایەو میرایەتی‌یەکەی وەرگرتەوە ، بەتایبەتی کە بارودۆخی ئەو وەختە ماوەی هیچ بێگانەیەکی نەدەدا دەستی یارمەتی بۆ گەل درێژ بکا . بەلام لە دواییدا کە قەیسەر بۆرجیا پەلاماری داو گەلیش کە دوژمنی بوو خێرا دەستی خستە ناو دەستی بێگانەوە ، قەلاکانی بەفریای نەکەوتن . بۆیە چاکتر وابوو کە لە بری پشت‌پەستن بە قەلاو قوللە ، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی خۆی لەلای گەلەکەی چارەگران نەکردایە . لەبەر گشت ئەم هۆیانە ، من ستایشی دروستکەرانی قەلاو دروست نەکەرانیشی دەکەم ، بەلام لۆمەی ئەوانەش دەکەم کە سەرجەمی باوەریانی دەدەنەپالێو گوێ نادەنە رق‌وکینە یا خۆشەویستی بۆیان .

# ٢١

# ئایا میر چۆن هەوڵی پەیداکردنی ناوبانگ دەدا ؟

هیچ شتێك وەك دەسدانە پرۆژەی گەورەو قەبەو نیشاندانی بەڵگەی بەهێزی ، میر بە پلەی رێزداری‌و سەربلندی ناگەیەنێ . با نموونەیەکی هاوچاخی وەك فردیناندی پادشای ئەراگۆن‌و پادشای ئێستای ئیسپانیا وەربگرین کە رەنگە ئەگەر لەقەبی حوکمرانی نوێی بدرێتێ راست دەربچێ ، لەبەر ئەوەی لە پلەی پادشایەکی بچووکەوە بەرزبووەوەو گەیشتە لوتکەی سەربەرزی‌و بەناوبانگی ، تا بووە پادشای یەکەمی مەسیحی‌یەت . جا ئەگەر لە کارەکانی بکۆڵیتەوە مەزنی‌یەکی دیارو ئاشکرای ئەوت تیایاندا بۆ دەردەکەوێ ، چونکە هەموو بەرزو لەرادەبەدەرن . ئەو هات سەردەمی خۆی بە پەلاماردانی گرناتە دەست‌پێکردو ئەم مل‌پێوەنانەی بووە بەردی بناغەی مەملەکەتەکەی . لە سەرەتادا ، لەو وەختانەدا کە کازوفرمانی نەدەبوو ، بە پێی حەزوو ئارەزووی خۆی‌و بێ‌ترسی ئەوەی کەسێك هەبێ بتوانێ دەست لە ئیش‌وکاری وەربدا هەڵدەسووڕاو بەوە بیروهۆشی سەردارانی قشتالەی[٩٥] بە پرۆژەکەیەوە خەریك دەکردو تەنانەت لەبەر تەرخان‌کردنی سەرجەمی بیرکردنەوەی خۆیان بۆ جەنگ ، وەختی بیرکردنەوەیان لە هیچ داهێنان‌و خولقاندنێك بۆ نەدەمایەوە . بەم جۆرە ئەو ناوو ناوبانگەی

بۆ خۆی بەدی‌هێناو ئەو دەسەڵاتداری‌یەشی بە سەر ئەواندا سەپاند کە مەبەستی بوو ، بێنەوەی لە سەرەتای کاردا هەستی پێبکەن . ئینجا بەو پارەوپوولەی لە کڵێسەی وەرگرت‌و لە گەلی کۆکردەوە ، توانی لەشکرەکانی بپارێزی‌و ئەو جەنگە درێژخایەنە بەرپابکا کە بووە بنچینەی هێزە سەربازی‌یەکەیو ئەمەش لە ئەنجامدا هەلی شۆرەت‌و ناودەرکردنی بۆ رەخساند . جگە لەوەی کە بۆ سازدانی پرۆژەی قورسترو گەورەترو لە ژێر پەردەی پارێزگاری‌کردن لە دیندا ، دەستی کردە چەوساندوەی ئایینی‌و عارەبەکانی لە مەملەکەتەکەی خۆی دەرکردو هەرچی‌یان هەبوو لی‌ی زەوت کردن کە ئەمە کارێکە لی‌ی نەگریسانەترو بی‌هاوتاتر نی‌یە . هەروەها بە هەمان بەهانە پەلاماری ئەفریقای‌داو ئینجا ملی پێوەنا بۆ ئیتالیاو دواجار هێرشی بردە سەر فەرەنسا . بەم جۆرە هەردەم پرۆژەی گەورەو قەبەی ئەوتۆی دادەهێنان کە بیروهۆشی رەعیەتەکەی خۆی پێ سەرسام دەکردن‌و رای‌هێنابوون کە هەمیشە بە چاوەروانکردنی ئەنجامەوە خەریك بن . ئەم کارانەش وەها بەرودوا دەکران کە یەك بە دوای یەکدا دەهاتن‌و ئیتر بواری هەست‌کردنیان بە هێمنی بە شێوەیەك لە هەر مرۆڤێك دەبری کە ماوەی نەبی دژی ئەو هیچ شتێك بکا .

هەروەها بۆ میر کارێکی بەکەڵکە کە لە بەرێوەبردنی کاروباری ناوخۆدا هەندی نموونەی دیارو ئاشکرا ، لەو بابەتەی سەبارەت بە کردارەکانی جەنابی بیرنابۆ(٩٦) لە میلاندا گێرامەوە ، بۆ مەزنی‌ی خۆی پێشکەش بکا . چونکە وەختی یەکێك لە خەڵکەکەوە هەڵدەکەوی‌و کارێکی نائاسایی‌و لەرادەبەدەر ، چ لە کۆری خێرخوایی‌و چ لە کۆری شەرخوایدا دەکا ، میر دەبی رێوشوێنی پێویست بۆ خەڵاتکردن یا سزادانی دابنی‌و بە جۆرێکی ئەوتۆش بی کە خەڵکی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ باسی بکەن . بگرە لەمە بەولاتریشەوە ، میر دەبی لە هەر کاروکردارێکیدا هەوڵی پەیداکردنی ناوبانگی مەزنی‌و سەرکەوتوویی بدا .

هەروەها میر ئەگەر سەلماندی کە ئەو ، یا هاوری‌یەکی دڵسۆزەو یا دوژمنێکی باوەکوشتە ، ئەوا ئەوپەری رێزلێنان بۆ خۆی مسۆگەر دەکا . ئەمەش وادەگەیەنی کە نەبی بەبی راوورێوی بۆهێنانەوە ، دلسۆزی‌و دوژمنایەتی‌ی خۆی بۆ ئەم‌وئەو ئاشکرا

بکا . گومانیشی تێدا نی یه که ئەم جۆره سیاسەتە هەمیشە لە سیاسەتی بێ‌لایەنی باشترە . بۆ نموونە ئەگەر دوو دەوڵەتی دراوسێت چوون بەگژیەکداو کردیانە جەنگ ، تۆ دەبێ لە روویاندا هەڵوێستێکی ئەوتۆ بگریت کە یا ببێتە هۆی ترساندنت لە دەوڵەتە سەرکەوتوەکە ، یاخود نەترساندنت . ئینجا لە هەردوو حاڵەتەکەشدا چاکتر وایە هەڵوێستەکەی خۆت بە ئاشکرا دەرببریت‌و بجەنگیت . چونکە نەجەنگینت لە حاڵەتی یەکەمدا ، دەتکاتە نێچیرێکی نەرمەقووت بۆ لایەنی سەرکەوتوو کە ئەوە رەزامەندی‌و گەشکەداری دەخاتە دڵی لایەنی ژێرکەوتووەوەو تۆش هیچ هۆیەك یا بەهانەیەك بۆ ئەو هەڵوێستەی خۆت نابینیتەوە ، هەروەکوو هیچ کەسێکیش بە پیرتەوە نایەت ، لەبەر ئەوەی سەرکەوتوو هەرکام بێ حەز بە دۆستایەتی ی کەسانێك ناکا لێ‌یان دڵنیا نەبێ‌و لە وەختی تەنگانەدا بە فریای نەکەوێ ، چونکە لە جەنگەکەیدا کە لە پێناوی پارێزگاری‌کردن لە مەسەلەکەی خۆیدا دەیکرد لەگەڵیدا نەبوویت .

بۆ نموونە ئیتۆلی‌یەکان داوایان لە ئەنتیۆخۆس کرد کە بچێت بۆ وڵاتی یۆنان بۆ دەرپەراندنی‌رۆمانەکان‌وئەویش داخوازی‌یەکەی بەجێ هێنان . ئەنتیۆخۆس لەلای خۆیەوە نوێنەرو وتاربێژی بۆ لای ئاخی‌یە دۆستەکانی‌رۆمانەکان‌نارد بۆ هاندانیان کە بێ‌لایەن بوەستن ، لە کاتێکدارۆمانەکان‌لەولای‌ترەوە قایلیان کردن کە‌لەپاڵ ئەماندا بجەنگن‌و ئیتر باسەکە کەوتە لای ئەنجومەنی ئاخی‌یەکان بۆ گفت‌وگۆ لەسەرکردنی . بەلام وەختێ باڵیۆزی ئەنتیۆخۆس هەڵساو تەقەلای‌دا قایلیان بکا بێ‌لایەن بمێننەوە ، باڵیۆزی‌رۆمانەکان‌لە وەرامیدا وتی : «ئەو قسەیەی کەوتە بەرگوێتان هێجگار دوورە لە راستی‌یەوە . چاکترو بەکەڵکتر بۆ دەوڵەتەکەتان بەشدار بوونی جەنگەکەیە ، چونکە بەشدارنەبوونتان واتان لێدەکا نەبنە خاوەنی هیچ رازو نیازو ناوو ناوبانگێك . جگە لەوەی کە بەمسۆگەری دەبنە خەلاتێك بۆ لایەنی سەرکەوتوو ، ئیتر سا هەر لایەك بێ» .

هەروەها مەسەلە هەردەم وەها دەکەوێتەوە کە ئەوەی دۆستت نەبێ ، بەردەوام داوات لێدەکا بێ‌لایەن بمێنیتەوە . بەلام دۆستەکەت داوای ئەوەت لێدەکا هەڵوێستی

خۆت ئاشکرا بکەیت‌و چەکی لەگەڵدا هەڵبگریت . جا میرە راراکان بە نیازی خۆبەدوورگرتن لەو مەترسی‌یانەی دادێن ، ئاسایی پەنا دەبەنە بەر گرتنی رێگەی بێلایەنی کە بەبێ چەندوچۆن بویان دەبێتە مایەی ماڵوێرانی‌و خۆفەوتاندن . بەڵام ئەو میرەی بە ئاشکرا بڕیاری چوونەپاڵ یەکێك لە دوو لایەنەکە دەداو وایدادەنێ ئەویان سەردەکەوێ ، لایەنەکە سەرەرای بەهێزی‌یەکەی‌و مانەوەی ئەم لە ژێر رەحمەتیدا ، **بەرامبەری هەست بە جۆرە پابەندی‌یەك دەکا ، چونکە دۆستایەتی‌یەکی پتەو لە نێواندا بەستراوەو خەڵکەکەش ئاسایی پیشەیان وانی‌یە پشت لە شەرەف بکەن‌و ئەو کەسە بچەوسێننەوە کە یارمەتی‌ی داون‌و وا بە زەقی نکوولی لە چاکەی بکەن ، لەبەروەی کە سەرکەوتن بە شێوە ئاسایی‌یەکەی ، لەو بابەتە نابێ ویژدان لە بیرکابرای سەرکەوتوو بەرێتەوە ، بەتایبەنی لە باس‌وخوازی دادپەروەریدا . هەروەکوو ئەگەر هاوسوێندەکەت ژێریش‌کەوت تۆ لەلایەن ئەوەوە پەنا دەدرێیت‌و هێندەی لە توانایدا بێ بۆ یاریدەدانت لەسەر پێ دەبێ‌و تۆ دەبیتە هاوبەشی بەختی کە رەنگە جارێکی‌تر ئەستێرەی هەڵبێتەوەو بدرەوشێتەوە .**

بەڵام سەبارەت بە حاڵەتی سێیەم ، واتە وەختێ هەردوولای بەگژیەکداچوو لە چاو تۆداً هێندە لاواز دەبن کە هیچ ترسێکت لە سەرکەوتووەکەیان نابێ ، لایەنگرتنی هەرکامیان دژی ئەوی‌تر مەترسیت زیاتر بۆ دروست دەکا ، چونکە تۆ بە یاریدەدانی ئەو لایە رێگای خاپوورکردنی ئەوی‌تریان دەگریتە بەر کە ئەوسا لایەنە یاریدەدراوەکە ئەگەر ئاقڵ بووایە ، دەبوو هەر لە بنەرەتەوە ئەمە نەکاو بگرە ئەولایەش لەو چارەنووسە رزگار بکا . بەڵام بەهەرحاڵ ، ئەگەر هاوسوێندەکەت سەرکەوتنی بەدی هێنا،ئەوا هەر لە ژێر رەحمەتی تۆدا دەمێنێتەوە ، چونکە ستەمە بەبێ یاریدەو پشت بەستنی بە تۆ داگیرکاری بکا . ئینجا لێرەدا پێویستە ئەوەش روون‌بکەمەوە کە میر دەبێ خۆی لە خۆبەستنەوەدا بە میرێکی لە خۆی بەهێزترەوە لە مەسەلەیەکی هاوبەشدا بۆ زەرەرگەیاندن بە میرێکی‌تر بەدوور بگرێ ، تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێ کە پێویستی ناچاری بکا وەك لەوەبەر باسم کرد ، چونکە بە سەرکەوتنی ئەو تۆ دەکەویتە ژێر رەحمەتی‌یەوە . بۆیە میران دەبێ هێندەی لە توانایاندا هەبێ ، خۆیان لە کەوتنی ژێر رەحمەت‌و ئیرادەو حەزو ئارەزووی کەسانی‌تر بپارێزن . بۆ نموونە ڤینیسیایی‌یەکان دژی

دۆقی میلان لەگەڵ فەرەنسادا پەیمانیان بەست ، لە کاتێکدا دیانتوانی خۆیان لەو پەیمان‌بەستنە بەدوور بگرن کە بۆیان بووە مایەی ماڵوێرانی . بەڵام ئەگەر هەر ناچاری بوو ، وەك لە فلۆرنساییەکان رووی‌دا ، کاتێ پاپاو پادشای ئیسپانیا دووقۆڵی بە لەشکرەکانیان پەلاماری لۆمباردیایان‌دا ، ئەوا میر لەبەر ئەو هۆیانەی لەوەبەر باسم‌کردن ، دەبێ بەشداریی شەر بکا . لەسەر هەر دەوڵەتێکیش پێویستە کە پێی لەسەر دڵنیایی لە سیاسەتی خۆی دانەگرێ بەڵکوو دەبێ هەردەم گومانێکی دەربارە لە پێش چاو بێ . چونکە بۆ نموونە ئیش بە تەبیعەت وەها دێتە پێشەوە کە وەختێ مرۆڤ هەوڵ‌دەدا لە گرفتێك دەربازی بێ ، دەکەوێتە گرفتێکی‌ترەوە . بەڵام ژیری‌و وریایی لەوەدایە کە تۆ بتوانیت جۆری گرفتەکە بناسیت‌و یەخەی ئەوەیان بگریت کە لە زیان‌و ئازاربەخشیندا کەمترینیانە .

هەروەها لەسەر میر پێویستە هەمیشە مەیلی بەلای مرۆڤی بەهرەدارو بەتوانادا هەبێ‌و کەسانی دەست‌رەنگینی لاپەسەندبێ‌و هەڵکەوتووان لەهەر هونەرێکدا بێ رێز لێ‌بنێ . جگە لەمانە لە سەریشی پێویستە هانی هاوولاتی‌یانی بۆ بەردەوام‌بوون لەسەر ئیش‌وکاریان ، چ لە کۆری بازرگانی یا کشت‌وکاڵ یا هەر پیشەیەکی‌تری خەڵکەکەدا بێ بدا . بەم شێوەیە ئیتر هیچ کەسێك لە ترسی لەدەسدانی ئەوەی هەیەتی ، درێغی لە چاککردنی ناکا ، یا لە ترسی باج لێ‌سەندن لە بازرگانی‌کردن کۆ ناکاتەوە . هەروەکوو دەبێ هەموو ئەو کەسانەش خەلات بکا کە لەم کۆرانەدا کار دەکەن ، یا بە رێگەی جۆراوجۆر هەوڵی گەشەپێکردنی شارو دەوڵەتەکەی دەدەن . ئینجا جگە لەمانە پێویستە لە وەرزەکانی ساڵداو بە شێوەیەکی گونجاو ، گەل بە چەندین جەژن‌و پێشکەشکردنی شانۆگەری‌ی جۆراوجۆرو شتی‌ترەوە خەریك بکا . یا لەبەر ئەوەی کە شارەکە بەشاوبەشەو لە چەند نەقابەیەك یا لە چەند چینێك پێکدێ ، دەبێ بایەخ بە هەموو ئەو دەستەو تاقمانە بداو بەیناو بەینێك تێکەڵی یەکتریان بکاو رووی مرۆڤپەروەرانەی خۆی بە گشت لایەکیان نیشان بدا ، بەڵام بە مەرجێك کە بەردەوام بڵندی‌ی پلەو هەیبەتی پایەی خۆی بپارێزێ ، چونکە ئەمانە دوو شتن کە دەبێ قەت ماوە بە لەق‌بوون‌و پووکاندنەوەیان نەدا ، ئیتر سا هۆ هەر چۆنێك‌و هەر چی‌یەك بێ .

٢٢

# وەزیرەکانی میر

هەڵبژاردنی وەزیرانی میر مەسەلەیەکی کەمبایەخ نی یە ، چونکە ئەوانە یا ڕێك‌وپێك دەردەچن یاخود لەگەڵ زیری‌و وردبینی‌ی میردا سەبارەت بە کاروبار ناگونجێن . یەکەم باری سەرنجیش کە دەربارەی میرو چۆنێتی‌ی بیرکردنەوەی لای هەر مرۆڤێك پەیدا دەبێ ، لە سەرنج لێدانی ئەو کەسانەوە دروست دەبێ کە لە دەورو پشتیدان . واتە ئەگەر دڵسۆزو لێهاتوو بوون ئەوا پیاو لە بەحیکمەتی‌ی میر دڵنیا دەبێ‌و دەوترێ : توانیویێتی لێهاتوویی دەسنیشان بکاو دڵسۆزی بگرێتە خۆی . بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوون ، ئەوا پیاو هەمیشە بۆی هەیە باری سەرنجێکی خراپی دەربارەی میر خۆیشی هەبێ ، چونکە ئەو هەڵبژاردنە خراپەی بۆ دەبێتە یەکەمین زەللە .

بێگومان هەر کەسێ بەڕێز ئەنتۆنیۆ دی فینافیردی.وەزیری میری سی‌یەنا باندۆلفۆ پیترۆچی‌ی ناسیبێ ، یەکسەر ئەو حوکمەی داوە کە باندۆلفۆ لە هەڵبژاردنی ئەم وەزیرەدا بەحیکمەت‌و دادپەروەر بووە . لەم بوارەدا سێ جۆرە ئەقڵ هەن ، یەکەمیان بەبێ یاریدەو یارمەتیدان دەرك بە شت دەکا ، دووەمیان بە یاریدەو ڕێ‌نیشاندان لە لایەن کەسانی‌ترەوە دەرکی پیدەکا ، سێ‌یەمیان نە بە یاریدەو نە بەبێ یاریدە دەرکی

پیّ ناكا . جا بابەتی یەكەم زۆر چاكە ، دووەم چاكە ، بەلاّم سیّیەم بیّكەلّكە . لەمەوە دەردەكەویّ كە باندۆلفۆ ئەگەر لە بابەتی یەكەم نەبووبیّ ئەوا مسۆگەر لە بابەتی دووەم بووە . وەختیّكیش هەر میریّك ئەو توانایەی هەبیّ كە لە نیّوان رەفتارو گفتاری كەسانەوە ، حوكمی ناسینەوەی خیّرو شەڕ بدا ، تەنانەت ئەگەر لە بەهرەی داهیّنانو لە زیرەكییش بیّبەش بیّ ، دەتوانیّ كردارە چاكەكانی وەزیرەكەی لە كردارە خراپەكانی جیابكاتەوەو ئەمیان چارە سەر بكاو بۆ ئەویان هانی بدا كە ئەوسا ئیتر وەزیرەكەی دەس لە هیوای هەلّخەلّەتاندنی دەشواو بەردەوام بۆی دەستو دلّپاك دەبیّ .

هەروەها ریّگایەكی‌تر بۆ ناسینی وەزیرو تاقیكردنەوەی لە لایەن میرەوە هەیە كە قەت هەلّەی تیّدا روو نادا . ئەویش ئەوەیە كە وەختیّ وەزیرەكە زیاتر لە تۆ بیر لە خۆی دەكاتەوەو لە گشت كردارو رەفتارەكانیدا سوودو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەكاتە ئامانج ، دەردەكەویّ ئەم جۆرە پیاوە دەس نادا ببیّتە وەزیریّكی بەكەلّكو تۆ قەت ناتوانیت پشتی پیّ‌ببەستیت ، چونكە ئەو كەسەی ئەركی بەریّوەبردنی دەولّەتی كەسانیّكی‌تری پیّ‌دەسپیّردریّ ، دەبیّ قەت بیر لە خۆی نەكاتەوە ، بەلّكوو بیر لە میرەكەی بكاتەوەو جگە لەو شتانەی پەیوەندی‌یان بە میرەوە هەیە ، گویّ نەداتە هیچ شتیّكی‌تر . هەروەكوو میریش لەلای خۆیەوە ، بۆ ئیدامەپیّدانی پابەندی‌و دلّسۆزی‌ی وەزیرەكەی بۆ خۆی ، پیّویستە ئاگای لیّ‌ی بیّ‌و گیرفانی پڕ لە پارەوپوول بكاو بە نیشانو دەبدەبەیّ بەریّزی‌و گەورەیی دەوری بتەنیّ‌و سۆزی بۆ دەرببڕیّ‌و شەرافەتمەندی‌ی پیّ‌ببەخشیّ‌و پایەوپلەیەكی بەر پرسیارانەی ئەوتۆی پیّ‌بسپیّریّ كە ئەو پارەوپوول‌و دەبدەبەی بەریّزی‌و گەورەیی‌یەی بە سەریدا داباریّنراون ، هانی بدەن بۆ تەماعكردن لە دەسكەوتنی سامانی زۆرترو لەقەبی گەورەتر ، یا ئەو پایەوپلەیەی پیّ‌ی گەیشتووە تا ئەو رادەیە گرنگ‌بیّ كە ترسی لەدەس‌چوونی لەلا پەیدا بكا . ئینجا كاتیّ ئەم جۆرە پەیوەندی‌یە لە نیّوان میران‌و وەزیرەكانیدا دروست دەبیّ ، هەر لایەكیان دەتوانیّ پشت بەوی‌تریان ببەستیّ . بەلاّم ئەگەر وەزعەكە بە پیّچەوانەوە بوو ، ئەوا ئەنجام هەمیشە یا بۆ ئەملا یا بۆ ئەولا زەرەربەخش دەبیّ .

# ٢٣

# چۆنیەتی خۆ بە دوور گرتن لە کەسانی دووڕوو

من ئەو باسە گرنگەو لەرووخستنی ئەو زەللەیەش ناخەمە پشت‌گوێ‌ کە میران ئەگەر ژیرو بەحیکمەت نەبن ، یا ئەگەر هەڵبژاردنیان کۆك نەبێ ، زەحمەتە بتوانن بە ئاسانی خۆیانی لێ‌بەدوور بگرن . باسەکەشی کە مەبەستمە پەیوەندی‌ی بەو دووڕووە ماستاو کەرانەوە هەیە کە لە دەرباری پادشاو میرەکاندا گرد دەبنەوە . خەڵکی پیشەیان وەهایە دڵیان بەو ماڵ‌ومولّکە خۆش بێ‌ کە هەیانەو شانازی پیوەبکەن‌و خۆیانی پێ‌ چاوبەست بکەن . ئەمەش وایان لێدەکا کە نەتوانن خۆیان لەو پەتایە بپارێزن ، تەنانەت ئەگەر تەقەلای خۆلێ‌پاراستنیش بدەن ، دەکەونە بەر مەترسی‌ی گاڵتەپێکردنەوە . لەبەر ئەوە بۆ تۆ چاکترین ریگا بۆ خۆپاراستنت لە دووڕووەکان ، تێ‌گەیاندنی هەموو لایەکە کە ئەوانە بە راستی‌وتن لە حزوورتدا هیچ خراپەیەکت دەربارە ناکەن . هەرچەندە ئەگەر وای لێهات کە هەر کەسێك بێت‌و جەسارەتی راستی‌وتن لە رووتدا بکا ، رێزت لە لایان نامێنێ . بۆیە میری ژیرو ئاقڵ ئەو کەسەیە کە رێگای سێیەم دەگرێتەبەرو پیاوی دنیادیدەو بەحیکمەت بۆ کۆڕی دانیشتنی خۆی هەڵدەبژێرێ‌و ماوەی تەنیا ئەوان دەدا بە سەربەستی بۆی بدوێن‌و لەحزووریدا راستی

دەرببڕن ، بەڵام بە مەرجێك ئەو سەربەستیپێدانە تەنیا لەو باسانەدابێ کە خۆی پرسیاریان دەربارە لێدەکاو لەوە نەچێ بەولاوە . وەکی‌تر پێویستە ئەو لەلای خۆیەوە سەبارەت بە هەموو شت پرسیاریان لێ‌بکاو گوێ بۆ بیروڕایان رابگرێ‌و ئینجا ئەوسا بە شێوە تایبەتی‌یەکەی خۆی ، بیر لە باسەکە بکاتەوە . هەروەکوو دەبێ لەو کۆڕی دانیشتنانەدا لەگەڵ هەر یەکێك لە راوێژکارانیدا وەها بجووڵێتەوە دڵنیای بکا کە چەندە بە دڵسۆزی‌یەوە لەروو قسە بکا ، میر هێندە لێی‌رازی دەبێ . دوای ئەوە ئیتر پێویستە گوێ لە قسەی هیچ مرۆڤێك نەگرێ ، بەڵکوو خۆی لەبەر رۆشنایی بیروڕای راوێژکارەکانیدا لە باسەکە بکۆڵێتەوەو بڕیارێکی ئەوتۆی لەسەر بدا کە پاشگەزبوونەوەی تێدا نەبێ . بەڵام ئەو میرەی رێگایەکی جیاواز لەمە دەگرێتەبەر ، دەکەوێتە ژێر تەئسیری کەسانی ماستاوکەرو دووڕووەوەو سەرکێشانە کردار دەکا ، یا بە پێی ئەو بیروڕا جۆراوجۆرانەی دەدرێن بە گوێیدا بڕیارەکانی دەگۆڕێ‌و بەوە رێزو هەیبەتی خۆی لەدەس دەدا .

من لێرەدا نموونەیەکی نوێ بۆ باسەکە دێنمەوە . بری‌لۆکا کە یەکێکە لە دەست‌وپێوەندانی ئیمپراتۆری ئێستا مەکسیملیان ، [٩٧] وتوێتی کە خاوەن‌شکۆ لە هەموو ژیانیدا پرسی‌وڕای بە کەس نەکردوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا قەت شتێکی بە تەنیا بە پێی حەزو ئارەزووی خۆی نەکردوە ، چونکە هەمیشە بە پێچەوانەی ئەو شێوەیەوە جووڵاوەتەوە کە باسم‌کرد . ئەو لەبەر ئەوەی ئیمپراتۆرەو پیاوێکە لە حەشاردایەو دووری بە گەلێ نهێنی تەنراوە ، نیازو مەبەستی خۆی بۆ خەڵکەکە ئاشکرا ناکاو ئامۆژگاری لە هیچ کەسێکەوە وەرناگرێ . بەڵام کە دەس‌دەداتە بەجێ‌هێنانی نیازو مەبەستەکانی ، بۆ خەڵکەکە ئاشکرا دەبن‌و زوون دەبنەوەو ئەوسا ئەگەر دەست‌وپێوەندەکانی دەوروپشتی نارەزایی‌یان لەسەر دەربڕی ، ئیتر ئەویش هەر خێرا واز لە جێ‌بەجێ‌کردنیان دێنێ‌و نیازو مەبەستەکانی دەگۆڕێ . ئەنجامی ئەمەش وەها دەشکێتەوە کە ئەوەی دوێنێ کردوێتی ئەمڕۆ بەرپەرچی دەداتەوەو ئیتر هیچ کەس تێ‌ناگا ئاخۆ چی دەکاو نیازی چی هەیەو باوەڕیشیان بە راوێژو بیرکردنەوەی نامێنێ . لەبەر ئەوە میر دەبێ هەمیشە ئامۆژگاری بگرێتە خۆی ، بەڵام لە وەختێکدا کە ئەو

خۆی دەیەوێ ، نەك لە وەختێكدا كە كەسانی‌تر دەیانەوێ‌و بگرە ئەگەر خۆی داوای نەكردبێ ، نابێ بە هیچ كلۆجێ ماوە بدا تەقەلای ئاموژگاری‌كردنی بدرێ ، هەرچەندە پێویستە ئەو خۆی بە زیادەوە داوای بكاو باش گوێ بۆ ئەو راستی‌یانە شل بكا كە بۆی دەگێردرێنەوەو كە پرسیاری دەربارە كردوون . بەلأم لە راستیدا ، پێویستە ئەگەر سەیری كرد یەكێك لە راوێژكارەكانی لە وتنی راستیدا دوودڵە ، دەبێ توورە بێ . جا ئەگەرچی هەندێ كەس هەن رایان وایە كە ناوبانگی ئەو میرەی ناوی بە وردبینی‌و ژیری دەردەچێ نادرێتە پاڵ تەبیعەتی خۆی ، بەڵكوو دەدرێتە پاڵ شارەزایی راوێژكارەكانی دەوروپشتی ، بەلأم من دەڵێم ئەم رایەتەواو چەوتە . چونكە بنەمایەكی گشتیان هەیە كە دەڵێ : ئەو میرەی سیفەتی حیكمەتی تێدا نەبێ ، كەڵكی ئەوەی نابێ رێگای چاكەی نیشان بدرێ ، مەگەر سەروبەر خۆی بخاتە ژێر دەستی تاقە كەسێكەوەو بە تەواوەتی بكەوێتە ژێر ركێفی‌یەوەو كەسەكەش پیاوێكی ئاقڵی وردبین بێ . لەم حاڵەتەدا رەنگە میر حوكمرانی‌یەكی باش بكا ، بەلأم ئەم وەزعە درێژە ناكێشێ ، چونكە جڵەوبەدەستەكە زۆری پێ‌ناچێ دەسەلأت‌و دەوڵەتەكەی لێ‌زەوت دەكا . هەروەها ئەو میرە دوورلەحیكمەتە ئەگەر هات‌و راوێژی بە زۆر كەس‌كرد ، ئەوا ئامۆگاری‌یەكی بەكۆمەڵی یەكگرتووی دەس ناكەوێ ، لەبەر ئەوەی ناتوانێ گشت ئەو بیروڕایانە یەك بخا كە پێ‌یرادەگەیەنرێن تا شێوەی كۆمەك وەربگرن‌و بگرە راوێژكاران دەكەونە بیركردنەوە لە سوودی خۆیان ، لە كاتێكدا ئەو لە وزەیدا نابێ بیانخاتەوە سەر رێگای راست یا تەنانەت تێ‌بگا . ئەمەش كارێكەو خۆلێدەربازكردنی بۆ نی‌یە ، چونكە خەڵكی پیشەیان وەهایە چاوەشەت بكەن . مەگەر پێویستی‌یەكی كاریگەر ناچاری راستگۆیی‌یان بكا . كەوابێ دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئامۆژگاری‌كردنی حەكیمانە لە هەر كەسێكەوە بێ ، پێویستە ملكەچی حیكمەت‌و وردبینی‌ی میر بێ‌و ناشێ وردبینی‌ی میر سەرشۆڕی ئەو ئامۆژگاری‌یانە بێ كە پێشكەشی دەكرێن ، چەندە راستگۆش بن .

٢٤

# ئایا میرەکانی ئیتالیا بۆچی دەوڵەتەکانیان لەدەست چوو ؟

ئەگەر تازەمیرێك بە حیکمەت و وردبینی‌یەوە ، پەیرەوی ئەو شتانەی کرد کە لەوەبەر باسم کردن . ئەوا لە میرایەتی کردنەکەیدا رەسەن دەردەچی و لە دەوڵەتەکەیدا لەوە دڵنیاترو ئاسوودەتر دەبێ وەك لەوەی تیایدا خاوەنی رەگ و ریشەیەکی بنج قووڵی کۆن بووبێ . چونکە ئاسایی‌یە کە تازەمیرەکان زیاتر لە میرە میراتگرەکان لە ژێر چاودێری کردندا بن . ئینجا کاتێ کە خەڵکەکە دان بە چاکەکاری‌یاندا دەنێن ، ئەوسا زۆر زیاتر لە دەوریان کۆدەبنەوە وەك لەوەی خاوەنی خوێنێکی پادشایانەی رەسەن بوونایە . خەڵکەکە کاروباری حازربەدەستیان زیاتر لە کاروباری رابووردوو لا مەبەستە . چونکە وەختێ لە حاڵی حازریاندا هەست بە خۆشگوزەرانی دەکەن ، دڵ و دەروونیان دەحەوێتەوەو ئیتر لە هیچ شتێکی‌تر ناگەرێن ، بەڵکوو بە پێچەوانەشەوە مادامەکی میرەکە دەستەوستانی‌ی خۆی لە کاروباری‌تردا نانوێنێ ، ئەمان بۆ پارێزگاری لێکردنی هەرچی‌یەکیان لە تواناداێ دەیکەن . بەم جۆرە تازەمیر سەربڵندی‌یەکی دووسەرە لە دامەزراندنی دەوڵەتە نوێ‌یەکەیداو گەشەپێ‌سەندنی بە

یاسای دادپەروەرانەو چەکی بەهێزو دۆستانی دڵپاك ، بەهاو نەریتی خێرخواهانە بەدەس دێنێ . لەکاتێکدا عەیب‌وعاری میری میراتگریش هەروەها دوو سەرە دەبێ ، چونکە بە میری لەدایك بووەو بە هۆی بێ‌بەشی‌یەوە لە وردبینیو حیکمەت ، تەختی پادشایی‌یەکەی لەدەس دەدا .

ئەگەر پیاو لە وەزعی ئەو حوکمرانانە بکۆڵێتەوە کە لە ڕۆژانی ئێستاماندا لە ئیتالیادا پایەوپلەی خۆیانیان لەدەس چووە ، وەك پادشای ناپۆلیو دۆقی میلانو کەسانی تریش ، بۆی دەردەکەوێ کە هەموو لە عەیبێکدا کە پەیوەندی‌ی بە هێزی سەربازی‌یانەوە هەیەو لەوەبەر هۆیەکانیم بە دوورودرێژی شی‌کردنەوە ، هاوبەشن . هەروەکوو دەبینێ کە هەندێکیان دوژمنایەتی گەل بەشیان بووەو هەندێکی‌تریان سەرەرای خۆشەویستی‌ی گەل بۆیان ، نەیانتوانیوە پشت بە خۆشەویستیو دڵسۆزی‌ی سەردارانیان ببەستن . ئەم عەیبانە لە کایەدا نەبن دەوڵەت لەدەس ناچێ ، بەتایبەتی ئەگەر هێندەی هێز لە باردا بێ کە بتوانێ لەشکرێك لە مەیداندا لە سەرپێ بهێڵێتەوە . بۆ نموونە فیلیپی مەکدۆنیایی ، مەبەستم لە باوکی ئەسکەندەری گەورە نی‌یە ، بەڵکوو لەو میرەیە کە تیتۆس کۆنیتیۆس سەری پێ‌شۆڕکرد ، دەوڵەتێکی گەورەی وەهای نەبوو لەگەڵ مەزنی‌ی ڕۆماو یۆناندا کە هێرشیان بردە سەری بەراورد بکرێ ، بەڵام پیاوێکی عەسکەری‌ی ئەوتۆ بوو کە بۆ خۆخۆشەویست‌کردن لای گەلو دڵنیابوون لە گەورە پیاوان ، دەرکی بە ڕێگا نموونەیی‌یەکە دەکرد ، بۆیە توانی بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر بەرگەی قورسایی جەنگ دژی هەردوو دەوڵەتە گەورەکە بگرێ . ئەو ئەگەرچی لە کۆتاییدا دەسەڵاتی بەسەر چەند شارێکدا لەدەس چوو ، بەڵام هێندەی توانا هەر بۆ مایەوە کە مەملەکەتەکەی خۆی بپارێزێ .

کەوابوو ئەو میرانەی کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ مەملەکەتەکانی خۆیان پاراستووە دوایی لەدەستیان داون ، دەبێ گلەیی لە بەخت نەکەن ، بەڵکوو دەبێ گلەیی لە تەوەزەلی خۆیان بکەن ، چونکە لە ڕۆژانی خۆشگوزەرانیو ئاشتیدا بیریان لەوە نەکردوتەوە کە دەشێ ڕۆژانێکی ڕەش دابێن (بەتایبەتی ئەو هەڵەیە لە ناو خەڵکیدا باوە کە لە کاتی بائی شەماڵدا حیساب بۆ ڕەشەبا ناکەن) .بۆیە هەر هێندەی ساتی

نەهامەتی‌یان هاتبێتە پێشەوە ، لە بری پارێزگاری‌کردن لە وڵات‌و میرایەتی‌یەکەیان ، یەکسەر بیریان بۆ هەڵاتن چووە ، بەو هیوایەی گوایە گەل کە دەشێ گەوجێتی‌ی داگیرکەران بیوروژێنێ ، ڕۆژێك لە ڕۆژان داوای گەڕانەوەی لێ‌بکا . خۆ ڕەنگە ئەگەر هیچ چارەسەرێك بە دەستەوە نەما ئەمەیان شتێکی باش بێ ، بەڵام پشت‌گوێ‌خستنی چارەسەرەکانی تر و پەنابردنەبەر تەنیا ئەمیان گەوجێتی‌یە ، چونکە هیچ کەسێك نی‌یە حەز بکا بکەوێ بەو هیوایەی گوایە مرۆڤێکی‌تر هەیە لە کەوتنەکەی ڕزگاری بکاو هەڵیبسێنێتەوە . ئەم ڕزگارکردنە ڕەنگە ڕووبدا یا نەدا ، بەڵام ئەگەر ڕووی‌دا دیارە ئاسوودەگی‌و سەرسەلامەتیت بۆ ناهێنێ ، لەبەر ئەوەی تۆ نەتتوانیوە خۆت ڕزگار بکەیت ، بەڵکوو وەك ترسنۆکێك بۆ ئەو خۆڕزگارکردنە پشتت بە کەسانی‌تر بەستوەو ئیتر هیچ ڕێ‌وشوێنێکیشت بۆ خۆپاراستن سوودی نابێت‌و بەردەوام کۆت‌کراو دەبن ، مەگەر تەنیا بەندی خۆت‌و توانا‌و دەسەڵاتی خودی خۆت بن .

●

## ٢٥

# کاری پلاری قەدەر لە کاروباری مرۆڤداو رێ و شوێنی بەرەکانی کردنی

من لەوەبێ ئاگا نیم کە زۆر کەس لە رابوردوودواو هەتا ئیستاش باوەڕیان وایە کە هەرچی کارەسات و رووداوێکی دنیایی هەن ، لە ژێر دەسەڵاتی قەزاو قەدەرداندو خودا جڵەوگیریانەو ئادەمیزاد لە وزەیدا نی‌یە لە رێگەی حیکمەت و تێبینینەوە بیانگۆڕێ و ئاڵشتیان بکاو بە هیچ کلۆجێکیش چارەسەری بۆ نی‌یە . واتە تەقەلادانی ئادەمیزاد بۆ رەتکردنەوەی فەرمانی قەزاو قەدەر ، کۆششێکی بێپەروایەو دەبێ جڵەو بۆ کاروبار وەها شل بکا کە بەخت چۆنی دەوێ وەها بڕوا . ئەوانەی لە سەر ئەم رایەن ، بە هۆی ئەو ئاڵ‌وگۆڕە گەورانەوەی دیمانن و تا ئیستاش هەموو رۆژ دەیانبینین و سەروو بیرو هۆش و بۆچوونی مرۆڤن ، ژمارەیان لەم سەردەمی ئێمەدا زۆر بووە . من خۆیشم کە بیر لەو ئاڵ‌وگۆڕانە دەکەمەوە ، هەندێ جار مەیلم بەلای هاوبەشی‌کردنی رایەکەی ئەو کەسانەدا دەچێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم وایە کە ناتوانین ئیرادە بە تەواوی پشت‌گوێ بخەین . بە رای من هەقە پیاو وای دابنێ کە قەزاو قەدەر جڵەوگیری نیوەی کردارەکانمانەو ئیتر نیوەکەی‌تری یا نزیکەی ، وازلی‌هێناوە بۆ خۆمان جڵەوگیری بین . من حەز دەکەم قەزاو قەدەر بەو رووبارە خوڕو بەهەڵمەتە بشوبهێنم کە لە کاتی

هەڵچوون و شاڵاوبردنیدا ، دەشت نوقوم دەکاو درەخت هەڵدەکەنێ و خانووبەرە دەڕووخێنێ و زەوی لەملا هەڵدەکۆڵێ و تووری هەڵدەداتە ئەولا ، خەڵکەکەش لە روویدا هەڵدێن و هەموو شت مل بۆ شۆڕشە بێ ئامانەکەی دەدا ، بەبێ ئەوەی کەسێك بتوانێ بەربەرەکانێی لە گەڵدا بکا . جا ئەو ئەگەرچی ئەمە سروشتێتی ، بەڵام ئەو تەبیعەتەشی هەیە کە بە دوایدا دەگەڕێتەوە سەر باری هێمنی و ئەوسا خەڵکەکە دەتوانن بە دروستکردنی بەست و چەپەرو کەناربەندو چی تر پێویست پێ خۆیانی بۆ ئامادە بکەن ، تا ئەگەر بۆ جاری ئاینده ئاوەکەی زیادی کردەوە دابڕژێتە ناو کەنداوێکەوە ، یا شاڵاوەکەی ئەو مەترسی و شێتی یەی لەوزەدا نەمێنێ . حاڵەتی قەزاو قەدەریش کە لەبەر خۆئامادەنەکردن بۆ بەربەرەکانێ کردنی ، دەسەڵاتی خۆی دەسەپێنێ و شۆڕشەکەی خۆی ئاراستەی ئەو شوێنانە دەکا چەپەرو بەستیان بۆ جڵەوگیرکردنی تێدا نەخراوەتە سەر رێگا ، هەر لەم بابەتەیە . ئینجا ئەگەر سەیری ئیتالیا بکەیت کە بۆتە کۆڕی ئەو ئاڵوگۆڕە گەورانەو خەڵکەکەیان ناچاری باوەڕهێنان بەو رایە کردوە ؛ دەبینیت وڵاتێکە کە بەهیچ جۆرێك هیچ بابەتە چەپەرو بەستێکی تێدا نین . بۆیە ئەگەر وەك ئەڵەمانیاو ئیسپانیاو فەرەنسا بۆی بلوایە بە رێوشوێنی راست و دروست پارێزگاری لێ بکرێ ، ئەوا لافاوەکە ئەو ئاڵوگۆڕە گەورانەی پێ نەدەکران ، یا لافاوەکە هەر لە بنەڕەتەوە رووی نەدەدا .

واتێدەگەم ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی دەربارەی رێوشوێنەکانی بەربەرەکانێ کردنی قەزاو قەدەر وتم بەسە . بەڵام ئەگەر بمەوێ خۆم بە هەندێ مەسەلەی دەسنیشانکراوەوە ببەستمەوە ، ئەوا دەتوانم بڵێم : سەیر دەکەین ئەمرۆ وا فڵانە میر ئەستێرەی لەوپەڕی گەشانەوەدایە ، کەچی بۆ سبەینێ دەیبینینەوە لە ژێر پێدا شێلراوە بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکمان لە تەبیعەتیدا یا لە هەر شتێکی تریدا کەوتبێتە بەرچاو . من بە دڵنیایی یەوە لەو باوەڕەدام ، گۆڕانکاری یەکە بەرادەی یەکەم ئەنجامی ئەو هۆیانەیە کە لەوەبەر بە دوورودرێژی شیمکردنەوە ، یا بە واتایەکی تر میرەکە سەروبەر خۆی داوەتە دەست قەدەرو ئیتر وەختێك پێچەی قەدەرەکە بەپێچەوانەوە سووڕاوەتەوە ، شێلاوێتی . هەروەها من باوەڕم وایە کە ئەو مرۆڤەی شێوەی

ڕێوشوێنەکانی لە گەڵ پێویستی‌یەکانی ڕۆژگاردا بگونجێ بەختەوەرەو ئەوەشی لە ڕێوشوێنەکانیدا بە پێچەوانەی ئەو پێویستی‌یانەوە بێ بەدبەختە . خۆ ئێمە دەبینین چۆن خەڵکەکە لەو ڕێوشوێنانەدا کە هەمیشە بۆ گەیشتن بە پایەبڵندی‌و دەوڵەمەندی پەیرەویان دەکەن ، یەك لە یەکتر جیاوازن . هەیانە پەنا دەبەنە بەر سڵکردنەوەو هەیانە سەرکێشی هەڵدەبژێرن ، یا هەیانە ڕێگای جەربەزەیی دەگرنەبەرو هەن فرت‌وفێڵ‌و زۆرزانی بەکاردێنن ، یا تیایاندایە سەبرگرن‌و بە سەبر دەجووڵێنەوەو هەن بەپەلەن‌و هەمووش ڕەنگە بە ئامانج بگەن . یاخود دەشێ دوو مرۆڤ لە سڵکەرەوەکان ببینین کە یەکێکیان لە پرۆژەکانیدا سەرکەوتن بەدی‌دێنی‌و ئەویتریان ژێردەکەوێ . یا لەولای ترەوە دوو کەس بە دوو شێوەی جیاواز دەگەنە یەك ئامانج ، یەکەمیان بە سڵکردنەوەو سەبرگرتن‌و ئەوی‌تریان بە پەلەپەل‌کردن‌و سەرکێشی . ئەمانە هەموو ئەنجامی جیاوازی‌ی تەبیعەتی ڕۆژگارن کە دەشێ لە گەڵ شێوەی ڕێوشوێنەکەدا بگونجێ یا نەگونجێ . ئەمەش وەك وتم ئەوەی لێدەوەشێتەوە کە دوو کەس بە دوو شێوەی جیا لە یەکتر کردار دەکەن‌و کەچی دەگەنە یەك ئەنجام ، لە کاتێکدا دوو کەسی‌تر بە یەك شێوە کردار دەکەن‌و کەچی یەکەمیان سەردەکەوێ‌و دووەمیان سەرناکەوێ . هەروەها ئاڵ‌وگۆڕ لە سەرکەوتن‌و گەشەسەندنیشدا هەر لە سەر ئەمە وەستاوە ، چونکە دەشێ ڕووبدا هۆیەکانی ڕۆژگارو بارودۆخ بۆ کەسێك کە بە وریایی‌و جوان‌بینی‌یەوە کردار دەکا لەبار بێت‌و سەرکەوتن بەدەس بێنێ ، بەڵام‌زۆری پێ‌نەچێ ئەو هۆیانەی ڕۆژگارو بارودۆخ بگۆڕدرێن‌و ئەویش لەبەر نەگۆڕینی شێوەی ئیشکردنی خۆی لێ‌بکەوێ . قەتیش ڕووی نەداوە مرۆڤێك هەبووبێ هێندە ژیرو وردبین بووبێ کە خۆی لە گەڵ هەموو ئەم هۆیانەدا گونجاندبێ ، ئەویش یا لەبەر نەتوانینی خۆلادانە لەو شتانەی بە تەبیعەت حەزی لێ‌یانە ، یاخود لەبەر ڕاهاتنی بە یەك جۆرە ڕێگای گەیشتن بە سەرکەوتن‌و نەتوانینی بەخۆقایل‌کردن بۆ وازلێهێنانی . بۆیە ئەو کەسەی بە سەبرگرتن ڕاهاتبێ ، وەختێ کار پێویست بە خێراکردن بکا ، لە ئاستی خۆلەگەڵ‌گونجاندنیدا خۆی بە دەستەوستان دەبینی‌و ئیتر بە دوایداماڵکاولی ڕووی تێدەکا . بەهەرحاڵ ئەگەرچی مرۆڤ لە توانایدایە بە پێی گۆڕانی ڕۆژگارو بارودۆخ سروشتی خۆی

بگۆڕێ ، بەڵام قەدەر هەرگیز گۆڕانی بۆ نییە .

بۆ نموونە پاپا یۆلیۆسی دووەم لە گشت کردارەکانیدا کابرایەکی سەرکێش بوو ، بەڵام ڕۆژگارو بارودۆخ لە گەڵ ئەو شێوەی ئیشکردنەیدا دەگونجان ، بۆیە بەردەوام ئەنجامی باشی دەسگیر دەبوو . بۆ نموونە با ئێستا لە یەکەم جەنگی بکۆڵینەوە دژی بۆلۆنا بەرپای کردو هێشتا جیۆڤانی بێنتیڤۆگلی لە ژیاندا مابوو ، کە ڤینیسیایی‌یەکانو هەروەها پادشای ئیسپانیاش لەو جەنگە رازی نەبوون ، جگە لەوەی فەرەنسا سەبارەت بەم پرۆژەیە هێشتا لە گەڵیدا لە راوێژکردندا بوو . کەچی لەگەڵ ئەوەشداو ئەنجامی ئەو مەیلی سەرکێشی‌یە توندوتیژەی ، خۆی بە تەنیا ملی بە پەلاماردانەکەیەوە ناو ئەم بزوتنەوەیەی بووە هۆی رارایی لە هەڵوێستی ڤینیسیایی‌یەکانو ئیسپانیادا ، ئەویش بە هۆی سڵکردنەوەی ڤینیسیایی‌یەکانو ئارەزووی ئیسپانیاوە بۆ وەرگرتنەوەی تەواوی مەملەکەتی ناپۆلی لە لایەکەوەو توانینی راکێشانی پادشای فەرەنسا بۆ پاڵ خۆی لە لایەکی ترەوە ، چونکە ئەمیش کەسەیری‌کرد وا ئەو ملی بە بزوتنەوەکەیەوە ناوەو بە نیازی دۆستایەتی‌بەستن لە گەڵیداو سەرپێ شۆڕکردنی ڤینیسیایی‌یەکان لە رێگەی ئەو دۆستایەتی‌یەوە ، بڕیاری‌دا کە ناچارەو هەر دەبێ هێزێك بۆ یاریدەدانی بنێرێ ، بەبێ ئەوەشی رەتکردنەوەی بە کردەوەیەکی ناشیرین بداتە قەڵەم . بەم جۆرە یۆلیۆس لە رێگەی سەرکێشی‌ی خۆیەوە توانی ئەوەی پاپاکانی‌تر بۆیان نەکرابوو لە رێگەی جڵەوگیری‌و ئەقڵیەکاهێنانەوە بەدی بێنن ، ئەم بەدی‌ی بهێنێ . خۆ ئەگەر چاوەڕوانی بکردایە تا هەرچی پێویست بوو دەکراو پێش جی‌هێشتنی رۆماو کەوتنەڕێ بەرەو جی‌بەجی‌کردنی پرۆژەکەی ، هەموو شت ساز ببووایە کە مسۆگەر هەر پاپایەکی‌تر لە جی‌ی ئەو بووایە وەهای دەکرد ، نەدەگەیشتە ئامانجو سەرکەوتنی بەدەس نەدەهێنا ، چونکە بێگومان پادشای فەرەنسا هەزارویەك بەهانەی بۆ قایل‌کردنی بە پێویستی‌ی چاوەڕوانکردن بۆ دەدۆزی‌یەوەو کەسانێکی‌تریش هەزارەها ترس‌و خۆفی دڵی خۆیانیان پێڕادەگەیاند . من ئیتر قسە لە کردارەکانی‌تری ناکەم کە هەموو لەم بابەتە بوون‌و هەمووش بە سەرکەوتن کۆتایی‌یان هات . بەڵام گومانیشی تێدا نی‌یە کە تەمەنکورتی‌یەکەی لە تاقیکردنەوەی ژێرکەوتن بەدووری گرت ، چونکە ئەگەر ژیانی

درێژەی بکێشایەو ئانوساتی وەهای لەبەردەمدا قوت ببوونایەتەوە کە ناچاریان بکردایە بە وریایی و ئاقلانەوە کرداربکا ، مسۆگەر چارەنووسی ماڵوێرانی دەبوو ، لەبەر ئەوەی لەوە دەستەوستانتر دەبوو بتوانێ لەو ڕێوشوێنانە لابدا کە بە تەبیعەت مەیلی بە لایاندا هەبوو .

ئیتر من کۆتایی بە قسەم دێنم و دەڵێم کە بەخت ئاڵوگۆڕ دەکا ، بەلام خەڵکەکە ڕێوشوێنی خۆیان ناگۆڕن و تا ئەو وەختەی ڕێوشوێنەکان لە گەڵ بارودۆخدا بگونجێن ، ئەوان لە سەرکەوتندا دەبن و وەختێکیش لە گونجاوی دەکەون ، ئەوا ژێرکەوتن بەشیان دەبێ . هەروەکوو من باوەڕم وایە کە سەرکێشی کردن لە سڵکردنەوە باشترە ، چونکە بەخت وەك ئافرەت وایە ، ئەگەر ویستت دەستی بە سەردا بگریت دەبێ بە زۆر زەوتی بکەیت و ئەویش لەلای خۆیەوە ، ماوەی زەوت کردنی بە پیاوی ئازا دەدا ، نەك بەو کەسەی لەسەرخۆو بەسەبرەوە لە گەڵیدا دەجووڵێتەوە . بۆیە ڕەفتاری بەخت وەك ڕەفتاری ئافرەتەهەمیشەمەیلی بەلای لاواندا دەچێ ، چونکە کەمتر سڵ دەکەنەوەو زیاتر چەتونن و بە بێ شەرمی و جەسارەتەوە بەخت دەکەنە موڵکی خۆیان .

٢٦

# هاندان بۆ ئازادکردنی ئیتالیا لەدەست دڕندەکان (٩٨)

ئێستا دوای کۆڵینەوە لە هەموو ئەو کاروبارانەی باسم کردن‌و دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر لەوەی کە ئایا ڕۆژگاری ئیستای ئیتالیا بۆ سەرهەڵدانی میرێکی نوێ لەبارە یان ناو ئایا ئەو بارودۆخەی کە لەئارادەیە ، هەلی بۆ پەیدابوونی پیاوێکی لێهاتووی بەشان‌وشکۆی ئەوتۆ نەرەخساندوە ، رژێمێکی نوێی وەها بێنێتە کایەوە کە سەربەرزی بەوو خێروخۆشی بە جەماوەری گەل ببەخشی ، دوای ئەمانە وام بۆ دەرکەوت کە گەلێ هۆ بۆ پشتگیری‌کردنی راست‌بوونەوەی حوکمڕانێکی نوێ هەن‌و بە شێوەیەکیش کە بۆ ئەم پرۆژەیە هێندە پەسندو لەبارن کە لە رابوردوودا وێنەیان نەبووبێ . وەك لەوەبەر وتم ، ئەگەر بۆ دەرکەوتنی بەهێزیی موسا ، کۆیلەیەتی ئیسرائیلییەکان لە میسرداو بۆ ئاشکرابوونی ئازایی‌و مەزنیی کۆرش ، چەوساندنەوەی فارسەکان لەلایەن میدییەکانەوەو بۆ سەلماندنی بلیمەتی‌و گەورەیی تیسیۆس ، پەرت‌پەرتی‌و

پەرەوازەبوونی ئەسیناییەکان پێویست بووبن ، ئەوا لە ئیستادا بۆ دان‌نان بە هێزداری‌ی بلیمەتێکی ئیتالیاییدا ، دەبێ ئیتالیا لەو بارودۆخەدابێ کە لە حالی حازردا تیایدایەو خەڵکەکەی لە جوولەکە کۆیلەترو لە فارسەکان چەوساوەترولە یۆنانی‌یەکان پەرتپەرتتر بن وەك هەن‌و پێشەواو رژێمیان نەبێ‌و بەزێنراوو سەروەت‌و سامان تالانکراوو پەرت‌پەرت‌و زەلیل‌و ریسوا بن وەك بوون‌و ولاتەکەشیان لە هەمە شێوەو بابەت وێرانکاری‌و خاپووربوونی بە خۆیەوە دی‌بێ ، وەك دیوێتی .

ئینجا هەرچەندە تیشکێکی هیوا خۆی نواندو نیشانی‌دا کە خودا مرۆڤێکی بۆ رزگارکردنی هەڵبژارد ، بەلام ئەو مرۆڤە وەختێ گەیشتە پۆپەی سەربلندی ، بەخت پشتی تێکردو کە لای خست . بەم جۆرە ولات لەوە نزیك بووەوە جوولەی ژیانی تێدا نەمێنی‌و بکەوێتە چاوەروانکردنی ئەو مرۆڤەی بتوانێ زامەکانی تیمار بکاوکۆتایی بە کاولکاری‌و تالانکردن لە لۆمبارددیاداو چاوچنۆکی‌و زەوتکاری بە ئاشکرا لە مەملەکەتی ناپۆلی‌و تۆسکانیادا بهێنی‌و ئەو برینانەی **چاك‌بکا** کە لە دەمێکەوە کێم‌وزوونیان هێناوەتەوە . بەڵێ ئەوەتا ئیتالیا رۆژانە لە خودا دەپارێتەوە کە یەکێکی بۆ بنێری‌و لەم پۆرخزی یە لەرادەبەدەرو گەوجێتی‌یە کوێرانەیە رزگاری بکا . ئەو ئامادەیەو بە پەرۆشەوەیە بچێتە ژێر هەر ئالایەکەوە ، بە مەرجێ یەکێك هەبێ ئالاکە هەڵبگری‌و بەرزی بکاتەوە . ئەو لە ئێستادا ، تکاو هیواو ئاواتی تەنیا هێندەیە کە بنەماڵە بەناوبانگەکەی تۆ ببینێ دەوری سەرکردایەتی‌کردن لە بزوتنەوەی رزگاری‌خوازی‌یەکەدا بگێرێ ، بەتایبەتی کە هێز لە گەڵیدایەو سەرفرازی‌ی پێدەبەخشی‌و بەخت هاوسۆزیێتی‌و خوداو کلێسەشی لە تەکدان ، چونکە ئێستا بنەماڵەکەت فەرمانرەوایی کلێسە دەکەن‌و ئەگەر تۆ بەردەوام ژیانی ئەو پیاوە ناودارانەو کردارە پر شانازی‌یەکانیانت لە یاد بن کە باسم‌کردن ، ئەوەت لێ‌نایێتە کارێکی ستەم‌و زەحمەت . جا ئەگەرچی ئەو بابەتە گەورەپیاوانە وێنەیان کەمە ، بەلام بەهەرحال ئەو پیاوە مەردانە ئەم هەلەی ئێستایان بۆ هەڵنەکەوتوە ، چونکە پرۆژەکانیان لە پرۆژەکەی تۆ عادیلانەترو ئاسانتر نەبوون‌و خوداش هێندەی لە گەڵ تۆدایە لە گەڵ ئەواندا نەبووە . کەوابێ لێرەدا مەسەلەیەکی عادیلانە لە ئارادایەو شتێکیش عەدالەتی تێدابێ هەمیشە

جوان دەنوێنێ‌و دەبێتە پێویستی‌یەك‌و هیچ هێزێك لە هەر بابەتێك بێ‌و لە هەر لایەکەوە بیزوێ ، لە توانایدا نابێ بیرووخێنێ‌و لەناوی بەرێ . ئیرادە هەرە مەزنەکە هەر لەمەدایەو کە ئیرادەش هەبوو گرفت‌و زەحمەتی لە کایەدا نامێنێ ، بە مەرجێك پەیرەوی ئەو رێ‌وشوێنانە بکەیت کە وەك نموونە بۆتم هێنانەوە . جگە لەمانە ، خودا گەلێ مووجیزەی بێ‌وێنەی بەدی‌هێناون . ئەوە زەریاکان‌و رێگایان خۆش‌و بەربەرەڵلان ، هەور شوێن‌هەنگاوی بۆ نیشانە کردوویت ، ئاو لە بەردی رەقەوە هەڵقوڵاوە ، ئاسمان بارانی سەبووری‌و دڵدانەوەی باراندوەو هەموو شت بەشداری‌یان لە سازدانی گەورەییتدا کردوە ، تەنیا بە مەرجێك کە تۆ ئەوەی ماوەتەوە تەواوی بکەیت . خودا خۆی هەموو شت جێ‌بەجێ ناکا ، بەڵکوو ماوە بۆ ئیرادەی سەربەستمان دەهێڵێتەوە کە بکەوێتە کارو رێگامان دەدا هەندێك لە سەربڵندی‌یەکە بە نەسیبی ئێمە بێ کە ئەوە هەق‌و بەشی خۆمانە .

شتێکی سەیریش نی‌یە کە هیچ کام لەو ئیتالیایی‌یانەی لەوەبەر باسم‌کردن نەیتوانی بێ ئەوەی لە بنەماڵە سەربەرزەکەی تۆ چاوەروان دەکرێ بەجێ‌ی بێنێ . سەرهەڵنەدانی لێهاتوویی لە رووی سەربازی‌یەوە لەو شۆرشە زۆرانەداو لەو چەندین بزوتنەوە نیمچە سەربازی‌یانەدا کە لە ئیتالیادا روویان داوە ، لەوەوە هاتووە کە رێ‌وشوێنە کۆنەکان کەڵکیان نەبووەو کەسێکیش پەیدا نەبووە بتوانێ رێ‌وشوێنی نوێ بدۆزێتەوە . بۆیە داهێنانی یاساو رێ‌وشوێنی نوێ لە لایەن مرۆڤی تازەهەڵکەوتووەوە بۆی دەبێتە مایەی مەردایەتی‌یەکی بێ‌هاوتا . ئینجا وەختێکیش ئەم کاروبارانە لە سەر بنچینەیەکی دروست دادەنرێن‌و مانای مەزنی دەبەخشن ، داهێنەرەکەیان بە رێزلێنان‌و دەست بەسنگەوە بۆگرتن پێشوازی لێدەکرێ . هەروەکوو لە ئیتالیادا ماوە بۆ داهێنانی هەر جۆرە رێك‌وپێکی‌یەکی نوێ بەربڵاوەو چاکەکاری لای هاووڵاتی‌یان هێجگار زۆرە ، ئەگەر سەرۆك‌و پێشەواکان خۆیان لی‌ی بێ‌بەش نەبن . تۆ هەروا بروانە ئەو رمبازێن‌و زۆرانبازی‌یەی لە لایەن ژمارەیەکی کەم رمبازو زۆرانبازانەوە دەکرێ‌و ئەوسا دەبینیت کە ئیتالیایی‌یەکان لە بەهێزی‌و شارەزایی‌و زیرەکیدا چەندە لەپێشن . کەچی کە دێینە سەر باسی لەشکرو سوپا ، دەبینین ئیتالیایی‌یەکان تیایدا

چەندە دواکەوتوون . ئەمەش بێگومان بە هۆی لاوازیی پێشەواکانەوەیەو ئەوانەشیان کە شارەزان تاعەت ناکرێن . دیارە هەموو کەس خۆی بە شارەزاو زانا دێتە بەرچاو ، بەتایبەتی لە حاڵەتی نەبوونی ئەو جۆرە پێشەوایەدا کە لە ڕێگەی ئازایەتیو بەختەوە بە بەیژەی مەزنیدا سەرکەوتنیو تاعەتی خۆی بە سەر ئەوانی تردا سەپاندبێ . بەم شێوەیە دەبینین کە لە ماوەیەکی دوورودرێژەوەو لە هەموو جەنگەکانی ماوەی بیست ساڵی رابوردوودا ، لە هەر شوێنێکدا لەشکرێکی ساغ ئیتالیایی هەبووبێ ، ئەو لەشکرە شکستەیی خۆی سەلماندوە ، وەك لە تارۆو ئەسکەندەرییەو کاپواو جەنەواو ڤاییلاو بۆلۆناو میستریدا رووی‌دا .

بەم پێیە ، ئەگەر بنەماڵە جوامێرەکەی ئێوە دەیەوێ شوێن‌پێی ئەو پیاوە مەزنانە هەڵبگرێ کە وڵاتی خۆیانیان رزگارکردوە ، ئەوا تۆ بەر لە هەموو شتێكو وەك بناغەیەك بۆ هەر پرۆژەیەك لە پرۆژەکانت ، لە سەرت پێویستە کە دەوری خۆت بە هێزێکی تایبەتی بتەنیت ، چونکە هیچ لەشکرێك لەم جۆرە لەشکرە دڵسۆزترو راستگۆترو بەتواناتر بۆ شەرکردن نابێ . هەروەکوو سەربازەکانی چەندە لەوەبەر ئازاو جەنگاوەر بووبن ، کاتێ کە لەم لەشکرەدا یەکدەگرنو بە چاوی خۆیان دەبینن چۆن میرەکەیان سەرکردایەتی‌یان دەکاو دەیانخاتە ژێر باڵی خۆیەوەو سۆزیان دەداتێ ، ئەوسا چاکترو رێكوپێك‌تر دەبن وەك لەوەبەریان . بۆیە تۆ دەبێ هێزێك لەم بابەتە ئامادە بکەیت ، هەتا بتوانیت بە هێزی تەنیا ئیتالیا خۆی ، لە رووی بێگانەدا پارێزگاری لە وڵات بکەیت . بۆ نموونە سویسراییو ئیسپانیایی‌یەکان ئەگەرچی بە جەنگاوەرێکی دڕ دادەنرێن ، بەڵام هەر یەکەیان کەموکووریی خۆی هەیە ، لەبەر ئەوە هەڵبژاردنی شێوەیەکی سێیەم بۆ رێكوپێکی ، نەك تەنیا توانای بەرهەڵستی‌کردنیانت پێدەبەخشێ ، بەڵکوو وات لێدەکا لە زاڵبوون بە سەریاندا دڵنیا ببیت . ئیسپانیایی‌یەکان بەرگەی هێرشی سوارە ناگرن . هەروەکوو سویسرایی‌یەکانیش لە رووبەرووبوونەوەی ئەو هێزە پیادەیەدا کە بە جەسارەتو باوەڕ پتەوی‌یەوە پەلاماریان دەدەن ، سڵ دەکەنەوە . هەر ئەمەشە کە وەك تاقیکردنەوە سەلماندوێتی ، بۆتە هۆی ئەوەی ئیسپانیایی‌یەکان نەتوانن لە بەرامبەر هێرشی فەرەنسایی‌یەکاندا

رابوەستن‌و سویسرایی‌یەکانیش لە رووی پیادەی ئیسپانیادا خۆیان پی‌ڕانەگیرێ . جا هەرچەندە نموونە بۆ دوا راستی قەت بەدەس ناکەوێ ، بەڵام هەندێ نیشانە هەن کە لە شەڕی راڤینادا[٩٩] دەرکەوتن ، کاتێ پیادەکانی ئیسپانیا پەلاماری چەند هێزێکی ئەڵەمانیایان‌دا کە لە سەر دەستووری لەشکرەکانی سویسرا ڕێکخرابوون‌و ئیسپانیایی‌یەکان لە سایەی گورج‌وگۆڵی‌ی لەشیانەوەو ئەو یاریدەیەی چەك‌و قەڵغانەکانیان پێیدەبەخشین ، توانی‌یان خۆیان بگەیەننە ناو ریزی ئەڵەمانیایی‌یەکانەوە کە وایان لی‌هات نەتوانن پارێزگاری لە خۆیان بکەن‌و ئەگەر سوارەکانیان هێرشیان نەبردایەتە سەر ئیسپانیایی‌یەکان ، ئەمان دەیانتوانی گشت ئەو هێزانەی ئەڵەمانیا تێك‌بشکێنن . ئێمە لەبەر ئەوەی کەم‌وکووڕی‌ی هەردوو ئەو بابەتە پیادەیە پێدەزانین ، بۆمان هەیە بابەتێکی سی‌یەم پێك‌بهێنین کە لە وزەیدا هەبێ لە رووی سوارەدا خۆی رابگرێ‌و لە پیادەش سڵ نەکاتەوە . ئەم بابەتەش دەتوانرێ لە رێگەی هەڵبژاردنەوە بە باشی‌و لە رێگەی رێك‌وپێکی‌یەوە بە دروستی ئامادە بکرێ . ئیتر ئەمانە ئەو شتانەن کە ئەگەر تازەمیرێك هات‌و کاری پێکردن‌و نوی‌ی کردنەوە ، مەزنی‌و شۆرەت‌و ناوبانگ‌بڵاوی‌یان پی‌مسۆگەر دەکا .

دەبێ ئەم هەلەی ئێستا لە کایەدایە لەدەس نەچی‌و ئیتالیا لە ئەنجامیدا رزگارکەری خۆی بدۆزێتەوە . من لە توانامدا نی‌یە وەسفی ئەو خۆشەویستی‌یە بکەم کە ئەو میرە رزگارکەرە لە هەموو ئەو ناوچانەدا دەیدرێتێ کە لە ژێر چنگی هێرشی داگیرکارانەی بێگانەدا دەردو سزایان چەشتوە ، یا ئەو تینوێتی‌یە بۆ تۆڵەسەندنەوەو دڵسۆزی‌یە چەسپاوەو فرمێسکی سوپاسی‌و ستایش‌و ئەمەکداری‌یەی دەیانبینێ . ئەو گشت دەرگایەکی لەبەردەمدا دەخرێنە سەر پشت‌و سەرجەمی گەل بە تاعەتکردن‌و دڵسۆزی‌یەوە پێشوازی‌ی لێدەکەن‌و کەسێك نابینێ حەسوودی پی‌بەرێ‌و تەنیا یەك ئیتالیایی لە چوونەژێرئاڵاکەیدا دوا ناکەوێ . ئەم دەستگرتنە درندانەیە بە سەرماندا ، لووتی هەموو مرۆڤێك دەچووزێنێتەوە . سا ئاخۆ بنەماڵە مەزنەکەت ، بە پشت‌بەستن بە چەکی ئازایەتی‌و هیواو ئاوات کە بەری ئیلهامی مەسەلە عادیلانەکەمانن ، بۆیهەڵدەکەوێ ئەم ئەرکە لە ئەستۆبگرێ هەتا ئێمەش بۆمان بلوێ لە ژێر ئاڵا

شەکاوەکەتدا ، سەری نیشتمانمان بەرز بکەینەوەو بە سەرپەرشتی‌ی ئێوە ، قسەکەی پەترارك بێتە دی کە دەڵێ :

«ئازایەتی ئاخری هەر بە رووی تووڕەیی
کوێرانەدا دەتەقێتەوەو
کاتی شەرەکە پێش دەخا
چونکە گومانی تێدا نی‌یە ئەو نەریت‌و بەها
رەسەنانەی کە دڵی ئیتالیایی‌یەکانیان‌رادەچەناند
هێشتا نەمردوون»

- کۆتایی هات -

# پەراوێزەکان

تێبینی

ناوەرۆکی ئەم پەراوێزانە لەم سەرچاوانەوە وەرگیراوە :

١- دەمەتەقێ - نیکۆلۆ مەکیاڤیللی - وەرگێڕانی خیری حماد - بێرووت - چاپی دووەم - ١٩٧٩ .

٢- کۆمیدیای خواوەندی - ئەلیجیری دانتی - وەرگێڕانی حسن عثمان - لە پەراوێزەکانی وەگێڕەوە - چاپی دووەم - میسر - ١٩٧٠ .

٣- گەورەترین حیکایەتی جیهانی - لویس ئۆنتەر مایەر - وەرگێڕانی غانم الدباغ - بەتایبەتی پەراوێزەکانی - بەغدا - ١٩٨١ .

٤- رۆمانی لۆکریشیا بۆرجیا - جوان هاسلیپ - حیلمی مراد (کتابی) - وەرگێڕانی زکی شنوودە - میسر .

٥- عەرەب و جوو لە مێژوودا - دوکتۆر احمد سوسە - چاپی دووەم - دیمشق .

٦- میدیا - ئی . ئیم . دیاکۆنۆف - وەرگێڕانی برهان قانع - بەغدا - ١٩٧٨ .

٧- ئەتڵەسێکی نەخشەی وڵاتانی جیهان بە ئەڵمانی - تایبەتیە بۆ قوتابییان - بۆ نەخشەکان و بۆ یاریدەدانی وەرگێڕ لە رووی جوگرافیاییەوە سوودی لێبینراوە .

٨- دەقەکەی کتێبی (میر) بە زمانی ئیتالیایی - بە یاریدەی لاوێکی خوێندکاری کورد لە ئیتالیاو بە یاریدەی نامیلکەی (چۆن فێری زمانی ئیتالیایی دەبیت) .

## ١- بنەماڵەی میدیتچی - Medici

سەرهەڵدانی ئەم بنەماڵەیە لە کۆڕی فەرمانڕەوایی‌کردنی شاری فلۆرنسادا ، لە کۆزیمۆ دی میدیتچی‌یەوە دەس پێدەکا کە لە ساڵی (١٣٨٩-ز)دا لەدایک بووەو بۆتە سەروەری شارەکەو حوکمڕانی‌ی تێدا گرتۆتە مشت . ئەمەش لە ئەنجامی دوو هەڵەدا بووە کە نیکۆلۆ دی ئۆزانۆی حوکمڕانی پێش ئەو کردوونی‌و بریتی بوون لە : یەکەم دەرک‌نەکردنی بە مەترسی‌ی پەرەسەندنی دەسەڵاتی کۆزیمۆ لە وەخت‌و سەعاتی خۆیداو دووەم دەرکردنی لە شارەکە بووە هۆی ئەوەی خەڵکەکە نارەزایی‌و تووڕەیی بەرامبەر ئەم کردەوەیەی نیکۆلۆ دەربڕن‌و ناچاری بکەن کە بنێرێ بە دوایداو بیهێنێتەوەو پایەوپلەیەکی وەهایشی بداتێ کە بۆ خۆی ببێتە مایەی ماڵوێرانی‌و بۆ ئەو مایەی خێروخۆشی ، چونکە لەو ڕێگەیەوە میرایەتی‌یەکەی لە چنگ دەرهێنا .

کۆزیمۆ لە ساڵی (١٤٦٩)دا مردووەو لیۆرانسۆی کورەزای (١٤٤٩ - ١٤٩٢) کە بە لیورانسۆی مەزن ناودەبرێ جێگای گرتۆتەوە . ئەم لە ماوەی حوکمڕانی‌یەکەیدا بەوە بەناوبانگ بووە کە زۆر بایەخی بە زانستی‌و هونەرو ئەدەب داوەو تەنانەت ئاکادیمیایەکی بۆ خوێندنی زانیاری‌و ئەدەبیاتی گەلانی دێرین دامەزراندوە کە دەورێکی کاریگەری لە راپەرینی ئەوروپادا گێڕاوەو بایەخێکی باشی بە کاروباری چاپەمەنی داوە .

ئینجا هەر دوای مردنی لیۆرانسۆی مەزن بە دوو ساڵ ، لە ئەنجامی شۆڕشێکدا لە لایەن جەماوەری گەلی فلۆرنساوە ، بنەماڵەی‌میدیتچی لە میرایەتی خراون‌و رژێمی کۆماری‌ی تێدا دامەزرێنراوەتەوە کە قەشە جیرۆلامۆ سافۆنارۆلا بۆتە حوکمڕانی . کە ئەویش لە ساڵی (١٤٩٨)دا ئیعدامکراوە ، بیارۆ سۆدیرینی‌ی دۆست‌و ناسیاوی مەکیاڤیللی دەزگای حوکمی کەوتۆتە دەست‌و هەر لەو ساڵەشدا ئەم وەزیفەی سکرتارێتی‌یەکەی ئەنجومەنی دەیەی دراوەتێ .

بنەماڵەی میدیتچی‌ی دەربەدەرکراو بەرامبەر بەرژێمی کۆماری دەستەوستان نەوەستان ، بەڵکوو لە ڕێگەی دەست‌وپێوەندو لایەنگرەکانیانەوە بە نیازی دەسگیرخستنەوەی میرایەتی‌یەکەیان ، بەردەوام پیلانیان لەدژ دەگێڕا ، لە کاتێکدا

سۆدیرینی دڵسۆزو دڵپاكو بێغەش‌و غایلە (وەك مەكیاڤیللی وەسفی دەكا) ، تەقەلای دەدا دڵیان رابگرێ‌و لەبری جەزرەبەلێدانیان سوودیان پێببەخشێ‌و یاریدەیان بدا . تا لە ئەنجامدا لە ساڵی (١٥١٢)دا ، بە بۆنەی بەرپابوونی ئاژاوەو ئاشووبێكەوە لە شارو ناوچەكەدا ، بنەماڵەی میدیتچی بە یاریدەی لەشكرێكی ئیسپانیایی ، فرسەتیان لە جەمهووری‌یەتەكە هێناو رووخاندنیان ، سۆدیرینی هەڵات بۆ لای عوسمانلی‌یەكان‌و میدیتچی‌یەكان دەزگای حوكمیان گرتەوە دەست‌و مەكیاڤیللیش بەشی گۆشەگیری‌و دەسدانە نووسین بوو لە گوندی (سانتا كرۆس)ی شوێنی لەدایك‌بوونیدا كە كتێبی (میر) بووە یەكەمین بەرهەمی .

مەكیاڤیللی نووسیویە : « لە مەكیاڤیللی‌یەوە بۆ لیۆرانسۆی مەزنی كوڕی بیارۆ دی میدیتچی» . جا ئاخۆ ئەم لیۆرانسۆ مەزنە (كە دیارە لیۆرانسۆ مەزنەكەی كورەزای كۆزیمۆ نی‌یە) كێ‌یە؟! . ئەم لیۆرانسۆ ناوبراوە بە مەزن لە لایەن مەكیاڤیللی‌یەوە ، كوڕی بیارۆی كوڕی لیۆرانسۆی مەزن بووە كە وەختێ لە ساڵی (١٥١٢)دا فەرمانڕەوایی فلۆرنسا كەوتۆتەوە دەست بنەماڵەكە ، ئەم لاوێكی تازەهەڵچوو بووەو مەكیاڤیللیش كابرایەكی لێكەوتوو یا لێخراوی گۆشەگیركراو بووە . جگە لەوەی كە دەگونجێ وای خستبێتە خەیاڵی خۆیەوە گوایە ئەم لیۆرانسۆ لاوە ، زۆری پێ‌ناچێ‌و بەتایبەتی ئەگەر ئامۆژگاری‌یەكانی دووتوێی (میر)ی گرتەگوێ‌و پەیڕەوی كردن ، دەبێتەوە ئەو لیۆرانسۆ مەزنە ئەدەب‌و زانست پەروەرو راپەڕین‌خوازو پێشكەوتن‌نیازەو دواجار بەدی‌هێنەری ئەو هیواو ئاواتانەی بە رژێمی جەمهووری بۆی بەدی‌نەهات‌و لە ساتی نووسینی ئەو پێشكەش‌كردنەدا ، وەهای چەسپی بووە مێشكەوە كە دەشێ میرایەتی‌یەكی نوێی لە بابەتی میرایەتی‌یەكەی لیۆرانسۆی مەزنی بۆ بەدی‌بهێنێ .

بەڵام ئەنجام بەوە شكایەوە كە هیواو ئاواتەكەی سەبارەت بەم لیۆرانسۆیە بوونە خەیاڵێكی خاوو وەها دەرنەچوو كە گوایە «ئەگەر بنەماڵە سەردارەكەت ویستی....»«پێویستە ئەم فرستە لەدەس نەدرێ‌و ئیتالیا لە ئەنجامدا رزگاركەری خۆی ببینێتەوەو من لە وزەمدا نی‌یە وەسفی بكەم كە ئەو رزگاركەرە چ خۆشەویستی‌یەك‌و....»«چ دڵسۆزی‌یەكی مسۆگەرو چ فرمێسكێكی سوپاس‌و ستایش

له چاواندا....» هتد، دەبینی.

لیۆرانسۆ مەزنەکەی مەکیاڤیللی لە ئەنجامدا ، هەر فری بەسەر فلۆرنساوە نەما . هەروەکوو تەمەنیشی درێژەی نە خایاندو لە سالی(١٥١٩)دا مرد .

(دەمەتەقێ–ل ٢٨ ، ٣٣٠ ، ٤٠٣) .

**٢–فرانسیسکۆ سفۆرزا – Francesco Sforza (١٤٠١–١٤٦٦ ز)** . لە بنەماڵەیەك بووە کە بە لێهاتوویی لە کۆری سەربازیدا ناسرابوون . فەرماندەی لەشکری فیلیپۆ فیسکونتی‌ی میری میلان بووەو بیانکای تاقە کچی ئەوی کردوّتە هاوسەری خۆی . وەختێ فیلیپۆ لە سالی (١٤٤٧)دا مردوە ، ئەم لە شەرێکدا ڤینیسیایی‌یە دوژمنە دێرینەکانی میلانی بەزاندوەو بە دوایدا لە سالی (١٤٥٠)دا بۆتە میری میلان . فەرمانرەوایەکی دادپەروەرو لایەنگیری زاناو ئەدیبان بووە . ئیتر لە دوای خۆیەوە حوکمرانی‌کردنی میلان کەوتۆتە دەست وەچەکەی (دەمەتەقێ–ل ٥٣٧) .

**٣– ناپۆلی– Napole**

دەکەوێتە باشووری ئیتالیاوە ، سەر کەناری دەریای تیران . یۆنانی‌یەکان پێش (٢٥٠٠) سالْ بنیادیان ناوەو بە (نیاپۆلیس) ناویان دەبرد . بورکانی ڤیزۆڤ و کەلاوەکانی کۆنە شاری پۆمپی‌ی لێوە نزیکە . هەروەکوو (ڤیرجیل)ی نووسەری (ئەنیادە)شی تێدا نێژراوە .(گەورەترین حیکایەتی جیهانی ل–١٧٢ ، پەراوێز–١٦٤)

**٤– مەبەستی باسکردنی جەمهووری‌یەتە لە کتێبی (دەمەتەقێ)دا نەك لە شوێنێکی‌تری ئەم کتێبەدا** (ح.ع) .

**٥– ڤینیسیا (بندقیة)– Venisia**

دەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی ئیتالیاوەو سەر چەندین وردە دوورگەی کەناری هەرە سەرووی دەریای ئەدریاتیك . خاوەنی رابوردوویەکی هێجگار دێرینی رەسەنە . لە سەدەی نۆیەمینی زایینی‌یەوە بە دەریادا بەتایبەتی ، کەوتە پەلهاویشتن‌و بلاوکردنەوەی دەسەلاتی خۆی‌و هەتا دەریای مەرمەرەی گەیاند . بەلام لە ئەنجامی چەندین شەرو شۆرو جەنگ لەگەلْ عوسمانی‌یەکاندا ، لەکوتایی سەدەی هەژدەیەمەوە رووی لە کزی‌و بێ‌دەسەلاتی کردو لە سالی (١٧٩٧)دا بووە مولکی نەمساو لە سالی

(١٨٦٦)دا بووه بەشێك لە ئیتالیا . لە سەردەمی راپەرینی ئەوروپادا ، بووبووە مەڵبەندێكی هێجگار مەزنی هونەرو زانیاری . (گەورەترین . . . . ، ل – ٢٨٢ ، پ – ٢٦٣) .

**٦- لویسی دوازدەیەم**

دوای مردنی پادشا شارلی هەشتەمی باوكی لە ساڵی (١٤٩٨)دا ، چووە سەر تەختی پادشایەتیو هەر خێرا بۆ سەرلەنوێ دەس‌پێكردنەوەی پرۆژەكەی باوكی لە هێرش‌بردنەسەر ئیتالیاداو بەتایبەتی داگیركردنەوەی میرایەتیی میلان كەوتەوە خۆیو ئەوەبوو بە ئاسانی میلانی داگیركردەوە . لە ساڵ (١٥٢٥)دا مردوە .

**٧- لۆدۆڤیكۆ – Ludovico**

لۆدڤیكۆ سفۆرزایە . لە ساڵانی (١٤٩٤–١٥٠٠)دا میری میلان بووە . لە ٦/ئۆكتۆبەر/١٤٩٩دا لەشكرەكەی لویسی دوازدەیەمی لە میلان دەرپەڕاندەوە دەرەوە .

**٨- ئاخی‌یەكان‌وئیتۆلی‌یەكان**

دوو تیرەن كە یەكەمیان لە سەدەی چواردەیەمی پێش زایینیدا بەرەو یۆنان كۆچی كردوەو لە باشووریدا نیشتەجێ بووە . دووەمیشیان لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینیدا روویان كردۆتە یۆنانو لە باكووریدا نیشتەجێ بووە . (دەمەتەقێ – ل٤٤٤ – پەراوێز) .

**٩- مەكدۆنیا – Macedonia**

ناوچەیەكە دەكەوێتە شێوە دوورگەی بوڵكانەوە . بەرەوژووور لە دەریای ئیجە (ئەیون)ەوە بە نێوان ئەبیرۆسو تراكیادا هەڵدەكشێو ناوچەیەكی شاخاوی‌یە . لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا ، بە سەر كردایەتیی بنەماڵەیەكی پەروەردەكراو بە رۆشنبیریی گریكەكان (یۆنانەكان) ، شێوە فەرمانڕەوایی‌یەكی تێدا دامەزرێنرا . لە ساڵی (٥٠٠–پ .ز)دا كەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسەكانەوە . بەڵام لە سەردەمی فیلیپی باوكی ئەسكەندەرەوە ، دەست‌كرا بە فراوانكردنی سنووری مەملەكەتەو ئیتر ئەوەبوو بە دوایدا ئەسكەندەری كوڕی ، رووەو هەرچوار قوژنەی ئەوسای دنیا پەلی‌هاویشتو

شارستانێتی ی گریکەکانی لەگەڵ خۆیدا تێرا بڵاوکردنەوە . (گەورەترین . . . -ل ٦١-پ٦٩) .

١٠- فیلیپ - Filipp

لە شوێنێکی تردا مەکیاڤیللی خۆی دەربارەی دەڵێ : مەبەستم لەم فیلیپە فیلیپی باوکی ئەسکەندەری گەورە نییە ، بەڵکوو مەبەستم لەو میرەیە کە تیتۆس کۆنینیۆس (کونسولێکی رۆمانەکانە) بە سەریدا زاڵبووە . جا لێرەشدا هەر مەبەستی لەو فیلیپەیە نەك باوکی ئەسکەندەر . (ح.ع) .

11 - ئەنتیۆس

**پادشای ئەنتاکیەو سووریاو هەندی بەشی تری ئاسیای بچووك بووە . هەروەکوو گەلێ پادشای تریش بەم ناوەوە هەن کە دوای ئەو حوکمڕانی یان کردوە : (دەمەتەقێ - ل 430) .**

١٢- شارل charLe

(١٤٧٠-١٤٩٨) . شارلی هەشتەمەو باوکی لویسی دوازدەیەمە . بە نیازی سەندنەوەی شاری ناپۆلی کە لەوەبەر ژێردەستەیان بووە ، لەساڵی ٥٩٤١ دا پەلاماری ئیتالیایدا . بەڵام زۆربەی میرایەتی یەکانی ئیتالیا لە بەرەیەکدا پێکەوە رووبەڕووی وەستانەوەو ئیتر بەو نیازەی لە فرسەتێکی تردا پەلامار بداتەوە ، ناچار کشایەوە دواوە . بەڵام ئەوەبوو ئەو بە سەریدا مردو لویسی کوری رێبازەکەی ئەوی گرتەبەرو پەلامارەکەی دایەوە . (دەمەتەقێ- پێشەکی یەکەی لیسڵی ووکەر - ل٣٣-پەراوێز) .

١٣- فلۆرنسا- Firenze

شارێکی بەناوبانگی ئیتالیایەو دەکەوێتە ناوەڕاستی یەوە . لەرووی سیاسی یەوە شوێنێکی باڵای لە مێژووی ئیتالیادا داگیرکردوە،بەتایبەتی لە دەورووبەری سەردەمی ژیانی مەکیاڤیللی خۆیدا . هەروەکوو مەڵبەندێکی گەورەی ئەدەب و هونەرو رۆشنبیری ی سەردەمی راپەڕین بووە لە ئەوروپادا .(ح . ع) .

١٤- ماركیزی (مانتوا)-Mantwa

مەبەست لە مارکیز فرانسیسکۆ جۆنزاجایە کە میری شاری مانتوا بووە. بنەماڵەکەشی (جونزاجا) لە بنەماڵە سەردارە دێرینەکانی ناوچەکە بوو. لەگەڵ بنەماڵەی بۆرجیادا (کە لە دواییدا ناویان دێ)و بەتایبەتی سیزار (قەیسەر بۆرجیا) دوژمن بەیەکتر بوون. بەڵام لە ساڵی (١٥٠٤)دا وەختێ سیزار کەوتۆتە نەهامەتییەوە ئەمیش کەوتبووە داوی خۆشەویستیی لوکریشیای خوشکی سیزارەوە، تەقەلای داوە یاریدەی بداو بەڵام هیچی بۆ نەکراوە. (رۆمانی لوکریشیا بۆرجیا- ل ٤٢، ٨٧، ١٧٥).

١٥- دۆق فیرارا- Ferrare

مەبەست لە دۆق ئیرکۆل دیستەیە کە میری شاری فیرارا بووەو پاپا ئەلیکساندری شەشەم (رۆدریجۆ بورجیا وەك لە دواییدا ناوی دێ)، بۆ ئامانجێکی سیاسیو لەسەر داخوازی خۆی، لە ساڵی (١٥٠٢)دا لوکریشیای کچی داوە بە ئەلفۆنسۆی کوڕی دۆق ئیرکۆل. ئەمەدوای ئەوەی کەهەر بۆ هەمان ئامانج، دوو جار کردبوویە دەسگیرانی دوو میریترو دوو جاریشی بە دوو میریتری بەشوو دابوو. (رۆمانی لویشیا بورجیا).

١٦- بێنتیڤۆگلی - Bentivogli

مەبەست لە جیۆڤانی بێنتیفوگلییە (١٤٤٣-١٥٠٨) کە میری شاری بۆلۆنا بووەو ئەمیش یەکێکە لە شارە ناودارەکانی ئیتالیا. بنەماڵەکەی (بێنتیڤۆگلی) بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ فەرمانڕوایی شارەکەیان کردوە. ئەم لە ساڵی (١٤٦٤)دا تەختی میرایەتییەکەی باوکی کە لیێ زەوتکرابوو سەندۆتەوەو حوکمرانیی بۆلۆنای گرتۆتە دەست. ئەگەرچی بایەخی بە هونەرو ئەدەبو زانیاری داوەو بۆلۆنای کردۆتە شارێکی جوان، بەڵام دڵڕەقو بێویژدانو ئازاربەخش بووە. دوای (٤٤) ساڵ حوکمرانیکردن، پاپا یۆلیۆسی دووەم لە ساڵی (١٥٠٦)دا لە شارەکە دەریپەڕاندوەو هەڵاتوە بۆ میلانو لە ساڵی (١٥٠٨)دا لەوێ مردوە. (دەمەتەقێ-ل ٣١٠).

## ١٧- خانمی فۆرلی- Furli

ناوی (کاترینا ریارۆسیفۆرزا)یە. ئافرەتێکی جەربەزەو بەکار بووە. وەختێ جیرۆلامۆی مێردی کە میری شاری فۆرلی بووە کوژراوە، ئەم خۆی لە جێگەی داناوەو بۆتە میری شارەکە. مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا حیکایەتەکەی بەم جۆرە دەگێرێتەوەو دەڵێ: «هەندێ لە پیلانگێران لە هاوولاتی‌یانی فۆرلی، جیرۆلامۆی میرەکەی خۆیان کوشت‌و ژن‌و منداڵەکانیان بەدیل گرت. ئەوسا سەیریان‌کرد ئەگەر قەڵای شارەیکەیان نەکەوێتە چنگ کە فەرماندەکەی نەیدەدا بە دەستەوە، ئەوان ژیانیان هەر لە مەترسیدا دەبێ. بۆیە کاترینا بەڵێنی بە پیلانگێراندا کە ئەگەر ماوەی بدەنێ بچێ بۆ ناو قەڵاکە، تەقەلا دەدا بە دەستیانەوە بدرێ. پیلانگێرەکان منداڵەکانی کاترینایان بە بارمتە گلدایەوەو رێگەیان‌دا خۆی بروا بۆ ناو قەڵاکە. بەڵام هەر هێندەی پێ‌ی نایە ئەودیو شووەکانی‌یەوە، دەستی‌کرد بە جنێوپێدانیان‌و هەرەشەلێکردنیان بە تۆڵەسەندنەوەیەکی وەها لێ‌یان کە رەچەڵەکیان ببرێتەوە. ئینجا بۆ ئەوەشی پێ‌یان بسەلمێنێ کە هێندەی نووکی دەرزی‌یەك گوێ نادا تە منداڵەکانی، بە بەرچاویانەوە خۆی رووت‌وقووت کردەوەو هاواری لێکردن کە باش سەیری بکەن‌و ببینن‌و دڵنیابن کە چۆن دەتوانێ چەندین منداڵی تر بێنێتە بەرهەم. ئەم دیمەنەزمانی پیلانگێرەکانی لە گۆخست‌و وای لێکردن ئانوسات تێ‌بگەن کە چ هەڵەیەکی گەورەیان کردووەو دواییش ئەنجامی ئەو کەم‌ئەقڵی‌و نابینایی‌یەیان، دەربەدەری بوو لە شارەکەیان بۆ هەتاهەتایە (دەمەتەقێ - ل٦٢٢، ٦٢٣).

دیارە بە دوای ئەم حیکایەتەدا بووە کە کاترینا بۆتە خانمی فۆرلی‌و حوکمرانی ئەو میرایەتی‌یەو ئیتر لەو وەختەدایە کە لە کاتی هێرشەکەی لویسی دوازدەیەمدا بۆ سەر ئیتالیا (١٤٩٨)، لەگەڵ ئەو میرانەی‌تردا کە مەکیاڤیللی لەگەڵیدا ناوی بردوون، ملی بۆ کەچ کردوە. هەروەکوو دوایی‌تر قەیسەر بۆرجیا (سیزار) هێرشی بردۆتە سەری‌و دوای ئەوەی زۆر ئازایانە بەرگری‌ی لە شارو قەڵاکەی خۆی کردووەو لە روویدا جەنگاوە، لەلایەن بۆرجیاوە بەدیل گیراوەو ئیتر لێرەوە رۆمانی (لۆکریشیا بۆرجیا - وەك هەر رۆمانێك - بە دوورودرێژی لە پەیوەندی‌ی نێوان خانمی فۆرلی‌ی دیل‌و

قەیسەر بۆرجیای سەرکەوتوو دەدوێ . (ح.ع) .

**١٨- سەرداری فایینزا – Faenza**

مەبەست لە (مانفریدی)ی میری فایینزایە کە لە هەرەتی لاوێتیدا بووەو دوای ئەو خۆبەدەستەوەدانەی بۆ لویسی دوازدەیەمی پادشای فەرەنسا ، کە سەیری کردوە وا قەیسەر بۆرجیای هاوپەیمانی لە گەڵ فەرەنسایی یەکاندا ، بە پشتی ئەوان بەراست و چەپدا هێرش دێنێ و پەلامار دەدا ، وای بە چاك زانیوە خۆی و شارەکەی بدا بە دەست بۆرجیاوە . کەچی هەر بۆ رۆژی دوایی لاشەکەی لە روباری (تیبەر)دا بینراوەتەوە (لوکریشیا بۆرجیا –ل١٥٧) .

**١٩- سەرداری پیزارۆ – Resaro**

مەبەست لە جیۆڤانی سفۆرزایە (١٤٦٦–١٥١٠–ز) کە لە بنەماڵەی سفۆرزای حوکمرانانی میرایەتی ی میلان و برازای کاردینال ئەسکانیۆ بووەو بۆتە میری شاری پیزارۆ کە دەکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیك . پاپا ئەلیکساندەر بە تەماعی مسۆگەرکردنی شوێنە ستراتیژی یەکەی شارەکەی ، لەساڵی (١٤٩٣)دا لوکریشیای کچی لێ مارە کردوە . بەلاّم دوایی تۆمەتی ئەوەی داوەتە پاڵ کە پیاوەتی یەکەی تەواو نی یەو کچەکەی لێ سەندۆتەوەو داوێتی بە ئەلفۆنسۆی کوری میری ناپۆلی . (لوکریشیا بۆرجیا –ل٤٠–٤٢ ، لە زۆر لایەرەی تریشدا ناوی هاتوە) .

**٢٠- پیزا – Pisa**

لە ناوچەی تۆسکانیاداو نزیك فلۆرنسایە . دەکەوێتە سەر روباری ئەرنۆ . شوێنی لەدایك بوونی گالیلۆیە . لە سەدەی یازدەیەمدا بەو هێزە سیاسی و بازرگانی یەی هەیبوو ، ململانێ ی لە گەڵ ڤینیسیاو جەنەوادا دەکرد . لە پێش جەنگی جیهانی ی دووەمدا ، لە نواندنی هونەری رۆمانیو جووتیدا ، بە یەکێك لە شارە نموونەیی یەکان دادەنرا. بەلاّم جەنگ ئەو شوێنەوارە مێژوویی یانەی هەموو وێران کردنو ئێستا تەنیا کاترائی یە کۆنەکەی و بورجە خوارەکەی لە کڵێسەی سانتا ماری یای تێدا ماون (گەورەترین . . . ، ل–٣٠١ ، پ–٢٧٩)

٢١- سیەنا- siena
**نزیك فلۆرنسایە . دەکەوێتە بەری لای رۆژئاوایەوەو دە کیلۆمەتر لێوەی دوورە . (دانتی - کۆمیدیای خواوەندی - بەهەشت - ل٣١٦-پ٤٢) .**

**<< - بنەماڵەی بۆرجیا - Boryja**

سەرهەڵدانی بنەماڵەی بۆرجیا لە کۆڕی سیاسەتدا لە رۆمادا ، دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی چواردەیەم-وەختێ ئەلفۆنسۆی دووەمی پادشای ئاراگۆن ، خۆی کردە پادشای میرایەتی ی ناپۆلیش‌و ئەلفۆنسۆ بۆرجیا ناوێکی لەگەڵ خۆیدا هێناو کردی‌یە نهێن پۆش‌و کارگێری کۆشکەکەی خۆی کە یەکێك بووە لە دۆستانی‌و راوێژکاری کاتدرائی‌یەتی (لیریدا) .

ئەلفۆنسۆ بورجیا بەرەبەرە پایەوپلەی بەرزبووەوە تا لە ئەنجامدا لە ساڵی (١٤٤٥)دا تاجی پاپایەتی ی نایە سەری‌و ئیتر بە دوایدا کەوتە نزیك‌خستنەوەو دامەزراندنی کەس‌وکارو ناسیاوانی خۆی لە بەڕێوەبردنی کاروباری ڤاتیکاندا ، بەتایبەتی دوو برازاکەی (پیدرۆ لویس)و (رۆریجۆ بۆرجیا) .

ئینجا لەو دووانە پیدرۆیان هەرزوو دوای مردنی مامی ئەستێرەی بەختی کوژایەوەو لەلایەن جەماوەری گەلی شاری رۆماوە لە شارەکە دەرکراو هەڵات بۆ ئیسپانیای وڵاتی باووباپیرانی . لە کاتێکدا رۆدریجۆ خۆی ئاخنی بووە ناو ڤاتیکانەوەو چاوەڕی‌کرد تا گێژەلۆوکەکە رەوییەوە . ئەوسا چووەوە سەر شانۆو توانی بە بەهرەداری‌و لێهاتوویی خۆی ببێتە راوێژکاری چوار پاپای یەك بە دوای یەکدا کە بیۆسی دووەم‌و پۆلی دووەم‌و سیکستۆسی چوارەم‌و ئەنۆسینتی هەشتەم بوون .

رۆدریجۆ لەو ساڵانەدا وردەوردە وای‌لێهات کە لە دوای پاپاوە بووە یەکە دەسڕۆیشتووی ناو ڤاتیکان ، چونکە کرایە کاردینالی ڤالنسیاو ئەسقەفی ئۆبۆرتۆو مەترانی سوبیاکۆ ، ئەمە جگە لە راوێژکاری‌یە بەردەوامەکەی ڤاتیکانی . تا وەختێ پاپا ئەنۆسینتی هەشتەم هاتە سەر مردن ، ئەو بووبووە بەهێزترین کەسێك بۆ هەڵبژاردنی بە پاپاو نیتر لە بەرەبەیانی رۆژی ١١/ئابی/١٤٩٢دا ، بە ناوی ئەو ئەلیکساندەری شەشەمەوەی کە مەکیاڤیللی لە (میر)دا هێندە باسی دەکا ، کرا بە پاپاو تاجی پاپایەتی ی

نرایه سەر .

هەروەها ئەو رۆدریجۆیە (وانە پاپا ئەلیساندەری شەشەم)، چوار منداڵی ناشەرعی ی لە فانۆتزای دۆستی هێنانە دنیاوە کە پیدرۆو سیزارو جانۆو لوکریشیا بوون کە ئەمیان کچ بوو . لەوانەش ئێمە لێرەدا سیزارمان مەبەستە کە (سالی (١٤٧٥)دا لەدایك بووەو دوایی بوو بە دۆق فالینتینۆو دوایی تر ناوی بە قەیسەر بۆرجیا دەرکردو ئەوەیە کە مەکیاڤیللی لە کتێبەکەیدا زیاتر لە باوکی باسی کردوەو لە گەلێ شوێندا ئیشارەتی بە کردارەکانی داوەو نموونەی لە سەر هێناونەتەوە .

لە رۆمانی (لوکریشیا بۆرجیا)دا کە بە رۆمانێکی مێژوویی دادەنرێ و نووسەرەکەی پشتی بە بەڵگەی نوسراو بەستوە ، قەیسەربۆرجیای وەك پیاوێکی هێجگار دڵرەق و جەربەزەو بێ ویژدانو داوێن پیس نیشانداوە ، بگرە لە باوکەو دوو کوڕو کچەکەی تریشی هەروەها دەدوێ . بەڵام ئاشکرایە کە مەکیاڤیللی زیاتر لایەنە سیاسی یەکەی ئەم بنەماڵەیەی مەبەست بووەو بەتایبەتی کۆششو تەقەلادانی بۆرجیا بۆ دەسگرتن بە سەر میرایەتی یەکانی تری ئیتالیاداو یەکخستنیان لە یەك دەوڵەتدا .

دواجار دەمەوێ بڵێم کە مەکیاڤیللی ئیشارەتی بە چۆنێتی ی کۆتایی هاتنو مردنی بۆرجیا نەداوە ، بۆیە بە پێویستی دەزانم لێرەدا باسێکی بکەم . دەوترێ کە لە ئێوارەی ٦/ئابی/١٥٠٣دا ، باوکەو کوڕە هەردووك پێکەوە داوەتی کاردینال کۆرنیتۆ بوون . بەڵام بۆ رۆژی دوایی هەر بەیانی زوو هەواڵێك بە ناو شاری رۆمادا بڵاوبۆتەوە کە هەردووکیان نەخۆشنو لە جێگەدا کەوتوون . (مەکیاڤیللی خۆی ئیشارەتی بەم نەخۆشی یەیانی پێکەوە داوەو لە زمانی بۆرجیاشەوە قسەیەکی دەگێڕێتەوە کە دیارە دەبێ دوای چاكبوونەوەی دیبێتی و ئەو قسەیەی بۆ کردبێ) . ئینجا وا بڵاوبۆتەوە کە ئەوان و یستویانە کاردینال دەرمانخوارد بکەنو خزمەتکارە بەکرێگیراوەکە سەری لێ تێکچووە . بەڵام ئەگەر ئەمە وابێ دیارە پێچەوانەکەی راستترە .

پاپا لە رۆژی ١٨/مانگدا دەمرێو بە دوایدا جەماوەری شاری رۆما هەر لەگەڵ بیستنی هەواڵەکەدا روویانکردۆتە قەڵاکەی بۆرجیاو هاواریان کردوە :

(مردن بۆ کوڕی قەحبەکە)ە(مردن بۆ سەگی میرانێ) بە باوکیشیان وتوە : (بۆ دۆزەخ هەی فاسق لەعین) .

ئەوسا گوایە چەند کاردینالێك کە بەزەیی یان بە بۆرجیادا هاتۆتەوە ، بە دزی یەوە گواستویانەتەوە بۆ قەڵای سان ئەنجیلۆو لەوێ حەشاریان داوە ، تا لە نەخۆشی یەکەی چاك بۆتەوە . رەنگیشە هەر لەو رۆژانەدا بووبێ کە مەکیاڤیللی دیوێتی‌و وەك لە (دەمەتەقێ)دا باسی دەکا . گوایە نامەیەکی داوەتێ بۆ سەرۆکی فلۆرنسا . ئینجا لەولای ترەوە هەر لەو رۆژانەدا ، بیکۆلۆمینی لە جێی ئەلیکساندەر کراوە بە پاپاو پاپایەتی یەکەی تەنیا بیست‌و حەوت رۆژی خایاندوەو مردوە . بە دوایدا جیلیانۆ دیللا رۆڤیری کە لە کاردینالە دوژمنەکانی بنەماڵەکەی ئەمان بووە ، کراوە بە پاپاو بەوە چارەنووسی ئەم براوەتەوە . چونکە هەر دوای هەفتەیەك بڕیاری گرتنی داوەو لە قەڵاکەی خۆیدا (بۆرجیا) حەپسی کردوە . بەڵام دوای ماوەیەك هەڵاتوەو قەدەرێك ئەملاو ئەولای کردوە . لە ئەنجامدا لە ۱۱/ثانی/۱۵۰٤دا گیراوەتەوەو رەوانەی دوورگەی (ئاسکیا) کراوەو تا مردنی لەوێ ژیانی لە گەڵ پیاوکوژو دزو جەردەدا بەسەربردوە .

۲۳ دەوترێ گوایە ژنەکەی خۆی (ئان دی ڤالوا) زۆر ناشیرین بووەو کە دوای مردنی شارل چۆتە سەر تەختی پادشایی ، ویستویتی ئەو ژنەی تەلاق‌بداو بێوەژنەکەی شارل (ئان دی بریتانی) کە زۆر جوان بووە ، مارە بکا . دیارە ئەوەش پێویستی بە ڕێگەپێدانێکی تایبەتی هەبووە لەلایەن پاپاوە .

## ۲٤ – قەیسەر بۆرجیا – Caesar Borgia

بڕوانە پەراوێزی ژمارە (۲۲ – بنەماڵەی بۆرجیا) .

## ۲٥– ئەسکەندەری گەورە – (۳٦۲ – ۳۳۰ پ .ز)

پادشای هەرە بەناوبانگی گریکەکانە . لە ماوەیەکی زۆر کورت‌و بە تەمەنێکی کورتەوە ، ئیمپراتۆریێکی بەرفراوانی دامەزراندوە ، بەتایبەتی دوای سەرکەوتنی لە ساڵی (۳۳۱ پ .ز)دا بە سەر دارای پادشای فارسەکانداو داگیرکردنی وڵاتەکەی . دوای مردنی ، سەرلەشکرەکانی لە ناو خۆیاندا تێکچوون‌و ئەمانیش لە ماوەیەکی کورتدا ، ئیمپراتۆریی یەکەیان پەرت‌پەرت‌کردو پووکاندیانەوە .

## 26 – دارا – Darus

مەبەست لە دارای سێیەمە کە هاوچاخی ئەسکەندەری گەورەو پادشای فارسەکان بووە . لە سالانی (335 – 330 پ.ز)دا حوکمرانی ی کردوە . لە سالی (331 – پ.ز)دا لەڕوا شەڕی قورسدا کە نزیك شاری ئەربائیلۆ (هەولێری ئێستا) لە نێوان هەردوو لە شکرەکەیاندا قەوماوە ، شکستی ی هێناوەو کشاوەتەوە بۆ ئەکباتان (هەمەدان)ی پایتەختی‌و تەقەلای داوە بۆ

**بەرگرتن لە هێرشی ئەسکەندەر ، سەرلەنوێ لەشکر دروست بکاتەوە ، بەلام بپرانەکەیشت و کوژراو بە دوایدا ئەسکەندەر ولاتەکەی داگیردو خستی یە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە .(میریا ـ ئی . ئیم .دیاکۆنۆف .ل ـ 603 — 612) .**

**٢٧- پیرۆس- Pyhrhus**

(٣١٨-٢٧٢ .پ . ز).. لە سالانی (٢٩٥-٢٧٢)دا پادشای مەملەکەتی (ئیپیرۆس) بووە کە دەکەوتە سەر کەناری رۆژئاوای ولاتی یۆنانەوە . لە سالی (٢٨٣)دا هێرشی بردۆتە سەر مەکدۆنیاو داگیری کردوەو بەلام لیدەرپەرێنراوە . دوای ئەوە پەلاماری ئیتالیای داوەو لە چەند شەرێکدا بەسەرڕۆمانگاندا زال بووە ، تا لە سالی (٢٧٥)دا بەزاندوویانە . ئینجا جارێکی‌تر مەکدۆنیای داگیرکردوە . بەهەرحال ئەنجامی بەوە شکاوەتەوە کە بنمیچی خانوویەکی بە سەردا رووخاوەو کوشتوێتی .
(گەورەترین . . . ل-١٤٦ ، پ ١٣٦)

**٢٨- سپارتا- Sparta**

دەکەوێتە ناو دۆلێکی بەرفراوانی بەپیتەوەو لە خواروی نیمچە دوورگەی (پیلۆپۆنیز)دایە . چەند تیرەیەکی سەر بە نەژادی دووری‌یەکان لە باکوورەوە بەرەوخوار هاتوون‌و بەدەم شەرەوە خەلکی ناو دۆلەکەیان لیدەرپەراندوە ، یاخود کردۆتە کۆیلەی خۆیان‌و لەبری ئەوان تیایدا جێگیر بوون . ئینجا دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە گەل ئەو خەلکەیدا لەزۆرانبازیدا بوون ، کار وا شکاوەتەوە کە لە گەلیاندا یەکیانگرتوەو چوونەتە ژێر رکێفی دوو پادشاوەوبە هاوبەشی حوکمڕانی‌یان کردوون . بە دوایدا ئیتر لاکۆنیاو میکینایان داگیرکردوەودەسەلاتیان پەرەی سەندوە .
رژێمی فەرمانڕوایی لە سپارتادا بە توندوتیژی‌و پتەوی‌و بە مەشق سەربازی بەناوبانگ بووەو زۆریش لەگەل دەستووری دیموکراتی‌یانەی ئەسینادا جیاوازی‌ی هەبووە .
(گەورەترین . . . -ل ٤١-پەراوێز- ٣٦)

## ۲۹- ئەسینا-Athene

پایتەختی ئیستای یۆنانە . لە ناوەڕاستی سەردەمی برونزیدا بنیادنراوەو دەوترێ گوایە (سیکرۆپس) بنیادی ناوە . لە سەرەتای دامەزراندنیدا بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە . بەلاّم لە دواییدا وردەوردە نەش‌ونمای کردوە . تا لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایینداً لە سەردەمی (بیزیستراتۆس)و کوڕەکانیدا ، لە رووی بازگارنی‌یەوە گەشەی سەندووە . ئینجا وەختێك فارسەکان داگیریان کرد ، لە ساڵی (٤٨٠-پ . ز)دا سوتاندنیانو کاولیانکرد . بەلاّم دوای دەرپەڕاندنیان ، لە سەردەمی (برکلیس)دا ئاوەدان کرایەوەو ئەمجارە بەوپەڕی وەستایی‌و فەنتازی‌یەوە ، پەرستگاو کۆشکە داروخاوکانی سەر قەلاّی (ئەکروپۆل)یان بەیاریدەی گەلێ ئەندازیاری لێهاتوو دروست‌کردەوەو بەوە بووە شارێکی زۆر جوانو دلگیر . هەروەها شارەکە بە ناوی (ئەسینا پالاّس- Athene Pallas)ی دالّدەدەری‌یەوە ناونراوە کە کچی (زیوس)ی ژنەخوداوەندی گەورەی خوداوەندەکانە .

(گەورەترین . . . . . -ل۱۳-پ٤)

## ۳۰-ثیبە-Thebe

دەکەوێتە ناوەڕاستی ولاّتی یۆنانەوەوئێستا (تیڤا- Thevia )ی پێدەوترێ .

لەکۆتایی سەدەی شەشەی پێش زایینەوە ، لە گەلّ ئەسینادا کەوتە دوژمنایەتی کردن ، و لە جەنگدا یاریدەی فارسەکانی دەدا . هەروەکوو لە جەنگەکانی پیلۆپۆنیزدا یاریدەی سپارتایی یەکانی داو دواجار لە ساڵی (۳۹٤- پ. ز)دا ، چووە پاڵ ئەوەدەستە دەوڵەتەی دژ بە سپارتا جەنگانو بەسەریدا زاڵ بوون ، بۆ ماوەیەکی زۆریش سەروەری بەگشتی ولاّتانی یۆنانی کردوە . ( گەورەترین ... ل ۷۵ ، پەراوێز ۸۰ ) :

## ۳۱- کاپوا - capua

دەکەوێتە باشووری ئیتالیاوە ، سەرووی شاری ناپۆلی‌و نزیك دەریای تیران .

هانیباڵی کرتاجەیی لە ساڵی (٢١٥-پ . ز)دا داگیری‌کردو خۆیو لەشکرەکەی تیایدا بەرابواردنەوە خەریك مانو ورەی شەرکردنیان نزم بووەوە کە لە ئەنجامیدا رۆماکان پەلاماریان دانو زەفەریان پێبردن . (گەورەترین . . . .ل- ١٦٤ ، پ-١٥٢) .

**٣٢-کرتاجە- Carthage**

لە نزیك کەنداوی (توونس)ی ئێستا دا بووە . لە لایەن فینیقی‌یەکانەوە بنیادنراوە . دوژمنێکی گەورەی رۆما بووەو بۆ دەست بەسەرداگرتنی دەریای سپی ی ناوەراست ، مل‌ملانێ‌ی لە گەڵدا دەکرد . خاوەنی هێزێکی دەریایی فراوان بووەو لە سەرەتادا بە بازرگانی بەناوبانگ بووە . بەلاّم لە زەمانی هەردوو سەرکردەی ناوداریدا (هامیلکارو هانیباڵی کوری) ، بە هێزی سەربازی کەوتە پەل‌هاویشتن بە هەموو باکووری ئەفریقادو ئینجا ئیسپانیاو تەنانەت تا نزیك رۆماش ، بە نیازی داگیرکردنیو لە ناوبردنی ئیمپراتوریتی رۆما کشا . بەلاّم ئەو ئامانجەی بۆ نەهاتەدی .
(گەورەترین حیکایەتی..-بەڵێنی کوشندە -ل١٥٤) .

**٣٣- مووسا-Mose**

لە سەدەی سیازدەیەمی پێش زاییندا ژیاوە . دەوترێ گوایە لە دەرباری فیرعەونەکاندا پەروەردە بووەو بۆتە پێشەوایەکی سەربازیو لە شەرێکدا بە سەر حەبەشەدا زاڵ بووەو لە ئەنجامیدا (تەربیس)ی کچی پادشاکەیانی مارەکردوە . لە سەردەمی فیرعەون رەعمەسیس دووەمدا (١٣٠٠-١٢٧٢پ . ز) بە خۆیو تاقمەکەیەوە میسری جێ‌هێشتوەو رووی کرۆتە فەلەستینوتیایدا جێگیربووەو ئایینەکەی خۆی بلاّوکردۆتەوە (عەرەبو جوو لە مێژوودا - أحمدسوسە-ل ط ط-كك) .

**٣٤کۆرش -Cyrus**

بە کۆرشی گەورە ناوی دەبرێ . ساڵی (٥٢٨پ . ز) مردوە . دامەزرێنەری ئیمپراتۆریتی فارسەکانە . سەرەتا بە بەرپاکردنی شۆرشێك دژی پادشای مادەکان دەستی‌پێکردو خۆی کردە خاوەنی تاجو تەختەکەی . بە دوایدا ملی بە بەرپاکردنی چەندین جەنگەوە ناو لە ئەنجامیاندا ئاسیای ئەو رۆژگارەو وولاّتی میتۆپۆمیاو سووریاو فەلەستینی داگیرکردو ئیمپراتۆریتی فارسەکانی لیّ‌پێك‌هێنان . هەر ئەویش بوو ئەو

جوولەکانەی کە نەبۆختنەسر گواستبوونی‌یەوە بۆ بابل ، گەڕاندنی‌یەوە بۆ ئۆرشەلیم .

**٣٥- ڕۆومۆلۆس-Romulus**

**لە پادشا مەزنەکانی سەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتۆرێتی ڕۆما یە . هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن ئەو شاری ڕۆمای بنیادناوە . بەڵام گومان لەوەدا نی‌یە کە ئەو یەکەمین پادشا بووە ئەنجومەنی پیرانی لە ڕۆمادا پێك‌هێناوەو گەلێ یاسای بۆ ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت داناوە کە پادشا نۆمای دوای ئەو پەرەی پێداون‌و ئیتر ئەو یاسایانە بوونەتە بناغەیەکی پتەو بۆ ڕۆژگاری دوای خۆیان (دەمەتەق – ل٢١٥ ، ٢٥١ ، ٢٦٠) . هەروەها دانتی لە کۆمیدیای خواوەندی‌یەکەیدا (بەهەشت سروودی هەشتەم) ناوی دەباو دەربارەی دەڵێ : (یا لە پشتی باوکێکی کەساس ، کویرینۆسێك لەدایك بێ کە بکرێتە کوڕی مارس) . کویرینۆسیش ناوێکی مەزنی‌یە کەڕۆمانکان بە ڕۆمۆلۆسیان بەخشیوەو بە کوڕی خواوەند مارسیان داوەتە قەڵەم . (کۆمیدیای خواوەندی – بەهەشت -ل ١٨٣ – پەراوێز ١١١) .**

**٣٦- سیزیۆس**

قارەمانێکی ئە فسانەیی گریکەکانە . ئیجیۆسی باوکی پادشای ئیتیکا بووە .ژیانی قارەمانانەی خۆی بە کوشتنی گای ماراسۆنی دەس پێکردوە . هەروەکوو یەکێك بووە لەو حەوت لاوەی کە هەموو ساڵێ خەڵکی ئەسینا دەیانناردن بۆ کریت تا ئەژدەهاکەی قووتیان بدا . بەڵام (ئەردیان) دوای ئەوەی ئاشق بووە ، شمشێرێکی داوەتێ‌و ئەژدیهاکەی پێ‌کوشتوە . ئینجا کە گەڕاوەتەوە بۆ ئەسینا بووە بە پادشاوناوبانگی بە کرداری لەرادەبەدەری توانای ئادەمیزاد دەرکردوە (دەمەتەقێ -ل ٢١١ – پەراوێزی وەرگێڕەکەی) .

بەڵام مەکیاڤیللی خۆی هەر لە (دەمەتەقێ)دا دەربارەی دەڵێ : «سیزیۆس سەرکردایەتی‌ی گرتە دەست‌و فەرمانی بە خەڵکی شاری ئەسینای پەرت‌وبڵاودا کە شارەکە بنیادبنێن‌و تیایدا گردبنەوە» . (دەمەتەقێ – هەمان لاپەڕە) .

**٣٧- ڕۆما**

یەکەم شوێن کە وا زەن دەکرێ ڕۆمای لە سەر بنیادنراوە ، گردێکە کە.

پێیدەوترێ (بالاتین)و رووباری تایبەری بە دامیندا تێدەپەڕێو (٢٤) کیلۆمەتر لە دەریاوە دوورە . دەوترێ گوایە ئەوە لە ساڵی (٧٥٣ – پ .ز)دا بووە . ئینجا لە سەردەمی ئۆگستۆسی یەکەم ئیمپراتۆری رۆما دا ، لە دەورەبەری (٢٧ – پ .ز)دا کە دانیشتووانی ئەو وەختە لەوپەری دەسەڵاتداریدا بوونو ژمارەیان لە ملیونێك زیاتر بووە ، لە شارێکی دروستکراو لە خشتەوە بۆتە شارێکی دروستکراو لە مەڕمەڕ . ئیتر بە دوایدا بەردەوام روو لە فراوانی بووەو تەنیوەتەوە بۆ گشت گردەکانی دەوروپشتی . (گەورەترین . . . ل – ١٢٠ ، پەراوێز – ١٢٦) .

**٣٨– میدیەکان :**

**گەلێك** بوون کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینداا لە باکووری رۆژئاوای ئێراندا دەژیانو (ئەرباکس) دامەزرێنەری بنەماڵە حوکمڕانەکەیانەو (ئەکباتان–هەمەدانی ئێستا) پایتەختیان بووە . کۆرشی گەورە لە ساڵی (٥٥٦–پ . ز)دا پایتەختەکەیانی داگیرکردوەو دەوڵەتەکەی لەناو بردوونو وڵاتەکەیانی داوەتە پاڵ ئیمپراتۆرێتە فارسی‌یەکەی خۆی . هەروەکوو لە ساڵی (٣٣٠–پ .ز)دا ، دوای سەرکەوتنی ئەسکەندەری گەورە لە ساڵی (٣٣١)دا بە سەر دارای سێیەمدا ، کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی یۆنانەکانەوەو ئینجا سلوکسی‌یەکان (سلووکس یەکێك بوو لە فەرماندەکانی ئەسکەندەر)و ئینجا لە سەدەی دووەمی (پ . ز)دا ئەرشاکی‌یەکانو ئیتر هەتا (فەتحی عەرەبی) لە ساڵی (٦٣٣)ی دوای زایینداا ، هەر لە ژێر چنگو دەسەڵاتی ساسانی‌یەکاندا بوون . (گەورەترین . . . ل ١٩ ، خوارووی پەراوێزی ژمارە–١٢–) .

**٣٩–جیرۆلامۆ سافۆنارۆلا**

(١٤٥٢–١٤٩٨) . لە شاری فیرارا لەدایك بووە . لە (دیر)ێکی سەر بە قەشە دۆمینیکەکاندا بۆتە رەبەنو پانزە ساڵی تێدا بەسەر بردوە . دوایی چۆتە شاری فلۆرنساو خەڵکێکی زۆر بۆ گوێگرتن لە وتارە ئایینی‌یەکانی لە دەوری گردبوونەتەوە . بە لەدین‌دەرچوون تاوانبار کراوەو پاپا بڕیاری بێبەری‌کردن لە کڵێسەی بە سەردا داوە . لە ساڵی ١٤٩٤دا کە بنەماڵەی میدیتچی لە فەرمانڕەوایی‌کردنی فلۆرنسا خراونو لە

شار دەرپەڕێنراونو رژێمی جەمهووری تێدا دانراوە . ئەم کراوەتە حوکمڕانی جەمهووری‌یەتەکەو گەلێ هەنگاوی چاکی بۆ چەسپاندنو بەڕێوەبردنی ناوە کە گرنگترینیان دانانی دەستوورێك بووە لەو بابەتەی مەکیاڤیللی خۆی بە ئاواتی‌یەوە بووە . بەلاّم لەسالّی(١٤٩٨)دا بەدبەختی رووی تێکردوە ، گیراوەو ئیعدامکراوەو لاشەکەی سووتێنراوە . (دەمەتەقێ –ل ٢٨ ، ٣٢ ، ٢٦٤ ، ٣٦٧) .

**٤٠– سیراکۆزە Siracusa**

دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاّتی دوورگەی سیکلیاوەو یۆنانی‌یەکان لە سەدەی سێ‌یەمی پێش زایینەدا بنیادیان‌ناوە . بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە رووی بایەخەوە وەك مەلّبەندێکی زانیاری‌و هونەر ، بە دوای ئەسینادا هاتوە . تا ئێستاش شوێنەواری شانۆیەکی یۆنانی تێدا ماوە کە بە گەورەترین شانۆی سەردەمی کۆنی جیهان دەدرێتە قەلّەم . شارەکە لە سەردەمی (هیرۆ)ی دکتاتۆریدا کە لە سالّی (٤٨٠–پ . ز)دا بە سەر کرتاجەیی‌یەکاندا زالّبووە ، تەواو گەورەو فراوان بووەو بۆتە مەلّبەندێکی مەزنی شارستانێتی‌ی یۆنانەکان .

(گەورەترین . . . . ، ل–٨٠ ، پەراوێز–٨٥) .

**٤١– شارەکانی ئەیۆن**

مەبەست لەو شارانەیە کە دەکەوتنە سەر کەناری دەریای ئەیۆن . دەریای ئەیۆنیش ئەو ماوەیەی دەریای سپی‌ی ناوەراست دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان کەناری خۆرئاوای یۆنانو کەناری خوارووی ئیتالیاوە . (ح .ع)

**٤٢– شارەکانی هیلسپۆنت Hellspont**

بریتی‌یە لە کەنداوی دەردەنیل کە دەریای مەرمەرە بە دەریای ئیجە دەگەیەنێ ، واتە کەناری ئاسیا لە ئەوروپا جودا دەکاتەوە . درێژی‌یەکەی (٤٠) میل‌و پانایی‌یەکەی (٤) میلە . (گەورەترین . . . . –ل ٦٢ – ب ٧٠) . دیارە لێرەدا مەبەسی لەو شارانەیە کە دەکەوتنە سەر ئەمبەرو ئەوبەری کەنداوەکەوە .

**٤٣– ئۆرسینی‌و کۆلۆنا :**

دوو بنەمالّەی کۆنی بەناوبانگ‌و دەسەلاّتداری ناو شاری رۆما بوون . گەلێ پاپاو

کاردینال‌و میرو فەرماندەی سەربازی‌یان تێدا هەڵکەوتوە . بەردەوام لە گەڵ یەکتردا لە ناکۆکیدا بوون .

(دەمەتەقی – ل ٣٥ – پەراوێز) .

**٤٤–** مەکیاڤیللی لێرەوە ئێتر مەبەستی لە باسکردنی کردارەکانی دۆق فالنتینە ، واتە سیزار بۆرجیای کوڕی پاپا ئەلیکساندەر نەك پاپا خۆی . چونکە ئەو وەختە بووبووە سەرکردەی سوپاکەی باوکی‌و کەوتبوە داگیرکردنی ئەو شارو مەملەکەتانەی کە فەرەنسایی‌یەکان نەیگەیشتبوونێ وەك (ئیمۆلاو فۆرلی‌و پیزارۆو ئوربینۆو . . . هتد) . (ح.ع) .

**٤٥– سینیگاگلیا – Sinigaglia**

بریتی‌یە لە شاری سیناگالیکای زەمانی ڕۆمانەکان‌وەدەکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیك نزیکی شاری ئەنکۆنا . لە ساڵی (٨٢–پ.ز)دا (پۆمپی) تالاَنی کردوە . لە سەدەی پێنجەمدا جووتە (قوط) ڕۆژئاوایی‌یەکان داگیریان کردوە . ئینجا لە سەدەی هەشتەمدا لۆمباردیایی‌یەکان‌و لە سەدەی نۆیەمدا عەرەبەکان . تا لە سەدەی سیازدەیەمدا لە ئەنجامی بەیەکادانی نێوان جویلف‌و جیبلیندا وێران بووە . (کۆمیدیا – بەهەشت – ل ٣١٨ – پ ٥٨) .

**٤٦– پیروجیا – Perugia** پایتەختی هەرێمی ئۆمبریایە . لە وەختی خۆیدا قەڵایەکی سەختی ئیتروسکەکان بووە . لە ساڵی (٣١٠–پ–ز)وە کەوتۆتە ژێر حوکمرانی‌ی ڕۆمە وەو بووە بە مەیدانێکی جەنگی ناوخۆیی ڕۆمانەکان. لە ساڵی (٤١–٤٠پ.ز)دا ئاگستۆس داگیری کردو سووتاندی‌و بەلاَم دوایی بنیاد نرایەوە . لە سەدەی شەشەمدا (تۆتیلان) وێرانی کردوەو بەلاَم لە سەدە ی یازدەیەمەوە رووی لە گەشانەوەو دەسەلاَتداری کردۆتەوە ، تا لە دەوروبەری ساڵی (١٣٠٠)دا حوکمرانی‌ی هەموو هەرێمی ئۆمبریای کردوە . ئینجا لە سەدە ی شازدەیەمەوە بۆتە میرایەتی‌یەکی سەر بە ڤاتیکان . (کۆمیدیا–ل ٢٣١–پ ٤٣) .

**٤٧– باگلیۆنی – Baglioni**

مەبەست لە جیامپاوڵۆ باگلیۆنی‌ی میری شاری پیرۆجیایە کە قەیسەر بۆرجیا لەوەبەر

هێرشی بردبووە سەرو میرایەتی‌یەکەی لی‌داگیر کردبوو.

مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا حیکایەتەکەی تەواو دەکاو دەڵی: «پاپا یۆلیۆسی دووەم.... بریارێدا (لە ساڵی ١٥٠٥دا ح.ع) کە جیامپاولۆ باگلیۆنیش لە شاری پیرۆجیا کە زۆردارانە حوکمرانی‌ی تیدادەکرد، دەرپەرینێ، چونکە سوێندی خواردبوو هەموو ئەو زۆردارانە لەناوبەرێ کە موڵکی کڵێسەیان زەوت کردبوو».

ئینجا مەکیاڤیللی وەهای دەگێرێتەوە کە پاپا بە خۆی‌و ژمارەیەك لە کاردینالەکانی‌و تەنیا تاکە یاساوڵەکەی خۆیەوە، روویان کردۆتە شارەکەو کەچی لەو سەرەوە ئەو دوژمنە جەربەزەیەی بە یەخسیری لەگەڵ خۆیدا هێناوەو حوکمرانێکی سەر بە کڵێسەی لە شارەکەدا جی‌هێشتوە. دواجار مەکیاڤیللی رووداوەکە وا لێکدەداتەوە کە مەسەلەی خۆبەدەستەوەدانی باگلیۆنی بەو ئاسانی‌یەو بۆ ئەوێکی نەگریس‌و ناپەسەند، لە ویژدانپاکی‌و رێزلێنانی کڵێسەوە نەبووە، بەڵکوو لە ئەنجامی سەرکێشی‌و ملپێوەنانی پاپا یۆلیۆسەوە بووە کە بۆکات‌و شوێن‌و حاڵەتی تایبەتی خۆی پێویست‌و سوودبەخشەو دەبێ کۆی لی‌نەکرێتەوە، چونکە «دەگمەنە خەڵکی بتوانن زۆر چاك لە زۆر خراپ لە یەکتری جودا بکەنەوە». (دەمەتەقێ-ل ٣١٠، ٣١١).

## ٤٨- پەیوەندی‌ی نێوان مەکیاڤیللی‌و بۆرجیا

یەکەم پەیوەندی لە نێوانیاندا بە هۆی شۆرشی خەڵکی شاری ئەریزۆوە بووە کە قەیسەر بۆرجیا هانی‌بۆداون. بۆرجیا داوای لە فلۆرنسا کردوە کە نوێنەرێك بۆ ئەو مەبەستە بنێرن بۆ لای. ئینجا بەم بۆنەیەوە مەکیاڤیللی لەگەڵ سۆدیرینی‌ی سەرۆکی فلۆرنسادا چووە بۆ لای‌و بۆ یەکەمجار بینیویێتی‌و بۆی دەرکەوتوە کە مەبەستی گۆرینی رژێمی جەمهووری بووە لە فلۆرنسادا. ئەمە لە ساڵی (١٥٠٢)دا بووە.

هەردوای ئەوە بە ماوەیەك. مەکیاڤیللی بۆتەوە بە نوێنەری فلۆرنسا لە لای بۆرجیاو سی‌مانگ لە گەڵیدا ماوەتەوە. لەو ماوەیەدا دیویێتی کە چۆن شاری بیرگۆلای تالان کردوەو پەلاماری فۆسۆمبرۆی داوەو لەگەڵ ئۆرسینی‌یەکاندا جەنگاوەو چۆن بە هۆی گفت‌وگۆکردنەوەو بە فرت‌وفێڵ. سەرکردەکانیانی بانگ کردوە بۆ سینیگاگلیاو

لەویْ قەلاچۆی کردوون . ئیتر مانەوەی لە گەڵیدا لەو سێ مانگەداو بینینی ئەم کاروکردارانەی ، وایان لە مەکیاڤیللی کردوە کە لە کتێبەکەیدا (میر) بە نموونەی شێرو ڕێوی‌یەکەی دابنێو زۆر جار ئیشارەتی پی‌بدا .

دوا پەیوەندی‌ی مەکیاڤیللی لەگەڵ قەیسەر بۆرجیادا ، لە دوای مردنی باوکی‌و هەڵبژاردنی یۆلیوسی دووەمدا بووە بۆ پاپایەتی کە بۆرجیا ئەو وەختە تازە لە نەخۆش‌یەکەی ڕزگاری بووەو کەوتۆتەوە سەرپێ . جا مەکیاڤیللی نامەیەکی داوەتی کە بۆ ئەنجومەنی باڵای فلۆرنسای نووسیوەو تکای لی‌کردون ڕێگا بە بۆرجیا بدەن کە بەخاکی فلۆرنسادا بەرەو رۆمانا تێبپەڕێ . بەڵام هەر بە دوایدا نامەیەکی‌تری بۆ ناردوون کە تیایدا داوای کردوە ئەو نامەیەی دەستی بۆرجیا پشت‌گوێ بخەن . (دەمەتەقێ-ل ٥١، ٥٢) .

**٤٩- کۆلۆنا – Col;nna** مەبەست لە کاردینال جیوڤانی کۆلۆنایە کە لە بنەماڵەی کۆلۆنا بووەو لە ساڵی (١٥٠٨)دا مردوە .

**٥٠- ئەسکانیۆ – Ascanio** کاردینال ئەسکانیۆ سفۆرزایە . برای لۆدۆفیکۆ سفۆرزا بووە کە لە ساڵی (١٤٩٢)ەوە کرابووە (جێگر) بەسەر تەختی میرایەتی‌ی میلانەوەو ئینجا لە ساڵی (١٤٩٤)دا بووە میری تەواوەتی‌ی میرایەتی‌یەکە . ئەسکانیۆ لە ساڵی (١٤٩٢)دا لە پاڵ جیلیانۆ دی رۆڤیریدا یەکێك بوو لە دوو هاوشانە هەرە گەورەکەی کاردینال رۆدریجۆ (ئەلیکساندەر) بۆ هەڵبژاردن بۆ پاپایەتی‌و بەڵام ئەوەبوو رۆدریجۆ بە تەماعی ئەوەی بیکاتە راوێژکاری خۆی ، هەڵی‌خەڵەتاندو رایکێشایە پاڵ خۆی . ئیتر بە دوایدا ساڵ هات‌و ساڵ تێپەڕی‌و ئەسکانیۆ چەند جارێك بەپێ‌ی ئاڵ‌وگۆڕی بارودۆخی سیاسی ، لی‌ی‌هەڵگەڕایەوەو دایەوە پاڵی ، تا لە ئەنجامدا دوای مردنی فرسەتی بۆ هەڵکەوت کە هەر هیچ نەبێ نەیەڵێ کورەکەی (قەیسەر بۆرجیا) ئیدامە بە فەرمانڕەوایی بنەماڵەکە بدا . (لۆکریشیا بۆرجیا-ل ٣٠ ، ٣٨) .

**٥١-** ئەم‌قسەیەی مەکیاڤیللی وادەگەیەنێ کەسان پیترۆ ئادڤینکۆلا بە ناوی یۆلیۆسی دووەمەوە کرابێ بە پاپا . بەڵام لە رۆمانی (لۆکریشیا بۆرجیا)دا واباس دەکرێ کە کاردینال جیلیانۆ دی رۆڤیری بەو ناوەوە کراوە بە پاپا (ح.ع) .

**٥٢- ئاگاتۆکلیس – Agatocles**

(٣٦١ – ٢٨٩ پ.ز) . پادشایەکی زۆرداری سیراکۆزە (سیکلیا – صقلیە) بووە . لە پایەوپلەیەکی زۆر نزمەوە پێگەیشتووەو بەرزبۆتەوەو بۆتە فەرماندەیەکی سەربازی . بە تاوانی پیلانگێڕان دژی حکومەتەکەی گوناهبار کراوەو لە شار دوور خراوەتەوە . بەڵام بە خۆیو لەشکرێکی بەکرێگیراوەوە گەڕاوەتەوەو شارەکەی داگیرکردووەو هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانو هەزار کەسی لە خەڵکەکەی کوشتووەو خۆی تێدا کردۆتە تاکەمیر. بە دوایدا جەنگێکی لەگەڵ کرتاجەییەکاندا بەرپا کردووە کە تیایدا شکاوەو لە شاری سیراکۆزەدا ئابڵووقە دراوە . بەڵام خۆی لە ئابڵووقەدانەکە دەرباز کردووەو چووە بۆ سەرووی ئەفریقاو لەوێوە کەوتۆتەوە پەلاماردانیان .(دەمەتەقێ – ل ١٣٢ ، ٤٧٦ ، ٤٨١ ، ٦٢٥) .

**٥٣- سکلیا – Sicilya** ناوەکەی لە یەکێك لەو گەلانەوە وەرگیراوە کە شالاویان بۆ بردووەو تیایدا جێگیربوون . پێشتر ناوی (تریناکریا – **Trinacria**) بووە کە مانای (زەویبە سێسووچەکە) دەبەخشێ . دوورگەیەکەو دەکەوێتە خوارووی شێوە دوورگەی ئیتالیاوەو کەنداوی مەسینا لە یەکتریان جیادەکاتەوە . سیراکۆزەو تایبیوم لە شارە مێژووییەکانێتی . (گەورەترین...ل – ٤٨ – پەراوێز – ٥١) .

**٥٤- هامیلکار – Hamilcar** (.... – ٢٢٨ . پ.ز) . لەساڵی (٢٤٦)داو لە ڕۆژانی (جەنگی یەکەمی پۆنی)دا (٢٦٤ – ٢٤١)کە لە نێوان ڕۆماو کرتاجەدا ڕوویداوە ، ئەم فەرماندەی لەشکری کرتاجەییەکان بووە لە سیکلیادا . ئینجا وەختێك کرتاجەییەکان لە ئەنجامی بەزینی ئەو هێزە دەریاییەیاندا کە لە سیکلیاوە بۆ داگیرکردنی ڕۆما رووی کردبووە ئیتالیاو لە ساڵی (٢٤١)دا ناچاری پێکهاتن لەگەڵ ڕۆما دا بوون ، ئەم سیکلیای جێهێشتو گەڕایەوە بۆ کرتاجە کە هەر لەو وەختەدا هێزێکی سەربازە بەکرێگیراوەکان یاخی بووبوونو کرتاجەیان ئابڵووقە دابوو . بەڵام هامیلکار زاڵبوو بە سەریانداو شارەکەی لە چنگ ڕزگارکردنو ئیتر بەوە پایەوپلەی هێندە بەرزبووەوە کە وەك تاکە حوکمڕانێکی لێهات . هەروەها لە ساڵی (٢٣٧)دا ئیسپانیای بەو نیازە داگیرکرد کە بیکاتە بنکەیەك بۆ بەگژداچوونو داگیرکردنی ڕۆماو

بەلاَم لە ساڵی (٢٢٨)دا لە شەرێکدا لەوێ کوژراو تەواوکردنی نەخشەکەی بۆ هانیباڵی کوڕی جێ‌هێشت . (گەورەترین...، ل – ١٥٨ ، پ – ١٤٣) .

**٥٥– جیۆڤانی فۆگلیانی – Giovanni Fogliani** میری شاری فیرمۆ بووەو کوشتنەکەی لە ساڵی (١٥٠٢)دا بووە .

**٥٦– پاولۆ ڤیتیللی – Paolo Vitelli** فلۆرنسایی‌یەکان لە ساڵی (١٤٩٩)دا تۆمەتی ناپاکی‌یان دایە پاڵی‌و ئیعدامیان‌کرد .

**٥٧– ڤیتیللۆزۆ – Vitellozzo** میری سیتا دی کاستیللۆ بووە . یەکێك بووە لەو میرانەی قەیسەر بۆرجیا لە ساڵی (١٥٠٢)دا لە قەلاَچۆکردنەکەی سینیگاگلیادا کوشتوێتی .

**٥٨– پاپا یۆلیۆسی دووەم – Julius . 11** دوای مردنی پاپا ئەلکساندەری شەشەمی باوکی قەیسەر بۆرجیا لە مانگی ئابی (١٥٠٣)دا ، کاردینال بیکۆلۆمینی بۆ پاپایەتی هەڵبژێردراو ناوی پاپا بیۆسی هەشتەمی وەرگرت . بەلاَم لەبەر ئەوەی زۆر پیربووە تەنیا بیست‌و حەوت رۆژ پاپایەتی‌ی کردوەو مردوە . ئەو وەختە قەیسەر بۆرجیا کە تا دوو سێ مانگ لەوەبەر لە هەرەتی دەسەلاَتیدابوو ، گرۆڵەی تەواو کەوتبووە لێژی . بە سەرێك جەماوەری گەلی شاری رۆما بە خوێنی سەری تینووبوون‌و بە سەرێك لەشکرەکەی لە دەوری پاشەکشەیان لی‌کردبوو ، بە سەرێکیش ئەو نەخۆشی‌یەی لەگەڵ نەخۆشکەوتن‌و مردنی باوکیدا تووشی بووبوو لە پەل‌وپۆی خستبوو . تا لەو وەختەدا کاردینال جیلیانۆ دیللا رۆڤیری‌ی کۆنە دوژمنەکەی بنەماڵەکەیان ، بووبووە یەکێك لە پالێوراوە بەهێزەکان بۆ هەڵبژاردن بە پاپا . تا ئەو ساتە بۆرجیا هێشتا بەلایەنی کەمەوە خاوەنی دەنگی یازدە کاردیناڵی ئیسپانیایی بوو کە بە بەری‌یەوە مابوو کاریان تێ‌بکا . بەلاَم وەك مەکیاڤیللی خۆی لە کۆتایی بەشی حەوتەمی کتێبەکەیدا بەوردی لە چەند دیرێکدا باسی‌کردوە ، بۆرجیا بە پشتگیری‌کردنی هەڵبژاردنی کاردینال جیلیانۆ (یۆلیۆسی دووەم) بە پاپا ، لەو وەختە ناسکەدا هەڵەیەکی کوشندەی کردوەو چاڵی بۆ خۆی هەڵکەندوە . مەکیاڤیللی باسی چۆنێتی هەڵەکردنەکەی ناکا . بەلاَم لە (لۆکریشیا

بۆرجیا)دا چیرۆك‌نووسانە حیکایەتەکە دەگێڕێتەوە کە چۆن کاردینال جیلیانۆ فرسەتی لەو حاڵەتی کەساسیی و کڵۆڵی‌یەی هێناوە کە تێ‌یکەوتوەو هەڵی‌خەڵەتاندوەو وای‌لێکردوە کاردیناڵە ئیسپانیایی‌یەکانی بۆ قایل‌بکا دەنگی بدەنێ ، بەرامبەر بە یاریدەدانی لە دەسگیرخستنەوەی دەسەلاتەکەی پێشوویدا . کەچی هەر دوای هەڵبژاردنی بە پاپا ، فەرمانی گرتن‌و حەپس‌کردنی‌دا . ئینجا جارێکی‌تریش توانی ئەو بۆرجیا جەربەزە درندەیەی جاران وەك منداڵێك فریو بداو گوایە بەرامبەر بە سەروەت‌و سامانەکەی ئازادی بکا . کەچی لەم دەرگاوە بەرەڵلای کردوەو کردوێتی‌یەوە بەو دەرگای بەندیخانەیەکی‌تردا .

بەهەرحاڵ پاپا یۆلیۆسی دووەم بنەماڵەی بۆرجیای تێکشکاندو لەسەر شانۆی سیاسەتی ڤاتیکان‌و ئیتالیای دەرهاویشتنەدەر . بەلام خۆی لە واقیعی حاڵدا بەهەمان شوێن‌پێی پاپا ئەلیکساندەری شەشەمدا رێگای گرتەبەرو ژیانی خۆی بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی کلێسەو بەرفراوان‌کردنی تەرخان‌کردو دەورێکی بالای لەو جەنگانەدا گێڕا کە لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا لە ئیتالیادا روویان‌دا . بەلام دەبێ ئەوەش بڵێین کە یەکێك بووە لەو پاپایانەی هۆگری هونەرو ئەدەب‌و رۆشنبیری بوون‌و تەقەلایەکی زۆری بۆ گەشەپێ‌سەندنیان داوە ، تا ئەو ساتەی لە ١٣ شوبات ١٥١٣ دا کۆچی‌دوایی کردوە . (رۆمانی لوکریشیا بۆرجیا) .

**٥٩– جەنگی یەکەم (جەنگی پۆنی) – Punic War** زنجیرە جەنگێك لە نێوان رۆما و کرتاجەیی‌یەکاندا بە هۆی تەقەلادانی زاڵ‌بوونیانەوە بەسەر ناوچەی دەریای سپی‌ی ناوەراستدا رووی‌دا کە مێژوونووسان بەسەر سێ پلەدا دابەشیان دەکەن :

١–جەنگی یەکەم : (٢٦٤ – ٢٤١ .پ.ز) : هۆی راستەوخۆی هاواربردنی دەستەیەك لە خەڵکی شاری (میکینا)ی یۆنانی بووە بۆ رۆما و دەستەیەکی‌تریان بۆ کرتاجەیی‌یەکان ، ئەویش لە وەختێکدا کە پادشای سیراکۆزە (سکلیا) هەڕەشەی پەلاماردان‌و داگیرکردنی شارەکەی لێکردوون . ئینجا کە هەردوولا بەدەنگ هاوار بۆهێنانەکەوە چوون ، لەسەر ئەو مەسەلەیە لێ‌یان بووە بە شەڕو کوشتار لە یەکترو ئیتر جەنگ لە نێوانیاندا بەیناوبەین‌و هەر جارەی لەبەر هۆیەك بەردەوام بووە ، تا لە ئەنجامدا رۆمانەکان هێزی دەریای کرتاجەیی‌یەکانیان تەفروتوونا کردوەو ناچاریان

دوون دەست لە دوورگەی سکلیا بەربدەن .

– جەنگی دووەم (٢١٨ – ٢٠١ پ.ز) . هۆی راستەوخۆی ئەوەبووە کە رۆما لە تەشەنەسەندنی دەسەلاتی کرتاجی یەکان بۆ ئیسپانیا تەنگەتاو بوونو ویستویانە بەری لی بگرن . جەنگەکە (هانیبال) دەستی پێکردوە کە لە چیای ئەلپ پەڕیوەتەوەو رۆمای خستوتە بەر مەترسی یەوە . بەلام (شیپۆن)ی سەر لەشکری رۆما ، لە ئەفریقاوە ، واتە لە پشتەوە پەلاماری کرتاجەی پایتەختی مەملەکەتەکەی هانیبالی داوەو ئەنجام بە رازی بوونی کرتاجەیی یەکان بە مەرجەکانی رۆما بۆ شەڕوەستاندن شکاوەتەوە .

٣– جەنگی سێیەم : (١٤٩ – ١٤٦ پ.ز) . هۆیەکەی ئەوەبووە کە رۆماکان ترسیان لە هەلسانەوەی کرتاجەو هێرش بردنیان بۆ سەر یەکێك لە مەملەکەتە هاوپەیمانەکانیان لی نیشتوەو ئەمجاریش هەر شیپۆن ئاسا ، لەبەری لای ئەفریقاوە پەلاماری کرتاجەیان داوەو دوای کاول کردنی ، کردوویانەتە ویلایەتێکی ژێردەستەی خۆیان (گەورەترین – ل ١٥٥ – ١٥٦ – پ ١٤٢) .

**٦٠– نابیس – Nabide**

لە نێوان سالانی (٢٠٦–١٩٢ پ .ز)دا حوکمڕانی ی سپارتەی کردوە . تەختی پادشایەتی ی بەزەوت کردن زەوت کردوە . یەکەمجار داوێتی یە پال فیلیپی مەکدۆنیایی و ئینجا بۆتە دۆستی رۆما . دواجار ئیتۆلی یەکان نەخشەیەکیان بۆ کوشتنی داناکە بریتی بوو لە ناردنی ئەلیکسامینیسی هاوولاتی ی خۆیان لە گەل دوو سەد پیادەو سێ سەد سوارەدا ، گوایە بۆ ئەوەی یاریدەی بدەنو بەلام هەر هێندەی فرسەتیان لی هێنا ، پەلاماریان داو کوشتیان .

**٦١– سیکستۆس : Cixtos**

پاپا سیکستۆسی چوارەمە کە دوای پاپا بۆلی دووەم بووە بە پاپاو لە سالی ١٤٨٠دا مردوە . یەکێك بووە لەو پێنج پاپایەی کە کاردینال (رۆریجۆ بۆرجیا – دوایی پاپا ئەلیکساندەری شەشەم) راوێژکاری بووە . (لوکریشیا بۆرجیا –ل ١٤ ، ١٥) .

**٦٢– ئیبامینۆنداس – Ebaminondas**

دوو قۆلی لە گەل بیلۆبیداسی هاوەلیدا مەملەکەتی تیبەیان لە داگیرکاری ی

سپارتایی یەکان رزگارکردووەو پشتیان بە خەڵکی شارو مەملەکەتەکەی خۆیان بەستوە . پرچەکیان کردوون و مەشقێکی باشیان پێ کردوون و بەوە گرەویان بردۆتەوە . دوای مردنی بیلۆبیداس لە ساڵی (٣٦٤ .پ .)دا بۆتە حوکمڕانی مەملەکەتەکەو وەك حوکمێکی جەمهووری ی عادیلانە فەرماڕەوایی تێدا کردوە . بەڵام وەك مەکیاڤیللی ئیشارەت دەدا ، دوای مردنی ئەو کار لەکار ترازاوەتەوەو فیلیپی مەکدۆنیایی کە بۆ سەرکردایەتی کردنی لەشکری مەملەکەتەکە بەکری گیراوە ، دوای یەکەم سەرکەوتنی لە شەڕێکدا ، خۆی بە سەریدا کردۆتە دکتاتۆر . (دەمەتەقێ — ل ٢٣٧ ، ٢٨٦ ، ٢٩٨ ، ٧٤٢) .

**٦٣— ئاراگۆن — Aragon**

هەرێمێکە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ئیسپانیاوە . لە سەدەی چواردەیەمدا بۆتە دەوڵەتێکی دەسەڵاتدارو بەتایبەتی پەلی بۆ خوارووی ئیتالیا هاویشتوەو وەچەی پادشاکانی لەدوای ئەلفۆنسۆی دووەمیانەوە کە لە ساڵی (١٤٤٠)دا ناپۆلی ی داگیرکردو خستی یە ژێردەستی خۆیەوە ، کەوتنە فەرماڕەوایی کردنی . دامەزرێنەری بنەماڵەی بۆرجیاش لە ئیتالیادا (ئەلفۆنسۆ بۆرجیا کە دوایی لە ساڵی (١٤٥٥)دا بە ناوی کالیکستۆسی سێیەمەوە بوو بە پاپا)و کە مەکیاڤیللی زۆر بایەخی بە هەردوو وەچەی (پاپا ئەلیکساندەری شەشەم و قەیسەر بۆرجیا — سیزار —ی کوری داوە) ، لە گەڵ لەشکرەکەی ئەو ئەلفۆنسۆیەدا بووەو چۆتە ئیتالیاوەو تیایدا نیشتەجێ بووە : (رۆمانی لۆکریشیا بۆرجیا — ل ٧ ، ٨) .

٦٤— لێرەدا هەست بە تێکەڵ وپێکەڵی یەك دەکرێ لە نێوان (سفۆرزا)و (فرانسیسکۆ)دا کە هەردووکیان ناوی یەك کەسن . لە دەقە عەرەبی یەکەو لە ئیتالی یەکەشیدا هەروەها نووسراوە . بەڵام لەوە دەچێ کە مەبەستی مەکیاڤیللی لە یەکێك لەو دوو ناوە کەسێکی تر بووبێ . (ح .ع) .

**٦٥— داود — Bavid**

یەکێکە لە پادشاکانی ئیسرائیل ، نێوان (١٠٠٠ — ٩٦٠ پ .ز)و وەك لە (ئینجیل)دا وتراوە ، تابووتە پیرۆزەکەی لە (ئەبیناداب)ەوە بۆ (ئۆبید)و لەوێوە بۆ

(ئۆرشەلیم) گواستۆتەوە . هەروەها مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا وای ئیشارەت پێدەدا کە یەکێك بووە لەوانەی (ورگی برسی‌یەکانی بە خواردەمەنی‌ی خۆش پڕکردووەو ورگی پڕی دەوڵەمەندانی برسی کردوە) . مەبەستیشی نموونەهێنانەوەیە بۆ سەلماندنی یەکێك لە تیوری‌یەکانی خۆی کە دەڵێ : (ئەگەر کابرایەك بووە حوکمڕانێك لە شارێك یا لە دەوڵەتێکداو بەتایبەتی ئەگەر تیایدا شوێن‌پێ‌یەکی قایمی نەبوو . . . باشترین شت بۆ هێشتنەوەی لە چنگیدا ، بە مەرجێك تازەمیرێك بێ ، ئەوەیە کە هەموو شتێکی سەرلەنوێو لە سەر بناغەیەکی نوێ تێدا رێك‌بخاتەوە . . . وەك ئەوەی دەوڵەمەندەکانی بکاتە هەژارو لات‌وپووت‌و هەژارەکانی دەوڵەمەند بکا ، کوت‌ومت وەك داود کردی کاتێ بوو بە پادشا). (دەمەتەقێ –ل ۳۰۹) .

**٦٦– شاوول – Saul**

(۱۰۲۰ – ۱۰۰۰ پ .ز) . یەکەمین پادشای ئیسرائیلی‌یەکانە . فەلەستینی‌یەکان لە شەڕی چیای جیلبوادا بە سەریدا زاڵبوون‌و کە بینی هەر سێ کورەکەی بە بەرچاوی‌یەوە دەکوژرێن ، مشتۆی شیرەکەی چەقاندە زەوی‌و ورگی خۆی پێداداو خۆی کوشت . ئەمە لە ئینجیلدا نوسراوە .

**٦٧– شارلی حەوتەم – Charle VII**

دوای شارلی شەشەم چۆتە سەر تەختی پادشایەتی‌ی فەرەنساو لە ساڵانی (۱٤۲۲ – ۱٤٦۱)دا حوکمڕانی‌ی کردوە .

مەکیاڤیللی جگە لەم ، لەکتێبەکەیدا ناوی سێ پادشای‌تری فەرەنسای بردوە کە حوکمڕانی‌کردنیان بەم جۆرە بووە :

لویسی یازدەیەم : ۱٤٦۱ – ۱٤۸۳

شارلی هەشتەم : ۱٤۸۳ – ۱٤۹۸

لویسی دوازدەیەم : ۱٤۹۸ – ۱۵۱۵

**٦٨– جووتەکان – قوط– Juts**

یەکێکە لەگەڵ سەرەکی‌یەکانی جەرمەنەکان . **لە سەدەی چوارەمی زاییندا بوون بە** دوو بەشەوە : رۆژئاوایی‌و رۆژهەڵاتی .

رۆژهەلاتی یەکانیان ئەوانەبوون کە هەر لە سنووری ئیمپراتۆریتی جارانی رۆما دا مانەوە . بەلام رۆژئاوایی یەکان رووەو رۆژئاوای خوارووی ئەوروپا کشانو تیایدا جێگیربوون . دوا پادشایان (رۆدریك) ناوێك بوو کە (طارق بن زیاد) لە سالی (٧١١)دا بەزاندی . (گەورەترین . . . . ، ل ٢١٤ ، پ - ٢٠٢) .

**٦٩- ئاخیل - Achill**

قارەمانی هەربەناوبانگی جەنگە دە سالێ خایەنەکەی تەروادەیە کە هۆمیرۆس لە (ئەلیازە)کەیدا نەمری ی پێ بەخشیوە ، دوای ئەوەی دەماودەم بووبووە قارەمانێکی ئەفسانەیی و گوایە خواوەند تیتیسی دایکی ، بۆ ئەوەی لە بەشداربوونی شەری تەروادە رزگاری بکا ، لە کانتوورشیرۆنی وەرگرتبووەوەو بردبووی لە دوورگەی سکیزۆس لە دەریای ئیجەدا بە جلوبەرگی ژنانەوە حەشاری دابوو . بەلام ئۆلیسیسو دیۆمید پێدەزانن و دەچن دەیفرێنن و بەشداری شەرەکەی دەکەن و تەروادەی لە جەنگدا پێدەشکێنن . لە میتۆلۆجیای یونانی و رۆماندا وەها وتراوە . بەلام هۆمیرۆسی شاعیری مەزن لە ئەلیازەکەیدا کە لە سالی (٩٠٠)ی پێش زایینا نووسیویتی ، واتە چەند سەدەیەك دوای بەسەرهاتەکە ، وای باس دەکا کە فابیسی کوری پادشای ئیلیۆن (واتە بەرەی لای تەروادە) ، هیلانەی ژنی پادشای ئاخی یەکان (مانیلا)ی فراندوە کە دەوترێ گوایە جوانترین ئافرەتی ئەوسای سەرزەمین بووەو تەنانەت ئاگامیمنوونی پادشای پادشایانی ئاخی یەکان ئاشقی بووە . بۆیە ئەم ئاگامیمنوونەی پادشای پادشایان . گالی گشت پادشایانی ئاخی یەکانی بۆ یاریدەدانی مانیلاو سەندنەوەی هیلانە داوەو لەوەوە شەرە دە سالێ خایەنەکەی تەروادە دەستی پێکردوە کە ئاخیل تیایدا بۆتە قارەمانی هەرە مەزن و بەناوبانگ و وێنەیەکی رۆستەمی زالی شانامەکەی فیردەوسی یە .

ئینجا مەکیاڤیللی کە ئیشارەت بە ئاخیل و ئەسکەندەری گەورە پێکەوە دەدا ، دیارە مەبەستی ئەوەیە کە شوێن پێی هەلگرتنی کەلەپیاوانی لەوەبەر بکاتە بنەمایەك بۆ هەر کەسێك بیەوێ رێگای بوون بە کەلەپیاوی وەك ئەوەی پێش خۆی بگرێتەبەر .

ئاخیل بە حسابی ئەفسانەی دەماودەم بێ یا بە حسابی هۆمیرۆس‌و یا سەرچاوەکانی‌تری مێژوو ، وای باس دەکەن کە لاوێکی جەنگ‌ئامێزی هێجگار چابووکی هێجگار بەکاربووەو بەلاَم زۆریش بەرەحم‌و بەزەیی بووە ، ئەگەرچی وەختێك وای پێویست کردبێ کە رەحم‌و بەزەیی تەواو لە دڵی خۆی دەربکا ، بێ سێودوولێکردن کردوێتی‌و خۆی لی‌لانەداوە ، وەك لە دوا رۆژانی شەری تەروادەدا بەرامبەر بە قارەمانی هەرە مەزنی تەروادەیی‌یەکان (هیکتۆر)ی برای فابیس کردی‌و ئینجا دوایی تر لی‌ی پاشگەز بووەوە .

دواجار دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەر ئەو ئاخیلە مەزنە ، بە کوێرە تیرێکی لاوەکی‌ی فابیسە شەرهەڵگیرسێنەرەکەی جەنگەکە کوژرا . (گەورەترین...پ ٢٣-ل ٣٢) .

٧٠- یۆلیۆس قەیسەر Julius Caesar )(١٠٠-٤٤ پ.ز) . لەگەڵ پۆمپی‌و مارکۆس کراسۆسدا کە دوو فەرماندەی سەربازی‌و سیاسی‌ی‌تری ئەو سەردەمەی رۆما بوون . سێ قۆڵی‌و بەهاوبەشی ئیمپراتوریتی‌یەکەیان بەریوە دەبرد . لە ساڵی (٥٥ پ.ز)دا مارکۆسیان بە خۆی‌و لەشکرێکەوە رووەو سووریا بۆ جەنگ‌کردن لەگەڵ فارسەکاندا کشاو بەلاَم دوای شکستی‌هێنانی لە سەردەستی سۆریناژی فەرماندەی فارسەکاندا ، لە کشانەوەیدا پیلانێکی لی‌کراو کوژرا . بە دوایدا لە ساڵی (٥٢ پ.ز)دا ، لەسەر ئەوەی کە پۆمپی تەقەلای دەدا خۆی ببێتە تاقە حوکمرانی ئیمپراتورێتەکە ، ناکۆکی‌یان کەوتە بەینەوەو پێکداهەڵگژان‌و لە ئەنجامدا قەیسەر لە شەری فرسالیادا کە لە ساڵی (٤٨-پ.ز)دا لەنێواندا رووی‌دا ، سەرکەوت‌و پۆمپی هەلاَت بۆ میسرو لەوێ لە لایەن یەکێك لە ئەفسەرەکانی‌یەوە کوژرا . ئیتر قەیسەر خۆی بوو بە تاقە حوکمران ، تا ئەویش لە ساڵی (٤٤-پ.ز)دا بە دەستی پرۆتۆسی هاوەڵی‌و سەردارانی رۆما کوژرا .

٧١- ئێکزۆنۆفۆن – Xonophon (٤٣٥-٣٥٤ پ.ز) . مێژوونووسێکی یۆنانی‌یە . لە فەرماندە سەربازی‌یەکانی ئەسینا بووە . قوتابی‌و برادەری سوکرات بووە . بۆ ماوەیەك چۆتە لای کۆرشی پادشای فارسەکان‌و ئیشی بۆ ئەو کردووەو کتێبێکیشی بە ناوی (مێژووی ژیانی کۆرش)ەوە داناوە کە مەکیافیللی لە کتێبی (دەمەتەقێ)کەیدا ، لە

زۆر شوێندا کە باسی کۆرشی کردبێ ئیشارەتی پێداوەو شتی لێوەرگرتوە . هەروەها زیاتر مەیلی بە لای سپارتادا چووە . گەلێ کتێبی مێژوویی‌و فەلسەفەیش داناون ، لەوانە کتێبی (هیرۆ) کە لە زۆرداری دەدوێ .

٧٢- شیپیۆن - Scipione (٢٣٤-١٨٣ پ.ز) . فەرماندەیەکی سەربازیی گەلێ بەناوبانگ‌و لێهاتووی رۆما بووە.لە ساڵی (٢٠٢ پ.ز)دا لە شەری (زاما)دا بەسەر هانیباڵی کرتاجەییدا (٢٤٧-١٨٣)زاڵ بووە کە لەوەبەر زۆربەی ولاتی رۆماکانی داگیر کردبوو. مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا چەندین جار ئیشارەتی پێداوە گەلێ نموونەی لەسەر هێناوەتەوە . هەروەکوو دانتی‌یش بە رێزلێنان‌و ستایشکردنەوە ئیشارەتی پێداوە (کۆمیدیای خواوەندی - ل ٤٦٤ - دێری ٦١) . بەلاّم دەبێ ئەوە بڵێم کە وەرگێرەکەی لە پەراوێزەکانیدا سێ مێژووی جیاجیای بۆ ئەو شەری زامایە داناوە .

٧٣- پیستۆریا - Pistoia (پیستۆلا)شی پێدەوترێ‌و لە کۆندا ناوی پیستۆریا بووە . دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای فلۆرنساوەو (٢٠) میل لێوەی دوورە . (دەمەتەقێ - ل ٧٠٠ - پ ١) .

٧٤- ڤیرجیل ڤیرجیلۆس - Virgil Virgilus (٧٠-١٩ پ.ز) . شاعیری گەورەی رۆما نە . لە نزیك شاری (مانتوا)دا کە دەکەوێتە سەرووی ئیتالیای ئێستاوە لەدایك بووە . لە شاری کریمۆنا (میلان)و ناپۆلی خوێندوێتی . بە سەراپای ناوچەکانی ئیمپراتۆرێتدا گەراوە . لە شاری (براندیزی) کە دەکەوێتە خوارووی ئیتالیاوە مردوە . (ئەنیادە) یەکێکە لە شارەکانی کە هاوشانی (ئەلیازە)کەی هۆمیرۆسە . هەروەها (دانتی) هێندە بە شاعیرێکی گەورەو لێهاتووی داناوە کە لە گەشتەکەی خۆیدا بۆ ئەوەدنیا (کۆمیدیای خواوەندی) ، کردوێتی‌یە هەم هاورێی گەشتەکەی‌و هەم چاوساغی خۆی .

٧٥- دیدۆ - Dido لە میتۆلۆجیای یۆنانیدا ، کچی بیلۆسی پادشای (صوور)ەو خوشکی بیجمالیۆنە : کە مێردەکەی خۆی کوشتوە ، ئەوسا ئەم ناچاربووە هەرچی گەنجێکی باوکی هەبووەو بۆیان بەجێ‌ماوە ، لەگەڵ خۆیدا بیبات‌و خۆی بگەیەنێتە

باکووری ئەفریقا . ئیترگوایە لەوێ خاکی کرتاجەی لە پادشای لیبیا بەو گەنجوسامانە کڕیوەو خۆی تێدا جێگیر کردوە . دەشوترێ گوایە بۆ ئەوەی شوو بە ئایاریاسی پادشای لیبیا نەکا ، خۆی کوشتوە .

**٧٦- هانیباڵ – Hannibal** ٢٤٧-١٨٣-پ.ز) . کوڕی هامیلکارەو فەرماندەو سەرلەشکری هەرە بەناوبانگی کرتاجە بووە . کە باوکی لە ساڵی (٢٢٨-پ.ز)دا کوژرا ، ئەم لەگەڵ هازدرۆباڵی زاوایدا دوو قۆڵی سەرکردایەتی ی لەشکری کرتاجەیی یەکانیان دە کرد . بەلاّم کە هازدرۆباڵ لە ساڵی (٢٢١-پ.ز)دا کوژراوە ، ئیتر ئەم کە هێشتا تەمەنی (٢٦) ساڵ بوو ، بووە بە تاقە فەرماندەی لەشکرەکەو لەبەر ئەوەشی سوێندی بۆ باوکی خواردبوو کە تەختوتاجی ئیمپراتوزێتی رۆما تێكوپێك بنێ ، بە خۆیو لەشکرێکەوە بە رێگای ئیسپانیادا بەرەو ئیتالیا کەوتە رێ . لەشکرەکەی لە سەرەتادا لە (٣٠) هەزار سەربازی پیادەو شەش هەزار سوارە پێك هاتبوو . بەلاّم بەدەم رێوە تا دەهات زیادی دەکردو کە نزیك ئیتالیا بۆوە ژمارەیان گەیشتبووە (٩٠) هەزار پیادەو (١٢) هەزار سوارەو ژمارەیەکی زۆر هێسترو ولاّخی ترو (٤٠) فیلیشو دەوترێ کە ماوەی نێوان سەرەتاو کۆتایی لەشکرەکەی (٢٠) میل بووە .

هانیباڵ لە چەندین شەڕدا بەسەر رۆمەکاندا زاڵبووەو راوی ناون تا تەواو لە رۆما نزیك بۆتەوەو تەنیا چەند میلێکی مابوو بیگاتێو کەچی لەوێدا راوەستاوە بۆ ئەوەی ماوەی حەسانەوە بە لەشکرەکەی بدا . جا دەوترێ لەو ماوەیەدا لەشکرەکەی لەشاری (کاپوا)دا بەرابواردنەوە خەریك بوونو ئەوە بۆتە هۆی لاوازبوونی .

بەهەرحاڵ (شیپۆن)ی فەرماندەی لێهاتووی رۆما ، لەو وەختەدا فرسەتی هێناوەو بەلاّم لەبری ئەوەی رووبەرووی هانیباڵ ببێتەوەو لە ئیتالیادا لە گەڵیدا بجەنگێ ، ئەم بە خۆیو لەشکرەکەیەوە لە ئەفریقاوە شالاّوی بردوەو بەرەو کرتاجەی پایتەختی ولاّتەکەی هانیباڵ کشاوە . ئەوسا هانیباڵ ناچار بووە بە خێرایی لە ئیتالیا بکشێتەوەو بچێ بە هاواری کرتاجەوە . ئینجا لە ساڵی (٢٠٢-پ.ز)دا لەگەڵ شیپۆندا لە نزیك شاری (زاما)دا بەیەکیاندا داوەو دوای شەڕێکی درێژخایەن ،

هانیباڵ شکستی ی هێناوەو لەشکرەی شکاوە .

دوایی کە بە ناچاری لەگەڵ رۆمادا[1] پەیمانی ئاشتی ی بەستوە ، کرتاجەیی یەکان تاوانی ناپاکی یان داوەتە پاڵی و ئەویش لە ئەنجامیدا هەڵاتوە بۆ سووریا . بەڵام (پرۆسیاسی یەکەم)ی پادشای بیسینیا ناپاکی ی لە گەڵدا کردوەو ویستویە بیداتە دەست رۆمانەکان ئیتر وەختێك سەربازەکانی رۆما ئابڵووقەیان داوە ، ئەم بۆ ئەوەی تووشی زەلیلی نەبی و نەیبەن بە کۆت وزنجیر کراوی بە شەقامەکانی رۆمادا بیگێڕن ، بە زەهر خۆی کوشتوە . (گەورەترین....ل ١٥٨- ١٦٤) .

٧٧- فابیۆس ماکسیمۆس -- **Fabius E Maximus** بە (لەسەرخۆ) ناسراوەو چەند جارێك و یەك بە دوای یەکدا بە کۆنسۆڵ و چاودێرکار (کۆنسور)و دیکتاتۆر لە رۆمادا هەڵبژێردراوە : لە ساڵی (٢٣٣ پ.ز)دا کە کۆنسۆڵ بووە ، وڵاتی لیگواری یەکانی داگیرکردوە . لە وەختی جەنگ لەگەڵ هانیباڵدا کراوە بە دیکتاتۆرو لەو جەنگەدا سیاسەتێکی بەرگری کردنی تایبەتی گرتۆتەبەر..بەرگری کردن بە هێواشی و لەسەرخۆو بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کە بە سیاسەتی فابیزم ناسراو بزووتنەوە سۆشیالیزمی یەکەی فابی یەکانیش (کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای بیستەم و لە گەڵیاندا ئەدیب و رووناکبیری ناسراو بەرناردشۆ) هەر لەوەوە هاتوە . هاوەڵەکانی لە ئەنجومەنی پیراندا لە سەرەتادا لەم سیاسەتەی نارازی بوون . بەڵام دوای ژێرکەوتنی رۆما لە شەڕە قورسەکەی (کانی)دا ساڵی (٢١٦ پ.ز) لە رووی هانیباڵدا ، ناچار مەجبووری بوونەوەو ئەوەبوو بە دوایدا لە ساڵی (٢٠٩)دا تۆرنتۆی سەندەوە . لەگەڵ (شیپیۆن)دا لەسەر ئەو سیاسەتە جەنگی یەی دەبی بگیرێتەبەر ناکۆك بوون . لە ساڵی (٢٠٣)دا مرد .

ئینجا دوای ئەم سەرەقەڵەمانە ، بە پێویستی دەزانم حیکایەتەکەتان بەو شێوەیەی مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا دەیگێڕێتەوە بۆ باس بکەم .

١-هانیباڵ پادشای کرتاجە (٢٤٧-١٨٣ پ.ز) ئەو رۆژگارە ، شاڵاوێکی بێ ئامانی ئەوتۆی هێنابوو کە سەراپای ئیسپانیاو زۆربەی خاکی ئیتالیای داگیرکردبوو ، لە هەمووشی بەناوبانگ تر تێپەڕبوونە ستەمەکەی بوو لە زنجیرە شاخی ئەلپ و لە ئەنجامدا

رۆما خۆیشی کەوتبووە بەر مەترسی‌یەکی گەورەوە .
٢-فابیۆس ئەو وەختە سەرلەشکری رۆما بوو کە لەشکرەکەیان لە دوو شەڕی گەورەدا لە رووی هانیباڵی گەنج‌و کارامەو مەستی نەشوەی سەرکەوتندا شکستی هێنابوو...دوو جار شکستی‌و بەدوایدا ورەبەردانێکی سامناکی سەربازانی ئەم جەمهووری‌یەتە نموونەیی‌یە (لەباری سەرنجی مەکیاڤیللی‌یەوە) .
٣-کارامەیی‌و دوورو وردبینی‌یەکەی فابیۆس لەوەدابوو کە بڕیاریدا ئەو تین‌وتەوژمە بێ‌ئامانە ، بە سەبرو هێمنی‌و لەسەرخۆیی‌یەکی درێژخایەنەوە بەرەنکاری بکرێ .
٤-بەڵام ئەم سیاسەتە نەبووە جێگای رەزامەندی‌ی گەل‌و ئەنجومەنی پیران‌و بگرە هەموو لێ‌یکەوتنە تەقەو تانووت‌لێدانی . بۆیە ئەو لێ‌خراو بە دوایدا (شیپیۆن)ی بەناوبانگ هاتەکایەوە .
٥-کەچی وەختێ شیپیۆن هاتە بەرمەیدان ، مێژوو سەلماندی کە ئەگەر فابیۆس بەو جۆرە کرداری نەکردایە کە کردی ، ئەم ئەو سەرکەوتنەی بەسەر هانیباڵدا بۆ بەدی‌نەدەهێنرا کە لەساڵی (٢٠٢)دا بەدی‌ی‌هێنا .
٦-دواجار دەبێ ئەوە بڵێم کە لەو سەردەمەی ئیمپراتۆریتی رۆما دا (سەردەمی رژێمی جەمهووری) ، گەل خۆی بە ئەنجومەنی پیران‌و بەرەی سەردارو سەروەران‌و ئەندامانی (تریبیون) (پارێزگاری‌کەران لە جەماوەری گەل کە بە هەڵبژاردن لە لایەن خۆیانەوە هەڵدەبژێردران) ، هاووڵاتی‌یەکی هەڵدەبژاردو دەیکردە دیکتاتۆرو بۆ رووبەرووبوونەوەو چارەسەرکردنی حاڵەتێکی تایبەتی‌ی تەواو سەخت‌و ستەم ، دەیانکردە بەرپرسیارو بە دوایدا ئیتر ئاسایی بوو لەو دیکتاتۆریتی‌یەی بکەوێ یالی‌بخرێ .
٧٨- کانتوور (شیرۆن) – Canture یەکێکە لەو گیانلەبەرە ئەفسانەیی‌یانەی کە نیوەی لەشیان ئادەمیزادەو نیوەکەی‌تری ئاژەڵ‌و ئەفسانەکە دەربارەیان دەڵێ کە لە هەور لەدایک بوون .
**٧٩- جیۆڤانی بێنتیڤۆگلی – Giouanni Bentivogli (١٤٤٣–١٥٠٨)** . بنەماڵەکە «بێنتیڤۆگلی» بەدرێژایی سەدەی یازدەیەم فەرمانڕەوایی شاری بۆڵۆنایان کردوە . ناودارترین پیاویان جیۆڤانی بووە کە لە ساڵی (١٤٦٤)دا تەختی میرایەتی‌یەکەی باوکی سەندۆتەوەو بۆتە فەرمانڕەوای بۆڵۆنا . ئەو ئەگەرچی بایەخی بە هونەرو ئەدەب‌و زانیاری داوەو بۆڵۆنای کردۆتە شارێکی جوان ، بەڵام لە حوکمڕانی‌کردندا دڵڕەقی‌و جەربەزەو ئازاردەر بووە . دوای (٤٤) ساڵ فەرمانڕەوایی‌کردن ، پاپا یۆلیۆسی دووەم

له ساڵی (١٥٠٦)دا له شاره‌که ده‌ری په‌راندوه‌و له‌گه‌ڵ خێزانه‌که‌یدا هه‌ڵاتوه بۆ میلان‌و دوای ئه‌وه به دوو ساڵ مردوه . فه‌ره‌نسایی‌یه‌کان له ساڵی (١٥١١)دا هه‌ردوو کوره‌که‌یان گه‌راندۆته‌وه سه‌ر ته‌ختی میرایه‌تی‌ی بۆلۆناو به‌ڵام بۆ ساڵی دوایی ، پاش به‌زین‌و کشانه‌وه‌ی ئه‌وان ، له شاره‌که ده‌رکراونه‌ته‌وه . «ئینجا مه‌کیاڤیللی که ده‌ڵێ : (هانیباڵ بێنتیڤۆگلی‌ی میری بۆلۆناو باپیری میری ئێستا به‌ڕێز هانیباڵ – مه‌به‌ستی هانیباڵی کوڕی جیوڤانی‌یه دیاره هێشتا ئه‌م ده‌رکردنه رووی نه‌داوه .ح.ع» (ده‌مه‌ته‌قێ – ل ٣١٠ – په‌راوێز) .

٨٠– مارکۆس ئۆریلیۆس – Marcos Aurelios (١٢١–١٨٠ ز) . له ساڵی (١٦١)دا بووه به ئیمپراتۆر . هه‌ر له منداڵی‌یه‌وه به رۆشنبیری‌یه‌کی باڵا په‌روه‌رده کرابوو . سه‌ر به فه‌لسه‌فه‌ی رواق بوو . هه‌روه‌کوو پتر به لای سۆفێتیدا دایده‌شکاند . له سه‌رده‌می خۆیدا گه‌لێ هه‌نگاوی بۆ چاککردنی باری ئابووری ناوه . کتێبێکیشی به ناوی (وردبوونه‌وه)وه داناوه .

٨١– کۆمۆدۆس – Commodos کوڕی مارکۆس ئۆریلیۆسه . له ساڵی (١٨٠ ز)دا بۆته ئیمپراتۆرو تا ساڵی (١٩٢ ز) حوکمڕانی‌ی کردوه . ئه‌م به پیچه‌وانه‌ی باوکی‌یه‌وه ، مرۆڤێکی داوێن‌پیس‌و به‌دره‌وشت بووه که ته‌نانه‌ت به ده‌ستی ئافره‌تێکی قه‌پاتمه‌ی خۆی کوژراوه‌و مه‌کیاڤیللی حیکایه‌تی کوشتنه‌که‌ی ده‌گێڕێته‌وه‌و ده‌ڵێ : «ئیمپراتۆر کۆمۆدۆس دووبراده‌ری زۆر دڵسۆزی هه‌بوون که لایتیۆس‌و ئیلیکتۆسیان ناو بوون‌و سه‌رکردایه‌تی‌ی پاساوڵه‌کانی خۆی پێ‌سپاردوون . هه‌روه‌کوو ئافره‌تێکی قه‌پاتمه‌شی هه‌بووه که مارسیای نابووه‌و زۆری خۆشویستوه . دوو براده‌ره‌که‌ی له‌سه‌ر ئه‌و ره‌وشته‌ی سه‌رزه‌نشتیان کردوه‌و قسه‌ی توندوتیژیان پێ‌وتوه . بۆیه بڕیاری داوه هه‌ردووکیان‌و مارسیاش له گه‌ڵیاندا بفه‌وتێنێ . ئینجا ده‌وترێ گوایه لیسته‌یه‌کی به ناوی هه‌رسێکیان‌و چه‌ند که‌سانێکی تریش نووسیوه که بۆ شه‌وێ بیانکوژێ‌و خستوێتی‌یه ژێر سه‌رینه‌که‌یه‌وه . ئینجا به دوایدا که چۆته حه‌مام بۆ خۆشتن ، یه‌کێك له منداڵه بچکۆله‌کانی که زۆری خۆشویستوه ، چۆته ژووره‌که‌ی‌و له‌سه‌ر جێگاکه‌ی یاری‌ی

کردوەو بە ڕێکەوت لیستەکەی بەردەست کەوتوەو دەری هێناوە . کە لە ژوورەکە هاتۆتە دەرەوەو لیستەکەی بە دەستەوە بووەو هەر بە ڕێکەوت مارسیای تووش هاتوە ، لیستەکە بەرچاوی مارسیا کەوتوەو ئەویش دوای خوێندنەوەی ، هەرخێرا لایتیۆس و ئیلیکتۆسی ئاگادار کردوەو ئیتر سێ قۆڵی کە سەیریان کردوە وا مردن زۆری بۆ هێناون ، بڕیاری کوشتنی ئیمپراتۆریان داوەو هەر کە شەو داهاتوە کوشتویانە» .

لێرەدا دەبێ ئیشارەت بەوە بدەم کە مەکیاڤیللی لە شوێنێکی کتێبی (دەمەتەقێ)کەیدا بە هەڵە دەیخاتە ریزی ئیمپراتۆرە چاکە خوازەکانەوە . هەروەکوو لە شوێنێکی تردا (ل ٦٠٢)ناوی یەکێك لە دوو برادەرەکەی بە بیرینیس دەبا . (دەمەتەقێ ل ٤٠ ، ٦٠٢ ، ٦١٣ ، ٦٢٧) .

**٨٢- بەرتیناکس – Bertinacs** لە ساڵی (١٩٢-ز)دا بۆتە ئیمپراتۆر .

مەکیاڤیللی لە (دەمەتەقێ)دا ئیشارەت بە جۆری کۆتایی هاتنەکەی دەداو دەڵێ : «لەو بیست و شەش ئیمپراتۆرەی لە نێوان قەیسەرو مەکسیمینۆسدا حوکمڕانی یان کردوە ، شازدەیان بە کوشتن کوژراون و تەنیا دەیان مردنێکی ئاسایی مردوون . تەنانەت ئەگەر هەندێك لەوانەی کوژراون پیاوباش بووبن وەك گالیاو بەرتیناکس ، ئەوا کوشتنەکەیان ئەنجامی ئەو حاڵەتی گەندەڵی یەی نێوان سەربازانی ئیمپراتۆرەکانی پێش خۆیان بووە کە لە کایەدا بووە» ئینجا هەر بەدەمی یەوە دەڵێ : «یا ئەگەر یەکێك لەوانەی ئاسایی مردوون پیاوێکی شەڕخوای وەك سیڤیرۆس بووبێ ، ئەمە دەبێ یەکەم بدرێتە پاڵ خۆشبەختی یەکەی و دووەمیش ئازایەتی یەکەی کە بە دەگمەن هەڵدەکەوێ ئەم دوو سیفەتە پێکەوە لە مرۆڤێکدا کۆببنەوە» . (دەمەتەقێ – ل ٢٥٦ ، ٢٥٧) .

**٨٣- کاراکالا – Caracalla** (١٨٦-٢١٧ ز) . مەکیاڤیللی لە (میر)دا دەڵێ کوڕی ئەنتۆنیوسە . لە کاتێکدا وەرگێڕی دەمەتەقێ لە پەراوێزێکی خۆیدا دەڵێ کوڕی گەورەی ئیمپراتۆر سپتیمیۆس سیڤیرۆسەو لە ساڵی (٢١٢)دا بەهاوبەشی لەگەڵ گیتای برا بچووکیدا بوونەتە ئیمپراتۆر . بەڵام هەر لەو ساڵەدا براکەی خۆی کوشتوەو بۆتە تاکە ئیمپراتۆر . سەردەمی حوکمڕانی یەکەی پڕ لە پیاوخراپی و زۆرداری و زەوتکاری بووە . لە ئەنجامدا لەسەر دەستی ماکرینۆسدا کوژراوە . (دەمەتەقێ – ل ٦١٣) .

**٨٤ ماکرینۆس Macrinos** یەکێك بووە لە پێشەوا سەربازی‌یەکانی کاراکالاو سەرکردەی ئەو لەشکرەی بووە کە ناردویێتی بۆ ولاتی میتوپۆتامیا . ئینجا لەبەر ئەوەی کاراکالا . وەك لە ناو میرە خراپەخوازەکاندا باوە کە هەردەم لە پیلانگێران لە دژیان دەترسن . داوای لە ماتیریانۆسی برادەری کردوە لە فالگرەوەکانی رۆما بپرسیٚ کە ئاخۆ کەسێك هەیە تەماعی کردبێتە ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر یان نا؟. ماتیریانۆس لە وەرامیدا وتویێتی : بەلیٚ ماکرینۆس ئەو تەماعکارەیە . بەلاٚم وا ریٚکدەکەویٚ کە نامەکە لەبری ئەوەی بە ئیمپراتۆر بگا . دەست ماکرینۆس دەکەویٚو ئیتر ئەم کە دەزانیٚ کوشتن بە دەستی کاراکالا مسۆگەرە . لەلای خۆیەوە بریاری کوشتنی ئەو دەداو کارەکەش بە ئەفسەر مارتیالیس دەسپێریٚ کە هەم زۆر دلسۆزی بووەو هەم زۆر بەرامبەر بە ئیمپراتۆریش دلٚ پر لە رق‌وکینە بووە . چونکە پێش ئەوە بە چەند رۆژێك برایەکی کوشتوە . بەم جۆرە ئەفسەرەکە ئیمپراتۆر دەکوژیٚو ماکرینۆسیش بە دوایدا دەبێتە ئیمپراتۆر .

(دەمەتەقیٚ –ل ٦١٣ ، ٦١٤) .

**٨٥– ئەلیکساندەر** – **Alexander** لە سالاٚنی (٢٢٢–٢٣٥ .ز)دا فەرمانرەوایی کردوە .

**٨٦– ماکسیمینۆس** – **Maximinus** لە سالاٚنی (٢٣٥–٢٣٨ پ.ز)دا فەرمانرەوایی کردوە .

**٨٧– پاسەوانانی پریتۆرەکان** –

لە سەرەتادا ئیشیان پارێزگاری‌کردن بووە لە دادپەروەری . بەلاٚم دوایی بوونەتە پارێزگاری‌کەر لە شەخسی سەرکردەو فەرماندەکانی‌رۆمانەکان‌و لە سالیٚ (٤٢–پ.ز)وە وای‌لێهات کە کۆنە جەنگاوەرانی تێدا دەبوونە سەربازو ژمارەیان پەرەی سەندو دەورێکی سەرەکی‌یان لە سیاسەتی ئیمپراتۆرێتەکەدا دەگێرا ، تەنانەت ئەم ئیمپراتۆریان لێدەخست‌و ئەویان لەجیٚی دادەنا ، تا ئیمپراتۆر کوستانتین لە سالیٚ (٣١٢–ز)دا بلاٚوەی پێکردن . (دەمەتەقیٚ – ل ١٨٥ – پەراوێز) .

**٨٨– ئەسکەندەری‌یە** – **Alexandria** ئەسکەندەری مەکدۆنیایی لە سالیٚ

(٣٣٢–پ.ز)دا بنیادی ناوەو بە کتێبخانەو فەنەرەکەی‌و بە قوتابخانە فەلسەفی‌یەکەی بەناوبانگ بووە . لە ساڵی (٣٠–پ.ز)دا ئۆکتافیۆس داگیری‌کردوەو داوێتی‌یە پاڵ ئیمپراتۆرێتی رۆما . تا لە ساڵی (٦٤٢–ز)دا کەوتۆتە دەست عەرەب‌و موسڵمانەکان .

دەوترێ ئەسکەندەر لە وەختی خۆیدا لەسەر شێوەی شارێکی مەکدۆنیایی دروستی‌کردوەو شەقامەکانی وەك شارە تازەکانی ئەم سەردەمە ، رێك‌و راست بوون‌و هەریەکەیان ژمارەی تایبەتی‌ی خۆی هەبووەو بۆ یەکەمجاریش لە مێژوودا ، شەقام بە شەو لەو شارەدا رووناکی‌ی بە خۆیەوە دیوە . لەبەر ئەوە لەو سەردەمەدا ، جوانترین‌و دڵگیرترین شار بووە لە جیهاندا (گەورەترین.....،ل–٧٥ ، پەراوێز–٨١) .

**٨٩– تراکە (تراقیا) – Thrace** هەرێمێکە دەکەوێتە خوارووی رۆژهەلاتی ئەوروپاوەو خوارووی رۆژهەلاتی شێوە دوورگەی بولکان دەگرێتەوە . هەروەکوو هەموو یۆنان‌و خوارووی بولگاریاو تورکیای بەری ئەوروپای لی‌پێك‌دێ . لە سەرەتادا تراکەیی‌یەکانی تێدا نیشتەجێ بوون‌و ئینجا ئالیری‌یەکان‌و دوایی لە سەردەمی فیلیپی دوومدا لە ساڵی (٣٤٢ پ.ز)دا مەکدونیایی‌یەکان دەستیان بەسەردا گرتوە . هەروەکوو لە سەدەی یەکەمی پێش زایینداروٚمانەکان حوکمرانی‌یان کردوەو ئیتر بەردەوام مەیدانی چەندین شەڕوشۆڕ بووەو گەلێ دەوڵەت‌و گەل دەساودەسیان پێکردوە . (گەورەترین – ل ٤٣ – پ ٤٢) .

**٩٠– جویلف‌و جیبلین – Guelfe Ghibelline** لە ساڵی (١٢١٥ .ز)دا بە هۆی کوشتنی بۆندلمۆنتی ناوێکەوە ، خەڵکی شاری فلۆرنسا بوون بە دوو بەرەی دژبەیەکەوە کە پی‌یانوترا (جیویلف‌و جیبلین)و ئیتر ئەو دووبەرەکی‌یە هەم بۆ ماوەی پتر لە سەد ساڵ درێژەی کێشاو چەندین بەیەکدادانی خوێناوی‌ی پڕ لە کوشت‌وبڕی لێوەشاوەوەو هەم بۆ شارەکانی‌تری دەوروبەری فلۆرنسا تەشەنەی سەندو گشت ناوچەکەی گرتەوە . چونکە مەسەلە چووە ئەو قاڵبەوە کە هەردەم تەقەلا بدەن یەکتری لەو شاران دەرپەڕێننە دەرەوەو تەنیا لایەکیان بمێنێتەوە . بۆ نموونە

له سالّی (١٢٤٨ . ز)دا جیویلفی‌یه‌کان له فلۆرنسا ده‌رپه‌ڕێنراون ، به‌لاّم له سالّی (١٢٦٦)دا خۆیان کوتاوه‌ته‌وه ناو شاره‌که‌و ئه‌وان جیبلینی‌یه‌کاتیان ده‌رپه‌ڕاندۆته ده‌ره‌وه‌و . . هتد . بێگومان زۆر جاریش ته‌قه‌لادراوه پێکبهێنرینه‌وه‌و کۆتایی به ناکۆکی‌یه‌که‌یان بهێنرێ (وه‌ك کاردینالّ لاتینۆ له سالّی (١٢٨٠)دا کردویّتی ، به‌لاّم بێسوود بووه . ئینجا سه‌یر ئه‌وه‌یه که جویلفی‌یه‌کانیش له‌لای خۆیانه‌وه له سالّی (١٢٨٦)دا بوونه‌ته دوو ده‌سته‌و که‌وتوونه‌ته کوشت‌و بڕ له یه‌کتری . به‌هه‌رحالّ له‌وه ده‌چیّ که له سه‌رده‌می ژیانی مه‌کیاڤیللیدا ئه‌م دوو به‌ره‌یه نه‌مابن یا ناکۆکی‌یه‌که‌یان کۆتایی هاتبیّ . (ل ٦٤٠-٦٤٢ی کۆمیدیای خواوه‌ندی- به‌هه‌شت- پاشکۆی ژماره-١-) .

**٩١- باندۆلفۆ پیترۆچی - Bandolfo Petrucci**

(١٤٥٠-١٥١٢) . میری شاری سی‌یه‌نا بووه ، میرێکی زۆردارو جه‌ربه‌زه بووه‌و وه‌ك دکتاتۆرێك حوکمڕانی‌ی میرایه‌تی‌یه‌که‌ی خۆی کردوه . لۆسیۆ بیلانتی ناوێك که زاوای بووه‌و به‌لاّم به زۆرو له‌ناهه‌ق کچه‌که‌ی خۆی لیّسه‌ندۆته‌وه ، پیلانێکی بۆ کوشتنی سازداوه‌و که چی ڕێکه‌وتێك له دواساتدا به فریای که‌وتوه‌و رزگاری بووه . پیلانگێڕه‌کانیش ناچار هه‌لاّتوون و له شاره‌که (سی‌یه‌نا) ده‌ربه‌ده‌ر بوون . (ده‌مه‌ته‌قیّ- ل٥٩٩ ، ٦٢١) .

**٩٢- نیکۆلۆ ڤیتیللی**

میری سیتا دی کاستیللۆ بووه . له سالّی (١٤٩٧)دا مردوه .

**٩٣ گیدۆ بالدۆ - uido Baldo**

کوری فریدریکه که یه‌کێك بووه له فه‌رمانده سه‌ربازی‌یه به‌ناوبانگه‌کانی میرایه‌تی ئوربینۆ . میرێك بووه که جه‌ماوه‌ری گه‌له‌که‌ی زۆریان خۆشویستوه‌و له‌لایان گه‌لیّ به‌ڕێز بووه . بۆیه ئه‌ویش دوای گه‌ڕانه‌وه‌ی بۆ سه‌ر ته‌ختی میرایه‌تی‌یه‌که‌ی ، چۆته سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه‌ی که پشت به گه‌له‌که‌ی‌و به‌شکرێکی هه‌لّقولاّو له ڕیزی گه‌له‌وه ببه‌ستیّ ، نه‌ك به قه‌لاّو قولله . (ده‌مه‌ته‌قیّ-ل ٥٣٨) .

٩٤- جیرۆلامۆ ریارۆ - Girolamo Riario

کوشتنەکەی لە ساڵی (١٤٨٨)دا بووە . بڕوانە پەراێزی ژمارە (١٧) .

٩٥- قشتالە - Castiglia

عەرەبەکان لە کۆندا (لە زەمانی دەوڵەتی ئەندەلووسدا) بە ئیسپانیایان دەوت قشتالە(ج.ع) :

٩٦- بیرنابۆ /rnabo

ەکیاڤیللی لێرەدا تووشی غەفڵەت بووە . چونکە نە لەوەبەری (میر)داو نە لەدوایی تریدا ، هیچ باسێکی ئەم (بیرنابۆ) یەی نەکردوە . لە (دەمەتەقێ)شدا تەنیا یەك جار ناوی دەباو دەریدەخا کە حوکمڕانێکی ناوچەی لۆمباردیا (میلان) بووەو برازایەکی حوکمڕانی‌یەکەی بە فرت‌وفێڵ لێ‌زەوت کردوە .(ح . ع ) .

٩٧- مەکسیملیان - Maximilyan

پراتۆری ئەڵەمانیا بووە . دوو جار هێرشی بردۆتە سەر ئیتالیا . یەکەمیان لە ساڵی (١٤٩٦)داو دووەمیان لە ساڵی (١٥٠٨)دا . نیازی وابووە هەموو باکووری ئیتالیا داگیربکات‌و ڕۆمای بکەویتە چنگو بکرێتەوە بە ئیمپراتۆری ڕۆمانیای پیرۆز . بەڵام بە سەرێك ئیتالیایی‌یەکان ملیان بۆ نەداوەو بە سەرێکیش فەرەنسایی‌یەکان بەریان لێگرتوە . لە ساڵی ١٥١٩دا مردوە . (دەمەتەقێ -ل٤٤ ، ٥٥ ، ٦٩ ) .

٩٨- دڕندەکان - Barbarians

ناوێکە بە سەر ئەو گەلانەدا دابڕدرا کە بە درێژایی سەدەی پێنجەمی زایینی لە باکوورەوە بەرەوخوار دارژانە ناو وڵاتی (گال)ەوە (باکوورو ڕۆژئاوای ئەوروپا)و ئیمپراتوزێتی ڕۆژئاوای ڕۆمە یان کۆتایی پێ‌هێنا . گالی‌یەکان‌و ڕۆمەکان ئەم ناوەیان بە هۆی کردارو ڕەفتاری وەحشی‌یانەی دوور لە شارستانێتی‌و پێشکەوتووانەوە لێنان . بۆرگاندی‌و جووت (قوط)و جەرمانی ، لە عەشرەت‌و تیرە گەورەکانیان بوون کە لە ساڵی (٤١٠ . ز)دا دەستیان گەیشتە ڕۆماو تالآنیان‌کرد .

ئینجا لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئیشارەت بەوە بدەم کە لە زمانی عەرەبیدا جۆرە تێکەڵاویێك لە نێوان ئەم وشەی ( Barbarian - کێوی - وەحشی)یەو (Barbar -

بەربەر)دا روودەدا کە توخمێکن لە ئادەمیزادوڵە باکووری ئەفریقادا دەژین و لە رۆژگارێکی زۆر کۆنەوە کە دەوترێ لە سێ هەزار ساڵ کەمتر نی یە ، تیایدا جێگیربوون . واتە وشەی (بربري) لە زمانی عەرەبیدا کە بە مانای (کێوی – درندەو جانەوەر – وەحشی) بەکار دەهێنرێ ، لە (Barbarian)ەکەی ئەوروپاوە هاتوە ، نەك (بەربەر)ی توخمە ئادەمیزادی باکووری ئەفریقا . (گەورەترین ....... ، ل–٢١٣ ، ٢٦٥ ، پ– ١٩٩ ، ٢٤٣) .

**٩٩– راڤینا– Ravenna**

دەکەوێتە باکووری ئیتالیاوە ، نزیك شاری فیراراو دوور لە کەناری ئەدریاتیك بە شەش میل . لە سەردەمی رۆمانەکان بایەخێکی گەورەی هەبووەو تەنانەت (هوزویس) کردوێتی بە پایتەختی ئیمپراتورێتی یە رۆژئاوایی یەکەی خۆی . لە سەردەمی تازەشدا ، لە ساڵی (١٥١٢–ز)دا ، بۆتە مەیدانی شەرێکی گەورە لە نێوان لەشکری فەرەنساو لەشکری دوو قۆڵی ی ئیسپانیاو پاپا کە فەرەنسایی یەکان سەرکەوتنیان تێدا بەدیهێنا . هەروەها بە شوێنەوارە مێژوویی یەکانی بەناوبانگەو بەتایبەتی گۆڕی شاعیری گەورەی ئیتالیای سەدەکانی ناوەراست (دانتی) . (گەورەترین ... ، ل–١٧٠ ، پەراوێز–١٦١ ، دەمەتەقێی مەکیاڤیللی ، ل – ٤٩٩ ، پەراوێز) .

نيكولو مكيافيلي

# الأميـــر

ترجمه عن العربية

حسين عارف

نرخی یەك دینارە — رقم الايداع في المكتبة الوطنية 1368 / 1982

مَطبعة (سَبراميش) بغداد